دوکتۆر مارف خەزنەدار

# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پڕۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردی‌یە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

**بەرگی چوارەم**

نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم
و
سەرەتای سەدەی بیستەم
١٨٥١-١٩١٤



# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

Â…–«uÇ wÖ–WÐ

**نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم**
**و**
**سەرەتای سەدەی بیستەم**
**١٩١٤ - ١٨٥١**

## دوکتۆر مارف خەزنەدار



کتێب: مێژووی ئەدەبی کوردی – بەرگی چوارەم
دانانی: د. مارف خەزنەدار
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٣٠٠
دەرهێنانی هونەری: ئاراس ئەکرەم + حاجی دلاوەر صادق
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: تریسکە ئەحمەد
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر– ٢٠٠٤
تیرێژ: ١٦٠٠ دانە

لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٢٧٩)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

# پێشەکی

ئەم بەرگە تۆماری ڕۆژگارێکی یەکجار گرنگە لە مێژووی نەتەوەی کورد، ماوەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم تا جەنگی یەکەمی گێتی (١٩١٤). لەو ڕۆژگارەدا بیری نیشتمانپەروەری و پراکتیککردنی سیاسەت لە پێناوی کوردایەتی هەموو کوردستانی گرتبووەوە، کەچی بزووتنەوەی ئەدەبی و ڕۆشنبیری لە سلێمانی و هەرێم و ناوچەکانی گۆرانزەمین وێنەی سامانی نەتەوایەتی هەموو کورد بوو، چونکە لە باکووری کوردستانی نزیک نێوەندی دەسەڵاتی عوسمانی ڕینیسانسەکەی جزیری و خانی کزبوونی پێوە دیار بوو و باشووری کوردستان جێی ئەوی گرتبووەوە.

ئەم دیاردەیە کارێکی ئاساییە لە هەموو ڕۆژگارێک و لە هەموو وڵاتێکدا چونکە بەزۆری بزووتنەوەی ئەدەبی لە ناو هەر میللەتێکدا لە جێگەیێکی دیاریکراودا پەیدا دەبێ و پەرە دەستێنێ، وەک پایتەخت یا ئەو نێوەندەی دەسەڵاتی دەوڵەتی تێدایە. ئەمە و گرنگیی ماوەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم لەبەر ئەوەیە چونکە لە سەرەتای پەیدابوونی ئەدەبی کوردییەوە بەرهەمی ئەو ئەدەبە شیعر بووە تا سەرەتای سەدەی بیستەم وەکو لە سەرانسەری ئەو چوار بەرگەدا دەردەکەوێ کە تا ئێستا بڵاوکراونەتەوە.

لە دوو بەرگی داهاتوودا واتە ئەدەبی کوردی لە جەنگی یەکەمی گێتییەوە تا سەرەتای چارەکی دوایی سەدەی بیستەم **١٩٧٥** لەگەڵ بەردەوامبوونی داهێنانی شیعری پەخشانی کوردی دەوری گرنگی بینیوە، لە هەندێ گۆشە و مەبەسی ئەدەبیدا ڕۆڵی لە شیعریش زیاتر بووە.

لێرەدا پێویستە چەند ڕاستییێک لە بابەت ئەو چوار بەرگەوە ڕوون بکرێتەوە بۆ ئەوەی خوێنەر و خوێندەوار زیاتر کەڵکی لێ وەربگرن:

١– لە سەرەتای پڕۆژەکەوە بڕیار وا بوو نموونەی شیعری دیالێکتەکانی زمانی کوردی وەکو خۆیان بمێننەوە بەتایبەتی بەرهەمی شیعری کرمانجی باکوور و گۆران، لە پاشانا بڕیار وا بوو هەندێ لە بەڵگەکانی دیالێکتی گۆرانی واتاکانیان لێک بدرێتەوە، لە هەندێ جێی ئەم کتێبەدا بڕیارەکە جێبەجێ کراوە، لە هەندێ جێگەی دیکە پشتگوێ خراوە. لە پاشانا وا بەباش زانرا هەموو بەڵگەکان وەکو خۆیان بنووسرێنەوە و بەزمانی نووسینی ئەم کتێبە واتایان لێک نەدرێتەوە. دیارە ئەوەی کراویشە قازانجی هەیە و زیانی نییە.

٢– ژیان و بەرهەمی شاعیران بەپێی سەردەمی ژیانیان پیشان دراون، لەمەشدا بایەخدان بەساڵی لە دایکبوونیان بووە بەبنج و بناوان نەوەک مردنیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبوو لەو بەشانەی باس لە بزووتنەوەی ئەدەبی لە شاری کۆیە و شیعری شاعیرە کەم ناسراوەکان کراوە شاعیرەکانیان دیسانەوە لەسەر ئەم دەستوورە ڕێز بکرێن واتە لە ڕێزکردنە بنچینەییەکە بچێتە دەرەوە.

٣– کۆمەڵێک شاعیر لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا لە ناوەوەن شیعریان کەمە، بەڵام وا ڕێک دەکەوێ تاکە شیعرێک یا زیاتر لە شاکاری ئەدەبی بژمێررێ، بۆ ئەوەی مێژووی ئەدەب لەم شیعرانە بێ بەش نەبێ بەشێکی تایبەتیان بۆ تەرخان کرا، واتە بەکورتی پیشاندانی مێژووی ژیانی شاعیرەکان و تۆمارکردنی ئەو شیعرە یا قەسیدەیەی بەنموونەیێکی جوانی ئەدەبی دەژمێررێ.

٤– وەک ئاشکرایە لە بەرگی دووەم و سێیەمی ئەم کتێبە تەنیا بایەخ بەشاعیرانی کورد و بەرهەمیان دراوە، چونکە مەسەلەکە خۆی ئەمە دەخوازێ. ئەوە ئاشکرایە بەرهەمی ئەدەبی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە ڕۆژگارانی کۆنەوە تا سەدەی نۆزدەم تەنیا شیعر بووە، لەبەر ئەوە ماوە نەبووە باس لە پەخشان بکرێ.

٥– لە بەرگەکانی داهاتوودا ڕووی ڕاستی ئەدەبی کوردی تەنیا لە ژیان و بەرهەمی شاعیراندا ناکەوێتە بەرچاو، بەڵکو ژیان و بەرهەمی نووسەرانی وتاری هونەری و چیرۆک و ڕۆمان و بابەتەکانی دیکەی پەخشانیش دەگرێتەوە. هەروەها بەشێکی زۆر تەرخان دەکرێ بۆ دیاردەی ڕەنگدانەوەی ڕووداوە گرنگەکانی گێتی جگە لە تەنگوچەڵەمە و گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و هەست و نەستی ناوەوەی مرۆڤ.

ئەدەبی کوردی لە سەدەی بیستەمدا بەگشتی لە پێناوی هێنانەدی ئامانجی «کوردایەتی» بووە. ئێمە بەهیچ جۆرێ ئیستێتیکای کاری ئەدەبی و هونەری بەئیدیۆلۆجییەت ناگۆڕینەوە، لە دروشم ناگەڕێین، بەڵکو عەودالی قسەی جوانین. بەتایبەتی هونەرمەندی دەست ڕەنگین قەرەنی جەمیل وێنەی هەموو شاعیرانی ئەم بەرگەشی پێشکێش کردم. بەم هۆیەوە پێویستە ئەو ڕاستییە ڕوون بکرێتەوە هەندێ لە شاعیرانی لەم بەرگەدا باسیان لێوەکراوە، وەکو میرمحەمەد سالحی نیعمەتوڵڵاهی و عەبدوڵڵا بەگی ئەدەب و تاهیر بەگی جاف وێنەی فۆتۆگرافییان لەبەردەستدا هەیە، بەڵام وا بەباش زانرا بۆ ئەوانیش وێنەی هێلکاری بکێشرێ و وێنە فۆتۆگرافییەکانیان لەگەڵ هێلکارییەکانی ئەم بەرگە لە چاپی دووەمی «مێژووی ئەدەبی کوردی» بەسەریەکەوە بڵاو بکرێنەوە.

سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە هانیان داوم یا دەستی یارمەتییان بۆ درێژ کردووم بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم پڕۆژەیە.

هەولێر: مەڵبەندی ڕووناکی      مارف خەزنەدار

## بەشی یەکەم

# بەکورتی مێژووی هەرێمە جوگرافییەکانی باشووری کوردستان و بڵاوبوونەوەی ڕینیسانسی ئەدەبی لە هەموو ناوچەکاندا

### مێژووی سیاسی هەرێمە جوگرافیاکانی

### باشووری کوردستان

کارێکی سروشتی بوو ئەو بزووتنەوە ئەدەبییەی لە شاری سلێمانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم سەری هەڵدا لە دواییدا لە ناو هەموو هەرێم و ناوچەکانی کوردستانی باشوور بڵاو ببێتەوە. وەکو ئاشکرایە ئەم ناوچانە لە ڕووی دیالێکتی زمانی کوردییەوە تێکەڵاوە و لە دیالێکتەکانی کرمانجی خواروو و گۆرانی پێکهاتوون، بەتایبەتی لای باشووری ئەو ناوچانەی میللەتی کورد لە میللەتانی دیکەی وەک فارس و عەرەب نزیک دەبنەوە.

بەپێی ناوچە جوگرافی و میرنشینە مێژووییەکانی کورد، باشووری کوردستان لە چوار هەرێمی گەورە پێکهاتووە: بابان و گەرمیان، ئەردەڵان، موکریان، سۆران.

بەکورتی پیشاندانی مێژووی ئەو میرنشینانە لە ڕووی سیاسی و بەڕێوەبردنەوە کارێکی پێویستە بۆ تێگەیشتنی ئەو زەمینەیەی بووە بەهۆی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ئەدەبی و پێشکەوتنی ڕۆشنبیری و خوێندەواری لە کۆمەڵی کوردەواری لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا.

### میرنشینی سلێمانی و ناوچەی گەرمیان

لە بابەت میرنشینی بابانەوە لە سلێمانی زانیاری پێویست لە بەرگی سێیەمی ئەم کتێبەدا خراوەتە ڕوو، هەرچی ناوچەی گەرمیانیشە لەم ماوەیەدا باسی لێوە دەکرێ.

زاراوەی گەرمیان لە کوردستانی باشووردا خاکێکی پان و بەرینە، شاری کەرکووک نێوەندێکە هەموو تیرە و هۆز و عەشرەتی کوردانی گۆرانی ئەم وڵاتە کۆ دەکاتەوە. لە ڕووی مێژووییەوە ئەم ناوچانە مەڵبەندی گۆراننشینی کوردانی کوردستانی باشوور بووە.



یەکێ لە ئەدگارە هەرە گرنگەکانی خەڵکی ئەم ناوە ئەوەیە دیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردی زمانی ڕۆژانە و ئەدەبیاتی کلاسیکییان بووە، جگە لەوە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و نەریتی ئەتنۆگرافییەوە دیارە ئەدگاری تایبەتی خۆیانیان هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەم لە دوای گواستنەوەی پایتەختی میرنشینی بابان لە قەڵاچۆلانەوە بۆ شاری سلێمانی کە وەک پایتەختێک ئیبراهیم پاشا بابان بناغەی لێ دا، ناوچەی گەرمیانی کەرکووک لە ڕووی زمانەوە کەوتە ژێر کاریگەری دیالێکتی کرمانجی باشوور کە زمانی ڕەسمی قسەکردن و ئەدەبیاتی کوردی بوو. بەم جۆرە لەگەڵ دامەزراندنی میرنشینی بابان لە دوا ساڵانی سەدەی هەژدەم لە سلێمانی دیالێکتی گۆرانی لە ڕووی پراکتیکەوە کەوتە ژێر زەبری دیالێکتی کرمانجی باشوور. لێرەدا لە پێشانا بازاڕی سلێمانی لە دواییدا بازاڕی کەرکووک کاریگەرییان بەهێز بوو بۆ کزبوون یان لەناوچوونی دیالێکتی گۆرانی لە شارەکاندا، ئینجا پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی دیالێکتی کرمانجی باشوور.

تا ئێستا ئەم دیاردەیە دوو سەدەی خایاندووە، بەڵام هێشتا دیالێکتی گۆرانی لە ناو خەڵکی گوند و لادێکاندا ماوەتەوە، هەروەها ئەدەبی کوردیش بەم دیالێکتە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ وزەی تێدا ماوە، بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کزتر دەبێ و دیالێکتی کرمانجی باشوور جێگەی دەگرێتەوە.

### میرنشینی ئەردەڵان

خاکی ئەردەڵانی کۆن تەنیا لە ناو لاپەڕەکانی کتێبی مێژوو و لەسەر نەخشە جوگرافییە مێژووییەکاندا ماوەتەوە، لە سەردەمی ئێستادا کەوتۆتە وڵاتی ئێرانەوە. ئەم ناوچەیە بەشێکە لە ئوستانی پێنجەم بەڕەسمی ئوستانی کوردستان، یا ئوستانی کوردستان و کرماشانی پێ دەڵێن. ئەو ئوستانەی ئێستا ناوی کوردستانە هەموو کوردستانی ئێرانی نەگرتۆتەوە، بەڵکو تەنیا خاکی ئەردەڵانی کۆن کە شارستانەکانی سنە و سەقز و بێجاڕ نێوەندی کۆنی میرنشینی ئەردەڵان بوون. ئەم شارستانانە بەپێی نەخشەی کوردستانی باشوور دەکەونە لای باشووری ڕۆژهەڵاتییەوە. جێگەی ئەم ناوچەیە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، لە ڕۆژهەڵاتدا شارستانی هەمەدانە، لە ڕۆژئاوادا ناوچەی سلێمانییە (بابان لە کوردستانی عێراقدا)، لە باکووردا ناوچەی مەهابادە (موکریان)، لە باشووردا شارستانی کرماشانە.

شارستانی سنە بریتییە لە هەشت یەکەی بەڕێوەبردن:

سنە، پاوە، دیواندەرە، ڕەزاب، ڕەوانسەر، قوڕوە، کامیاران، مەریوان. وە شارستانی سەقز بریتییە لە دوو یەکەی بەڕێوەبردن: سەقز، بانە. شارستانی بێجاڕ بریتییە لە یەک یەکەی بەڕێوەبردن.

ئەم ناوچەیەی سنووری جوگرافی دیاری کرا خاکی مێژوویی میرنشینی ئەردەلانی کۆن بووە. خەڵکی ئەم ناوچەیە بەدیالێکتی کرمانجی باشووری زمانی کوردی قسە دەکەن، بەڵام هەر لە ناو ئەم ناوچەیەدا لە هەندێ شوێن دیالێکتی گۆرانی لە ناوەوەیە، ئەو دیالێکتە زمانی ڕەسمی ئەردەلانییەکان و ئەدەبی کوردی بوو تا ڕووخانی میرنشین لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا.

میرنشینی ئەردەلان مێژووی کۆنی هەیە، لە سەدەی دوازدەمینی مەسیحی دامەزراوە. لەم بابەتەوە شەرەفخانی بدلیسی لە «شەڕەفنامە»دا گەلێ زانیاری بەنرخ دەدا بەدەستەوە، وەکو ئەوەی دامەزرێنەری ئەم میرنشینە بابا ئەردەلان بووە و یەکێکە لە تیرەی گۆران.

ئەم دەوڵەتەی ئەردەلان حەوت سەدە بەردەوام بوو. لە زۆربەی ژیانی سیاسیدا سەربەخۆ بووە، یا وەکو ئۆتۆنۆمی دەکەوتە ناو ئێران و هەندێ جاریش سەر بەدەوڵەتی عوسمانی دەبوو. کوردناس ڤاسیلی نیکیتین لەسەر ئەو باوەڕەیە تا ئێستا خەڵکی ئەم ناوچەیە یادی چاکەی کردەوەکانی خوسرەو خانی کوڕی ئەمانوڵڵا خان دەکەنەوە، میرنشینی ئەردەلان پارێزگاری سەربەخۆیی فەرمانڕەوای دەوڵەتی کردبوو، لەگەڵ ئێراندا وەک سوێندخۆر وابوو نەک ژێردەست.

خۆگرتن و پەرەسەندنی ئەم میرنشینە بەڕاستی لە کلۆڵ بەگ کوڕی بابا ئەردەلانەوە دەست پێ دەکا. لە دەوروبەری ئەم میرە سەرانە لە هەولێر وەردەگیرا چونکە ناوچەی سۆرانی لە بن دەست بوو. لەم ماوەیەدا ئەردەلانییەکان هاوسێی بەهێزیان نەبوو، لەبەر ئەوە سەردەمی فەرمانڕەوایی خدر بەگ کوڕی کلۆڵ بەگ و ئەلیاس بەگ کوڕی خدر بەگ دەوری هێمنی و ئاسوودەیی ئەم میرنشینە بوو، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند لە سەرەتای سەدەی چواردەم جەلائیرییەکان هەڵسان، میرە بێ هێز و بێ تواناکەی ئەردەلان خدر بەگ کوڕی ئەلیاس بەگ بەشی باکووری ڕۆژئاوای ئەردەلانی دایە ئەوان، بەڵام ئەمانە لەمە زیاتر بۆیان نەکرا جێگەی دیکە داگیر بکەن. لە دوای ئەمە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی مەئموون بەگ لە سەدەی پازدەمدا بەشی باکووری ئەردەلانی خستەوە سەر وڵات، بەم هۆیەوە زێی گەورە (زێی بادینان) بوو بەسنووری باکووری ئەم وڵاتە، هەروەها قەڵای ڕواندزیشی گرت و ئۆردوگای لێ دامەزراند. ڕۆژهەڵاتناس لۆنگریک لەسەر ئەو باوەڕەیە



لەم ماوەیەدا هیچ میرنشینێک لە میرنشینەکانی هەرێمە جیاوازەکانی کوردستان لەگەڵ ئەردەلاندا لە پێشکەوتنی کولتووری نەتەوایەتی و شێوازی فەرمانڕەوایی شاهانە بەراوورد ناکرێ.لە دوای جەنگی چالدیران (١٥١٤)، گەلێ لە میرنشینەکانی کورد کەوتنە ناو خاکی دەوڵەتی عوسمانییەوە، بەڵام میرنشینی ئەردەلان بەناو هێشتا هەر سەر بەئێران بوو. ئەردەلانییەکان هێزێکی ئەوتۆیان هەبوو تورکی عوسمانی نەیاندەتوانی زەفەریان پێ ببەن، بۆیە لە دەوروبەری بیکە بەگ کوڕی مەئموون بەگ کە هاوچەرخی سوڵتان سلێمانی قانوونی (١٥٢٠-١٥٦٦م) بوو، هێشتا سەر بەئێران بوو. ئەم میرە دووبارە سنووری فراوان کردەوە تا گەیشتە زێی بچووک (زێی کۆیە) و هەورامان و شارەزوور و قەرەداغ و کفری و کەرکووکیشی خستە سەر وڵاتی خۆی. ئەمە زۆری نەخایاند چونکە عوسمانییەکان هەرگیز خۆیان مەڵاس دابوو بۆ ئەوەی هەلیان بۆ هەڵبکەوێ و خاکی ئەردەلان داگیر بکەن، کەچی ئەردەلانییەکان هەر چۆنێ بووبێ سوودیان لە ئێران وەردەگرت بەتایبەتی لە ناکۆکی نێوان عوسمانی و عەجەم.

خان ئەحمەد خانی ئەردەلان لە ساڵی ١٦٠٥م هێرشی بردە سەر عەشرەتەکانی موکریان و وڵاتی داگیر کرد، هەروەها قەڵای ڕواندز و ئامێدیشی گرت، لە پاشانا کۆیە و هەریریشی خستە سەر خاکی ئەردەلان. ئەم خانە دووربین بوو، وەکو دەردەکەوێ دەستی بۆ ئەو میرنشینانە درێژ نەدەکرد کە ڕاستەوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییان بوون، بەڵکو هێرشی دەبردە سەر میرنشینە ناوچەییەکانی کورد. دیارە ئەمەش بۆ ئەوە بوو لە لایێک ئەمارەتە کوردەکان یەک بخا و بەهێزیان بکا و لە لایێکی دیکەشەوە عوسمانییان دڵنیا بکا کە نایەوێ بچێتە جەنگەوە لەگەڵیاندا. لە ئەنجامی ئەمە لە دەوروبەری فەرمانڕەوایی خان ئەحمەد خاندا خاکی ئەردەلان گەلێ فراوان بوو، لە ڕۆژئاوای ئامێدییەوە دەستی پێ دەکرد تا سنووری کرماشان و هەمەدان، لە لوڕستانەوە تا ورمێ، بەم جۆرە هەموو میرنشینی سۆرانیشی داگیر کرد.

فراوانبوونی خاکی ئەردەلان مەترسییێکی زۆری خستە ناو دڵی عوسمانییەکانەوە، لەبەر ئەوە کەوتنە خۆ بەپڕوپاگەندە و هەڵخەڵەتاندنی میرنشینە کوردییەکانی دیکەی هاوسێی ئەردەلانییەکان، وەکو میرنشینەکانی بادینان و سۆران. ئەمانە لەگەڵ عوسمانییان قۆڵیان لێ هەڵکرد دژی ئەردەلانییەکان و عەجەم، سەرەک وەزیران (سەدری ئەعزەم)ی عوسمانی خۆی سوپاسالاری هێرشەکە بوو. جیاوازی ئایینزایی گەلێ سوودی بۆی هەبوو، بەوەی هەندێ لە میرەکانی کورد و فەرمانبەرەکانی عەجەم سوننی بوون و

زیاتر بەعوسمانی دەشکانەوە، یارمەتی عوسمانییانیان دا لەم هێرشەدا. لەگەڵ ئەوەی تورکی عوسمانی سەرکەوتن، هەتا گەیشتنە شاری هەمەدانیش لە ساڵی ١٦٣٠م، بەڵام ئەحمەد خانی ئەردەلان توانی ویلایەتی شارەزوور لە عوسمانییان وەربگرێتەوە.

لە ماوەی ئەم تەنگوچەڵەمەیەدا سلێمان خانی ئەردەلان بوو بەمیر. لەولاشەوە تازە میرنشینی بابان خەریک بوو دروست دەبوو لە ناوچەی سلێمانی، لە ڕۆژئاوای ئەردەلان. میرنشینی بابان سوودی لە بێ هێزی و دواکەوتوویی ئەردەلان وەرگرت، بۆیە سلێمان بەگی بابان لە ساڵی ١٦٩٤ بەسەر ئەردەلانی دادا و گەلێ لە ناوچەکانی داگیر کرد، بەڵام زۆری نەخایاند بەهۆی یارمەتی عەجەمەوە ئەم ناوچانەیان لە بابانەکان وەرگرتەوە.

لە سەدەی هەژدەهەمیندا بابانەکان زۆر بەهێزبوون، ئەمە بووە هۆی مەترسی و سەغڵەتبوونی ئەردەلانییەکان، لەم ڕۆژگارەدا ترسی گەورەی بابانەکان ئەوان بوون. خانە پاشای کوڕی بەکر بەگ یەکێک بوو لە میرە بەهێزەکانی بابان، لە ساڵی ١٧٢١م لە قەڵاچۆلان بنچینەی میرنشینی بەهێزی بابانی دامەزراند و پەلاماری دایە هاوسێی ڕۆژهەڵاتی کە ئەردەلان بوو، لە ئەنجامدا داگیری کرد و خۆی بوو بەسەرۆکی، بەڵام ئەم داگیرکردنە زۆر بڕی نەکرد، وا بوو لە ساڵی ١٧٣٠م نادر قولی بابانەکانی لە خاکی ئەردەلاندا دەرکرد.

بەڕاستی سنوورێکی خەت کێشراوی هێمن لە نێوان میرنشینە کوردییەکاندا نەبوو، بەهۆی سیاسەتی داگیرکردن کە هەردوو دەوڵەتە گەورەکەی ڕۆم و عەجەم لەسەری دەڕۆیشتن. ئەمەو تورکی عوسمانی و عەجەمیش هەمیشە کوردیان بەکار دەهێنا بۆ جێبەجێکردنی تەنگوچەڵەمەی ناوەوەی خۆیان. وەکو ئاشکرایە گەورەترین گیروگرفتیان لە ڕووی سیاسییەوە لە خاکی ئێراندا لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەمدا ئەو خەباتە بەهێزە بوو لە نێوان کەریم خانی زەند و قاجارییەکاندا، بۆیە کەریم خان بابانەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا و ئەردەلانییەکانیش سەر بەقاجارەکان بوون، لە ئەنجامی ئەمە بابانەکان هێرشیان بردە سەر ئەردەلان بەیاریدەی کەریم خان داگیریان کرد. ئەم دووبەرەکییە بوو بەهۆی شەڕبوونی خاکی کوردەواری، جگە لەوەی والی بەغدای تورکیش بەبێ وچان دەستی دەخستە ناو سیاسەتی ناوەوەی ئەم میرنشینانە.

لەگەڵ نزیکبوونەوەی سەدەی نۆزدەم لە ساڵی ١٨٠٠ ئەمانوڵڵا خانی ئەردەلانی لە جێگەی خوسرەو خانی گەورەی باوکی دانیشت، فەرمانڕەوایی ئەم میرە دڵسۆزە تا ساڵی ١٨٢٥م.ی خایاند، ماوەی چارەکە سەدەیێک لە فەرمانڕەوایی ئەم میرە هێندەی شەش



حەوت سەدە لە فەرمانڕەوایی ئەردەلانەکان بۆ مێژووی ئەم میرنشینە گرنگ بوو. ئەمانوڵڵا خان یەکێکە لە میرە بەناوبانگ و دڵسۆزی نەتەوەی خۆی و شانازی مێژووی ڕابردوو وەک نیکیتین دەڵێ ئەمانوڵڵا یەکێک بوو لە خانە دیار و بەدیمەنەکانی چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەم، هەوڵی دەدا شارە بچووکەکەی سنە وەکو پایتەختی مەملەکەتێکی گەورە بخاتە ڕوو.

ئەم میرە بەچاوێکی وردبین تەماشای زانست و ئەدەبی دەکرد، بارەگای والی جێگەی شاعیر و نووسەر و زانایان بوو، لە بابەت ئاوەدانکردنەوەوە پێشکەوتوو بوو. ناوچەکانی ئەردەلان بەتایبەتی شاری سنە ئێستاش لە هەموو شتێکدا مێژووی ئەردەلانەکان دەگێڕێتەوە، کۆشک و تەلار و مزگەوتە جوانەکانی وێنەی ئەندازیاری هونەری بەرزی ڕۆژهەڵات دەنوێنن. مزگەوتەکانی دارولئیحسان و دارولئەمان و حاجیر خاتوون و زۆری دیکە گەلێ زانا و شاعیر و نووسەری گەورەی کوردیان پێ گەیاندووە و گەلێ دەسنووسی ئەدەبی و ڕۆشنبیرییان تێدا نووسراوەتەوە.

لە دوای مردنی ئەمانوڵڵا خان خوسرەو خانی کوڕی لە جێگەی دانیشت، ئەم والییە دە ساڵ فەرمانڕەوایی کرد، لە دەوروبەری فەرمانڕەوایی ئەم والییە ئەردەلان بوو بەنێوەندێکی گرنگ و گەورەی شیعر و ئەدەب، والی خۆی شاعیرێکی ناسراو بوو، خێزانی بەڕێزی ماه شەرەف خانمی کوردستانی ناوبانگی بەهەموو لایێک بڵاو بووبووەوە وەک شاعیر و مێژوونووس. نازناوی شیعری «مەستوورە» بوو.

لە پاش مردنی خوسرەو خان و دانیشتنی ڕەزا قولی خان لە جێگەی دەوری ئاژاوە دەستی پێ کرد لە نێوان والییانی ئەردەلان خۆیان، تا ساڵی ١٨٦٧ ئەم ئاژاوەیە بەردەوام بوو، لەو کاتەی ئەمانوڵڵا خانی دووەم فەرمانڕەوا بوو. لەو ساڵەدا ناسرەدین شا تەخت و تاراجی ئەم بنەماڵەی لەناوبرد، فەرهاد میرزای مامی بەفەرمانڕەوا دانا لە خاکی ئەردەلاندا.

لەم بەشەی کوردستاندا پیشەسازی هونەری ورد و پێشکەوتوو بووە، وەکو دروستکردنی خەنجەر و خشڵی ژنان و قوتووی جوانی خانمان لە زیو و مەعدەنی دیکە. دەسکردی شەترەنج قوتووی جیگەرە لە دار و مەعدەن جێگەی دیاری هەبوو، مافوور و بەرماڵی سنە لە هەموو ئێراندا ناوی هەبوو. ئەو بەرهەمە پیشەسازییانە لە دەرەوەی هەرێم ڕەواجیان هەیە.

خەڵکی کورد بەڕێزەوە ناوی میرنشینی ئەردەلان دەبەن، چونکە ئەم میرنشینە یەکێک

بوو له میرنشینه هەره گرنگەکان بەدرێژایی مێژوو له خاکی کوردستاندا دامەزران و له نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم کۆتاییيان هات.

## میرنشینی موکریان

شاری سابلاغ (ئێستا مەهاباد) نێوەندی خاکی موکریانە، لە جوگرافیای ئێراندا شارستانی مەهابادی پێ دەڵێن. ئەمە پارچەیێکە لە ئوستانی سێیەم و چوارەم کە ناوی ڕەسمی ئوستانی ئازربێجانە. لە لای ڕۆژهەڵاتدا سنووری لەگەڵ شارستانی مەراغەدایە، لە لای ڕۆژئاوا سنووری لەگەڵ عێراق دایە (ناوچەی سۆران – هەولێر) لە باوکووردا دەریاچەی ڕەزائییەیە، لە باشووردا ئوستانی پێنجەم (کوردستان – خاکی ئەردەڵان).

شارستانی مەهاباد لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە لە سێ بەش پێک هاتووە، نێوەندی مەهاباد، بەخشی بۆکان، بەخشی سەردەشت. ئەم ناوچانە لە ئێران ڕۆژئاوای ئازربێجانی پێ دەڵێن، تەنیا ئەم شارستانە لە ڕووی قەومی و زمانی کوردییەوە (دیالێکتی کرمانجی خواروو) کورد نین، بەڵکو هەموو خاکی موکریان، یاخود ئەو کوردانەی بەدیالێکتی کرمانجی باشوور دەدوێن خاکیان لەم پارچە زەوییە فراوانترە کە ناوی نراوە شارستانی مەهاباد. لە شارستانەکانی دیکەی ئازربێجانی ئێراندا کورد هەیە: لە بەخشی میاندواو لە شارستانی مەراغە، کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی مەهاباد، لە قەراغ زەریاچەی ڕەزائییە (ورمێ)، هەروەها لە بەخشی شنۆ و سلدووزیش لە شارستانی ڕەزائییە (ورمێ) کە کەوتۆتە باکووری شارستانی مەهاباد. ئەم هەموو ناوچانە خاکی کوردی موکرین.

سیاسەتی چەوساندنەوەی نەتەوەی کورد لە لایەن دەسەڵاتی ئێرانەوە لە هەموو سەردەمێکدا بووە هۆی ئەوەی لە دابەشکردنی بەڕێوەبەرایەتی جوگرافیشدا هەوڵ دراوە ناوچە کوردییەکان لە یەکتری جیا بکرێنەوە، ئەگینا بۆ چ ناوچەی مەهاباد کە پارچەیێکە لە کوردستانی ئێران نەخراوەتە سەر ئەو ئوستانەی کە ناوی کوردستانە و خراوەتە سەر ئازربێجانی ئێران؟!

خاکی موکریان بەگوێرەی نەخشەی جوگرافی کوردستانی باشوورەوە کەوتۆتە گۆشەی باکووری ڕۆژهەڵاتی، واتە لە باشووردا سنووری لەگەڵ ناوچەی ئەردەڵانە و لە ڕۆژئاوادا سنووری لەگەڵ ناوچەی سۆرانە.

هەرێمی موکریان لە خاکی کوردستانی باشووردا لە مێژوودا دەورێکی وای نەبووە لە پلەی میرنشینەکانی ئەردەڵان و بابان بێ، بەڵام یەکێکە لە کۆنترین مەڵبەندەکانی ژیانی



کورد، کوردناسی ئینگلیز ئی. بی. سۆن لەسەر ئەو باوەڕەیە زەردەشت لە ناوچەی موکریان لە دایک بووە، هەروەها دەڵێ ئەو کوردانە بەزمانێک قسە دەکەن نزیکە لە زمانی ئاڤێستای زەردەشت. مێژوونووسی کورد ئەمین زەکی لایەنگری ئەم باوەڕەیە و دەڵێ:

عەشرەتەکانی موکری کۆنترین عەشرەتی کوردن و لە هەموویان نزیکترن لە زەردەشت، بۆیە دەتوانرێ ئەم عەشرەتانە لە نەوەی میدییەکان بژمێررێن.

شەرەفخانی بدلیسی دەڵێ دامەزرێنەری میرنشینی موکریان ناوی سەیفوددین بووە، لە دەوروبەری فەرمانڕەوایی تورکمانەکاندا لە سەدەی پازدەم ناوچە دەرباسی داگیر کرد، لە پاشانا وڵاتی فراوان کرد تا دۆڵی باریک و ئاختاجی و والتیمۆر و سلدووز. لە دواییدا میرنشینی دامەزراند بەناوی موکریانەوە. بەم جۆرە لە پاش خەباتێکی زۆر ئەم میرە کوردە توانی دەسەڵاتی خۆی بچەسپێنێ. لە ئەنجامی شەڕوشۆڕێکی زۆر توانی دەسەڵاتی خۆی بەهاوسێکانی بسەلمێنێ. بەمردنی دامەزرێنەری میرنشین وەزعی وڵات کەوتە لێژییەوە، لە دەوروبەری سارم بەگی کوڕی سەیفوددیندا شا ئیسماعیلی سەفەوی هەموو وڵاتی کوردی داگیر کرد. بەڵام لە پاش بەرهەڵستییێکی بەهێزی کورد، سارم بەگ توانی لە ناخۆشی نێوان عوسمانی و عەجەم سوود وەربگرێ، بۆیێ داوای یارمەتی لە تورکی عوسمانی کرد. لە پاش مردنی سارم بەگ دەسەڵات کەوتە ژێر دەستی ئامۆزاکانی، ئەمانە لەسەر سیاسەتی سارم بەگ نەڕۆیشتن، بەڵکو بەتەواوی پشتیان کردە تورکی عوسمانی، هەر لەبەر ئەوە بوو سوڵتان سلێمانی عوسمانی بەهۆی میرنشینە کوردییەکانی دیکەوە، وەکو بادینان و هەکاری و عەشرەتی برادۆست و میرەکانی موکریانیان لەناوبرد. لە ساڵی ١٥٨٣ سوڵتان موڕادی سێیەمی عوسمانی فەرمانڕەوایی ناوچەیێکی گەورەی دایە دەست ئەمیرە بەگ کوڕی حاجی عومەر بەگ. ناوچەکە بریتی بوو لە مووسڵ، شارەزوور، هەولێر تا دەوروبەری مەراغە کە کەوتۆتە لای ڕۆژهەڵاتی زەریای ورمێوە، ئەم ناوچەیە لە دەوروبەری حەیدەر خانی کوڕی ئەمیرە بەگ زیاتر فراوان بوو.

سیاسەتی ئایینزایی (مەزهەبی) لای تورکی عوسمانی و عەجەم هەوەسێکی هەمیشەیی بوو و هۆیێکی گەورە بوو بۆ پەڕاگەندەکردنی کورد لەو کاتەی لە سەدەی حەڤدەمدا زیاتر دەسەڵاتی تورکی عوسمانی بەسەر کوردستاندا زاڵ بوو. ئەو پەیمانەی لە نێوان عوسمانی و ئێراندا لە ساڵی ١٦٣٩دا بەسترا، کوردی کرد بەدوو بەشەوە بەپێی ئایینزای سوننی و شیعی، عەشرەتەکانی کەلهوڕ و ئەردەڵان سەر بەئێران مانەوە و عەشرەتی دیکە کەوتنە خاکی عوسمانییەوە.

له زۆر کۆنەوە جیاوازی ئایینزایی ئەنجامێکی کوشندەی هەبووە بۆ نەتەوەی کورد، ئەم سۆزە ئایینییە هەمیشە لە لایەن تورک و عەجەمەوە بەکارهێنراوە بۆ یەک نەگرتنی عەشرەتەکانی کورد و نزیکبوونەوەی میرنشینە کوردییەکان لە یەکترییەوە. میرە کوردەکان و زۆربەی خەڵکی جووتیار و ڕەنجبەریش بەناوی ئایینەوە هەڵدەخەڵەتێنران، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار میری دڵسۆز و ژیری وا پەیدا دەبوو بەلایەوە مەسەلەی شیعی و سوننی گرنگ نەبوو، بەڵام لەبەر بێ هێزی میرە کوردەکان توانای سوپای تورکی عوسمانی و عەجەم بزووتنەوە پێشکەوتووەکانی ئەم میرانە لە پێناوی سەربەخۆیی سەری نەدەگرت.

لە دوای سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەمدا مێژوو ناوی دوو گەورەی موکریانمان بۆ دەور دەکاتەوە، هەردووکیان سەر بەقاجارەکان بوون لە دژی عوسمانی. ئەمانە یەکێکیان بوداغ خان بوو. هەندێ دانایی نواند و بەچاوێکی سیاسی قووڵ ورد بووەوە و هەوڵیدا سوود لە ناکۆکی نێوان کەریم خانی زەند و قاجارەکان وەربگرێ، لە پاشانا لە کەریم خانی زەند نزیک بووەوە، تا وەزعی وڵاتی خۆی بەهێز کرد. لەم ماوەیەدا قاجارەکان بەسەر کەریم خاندا زاڵبوون، بەڵام ناچاریش بوون لە دەوروبەری فەتح عەلی شای قاجاردا دان بەفەرمانڕەوایی موکری بێنن.

کەسی دووەمی دوو میرەکانی موکریان عەزیز خان بوو، دەورێکی باڵای هەبوو لە مێژووی قاجارەکاندا، لە دەوروبەری محەمەد شا و ناسرەدین شادا گەلێ یاریدەی قاجارەکانی دا، خۆشی گەیشتە پلەی جەنراڵسیمۆ لە سوپای ئێراندا، بەڵام بەزمان لێدانی سەدری ئەعزەم میرزا ئاغا خان بەوە تاوانبار کرا کە گۆیا دەستی لەگەڵ ڕووس و ئینگلیز تێکەڵ کردووە و لەگەڵیاندا ڕێک کەوتووە بۆ جاڕدانی سەربەخۆیی کوردستان و پچڕاندنی لە ئێران، بەڵام عەزیز خان خۆی نەدا بەدەستەوە، بەڵکو ڕای کردە هێلانەکەی خۆی لە بۆکان.

ناوچەی موکریان ئەگەرچی لە پێش سەدەی نۆزدەمدا نێوەندێکی گرنگی سیاسەت و فەرمانڕەوایی و کولتووری نەتەوەی کورد نەبوو، بەڵام لە سەدەی نۆزدەمدا دەورێکی باڵای هەبوو لە پێشخستنی ئەدەبی کوردیدا. خاکی موکریان ناوی شاعیری گەورەی کوردمان بۆ دەور دەکاتەوە، هەروەها لە سەدەی بیستەمیشدا و تا ئێستاکە بەناوچەیێکی سیاسی گرنگی بزووتنەوەی نەتەوەیی پێشکەوتووی کورد و نێوەندێکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری کوردی دەژمێررێ.



## میرنشینی سۆران

خاکی سۆرانی کۆن ئێستاکە زۆربەی دەکەوێتە ناوچەی هەولێر لە کوردستانی عێراقدا، ئەم خاکە سنوورێکی سروشتی هەیە وەکو جزیرە ئاساییێک ڕووباری زێی گەورە (زێی بادینان) و زێی بچووک (زێی کۆیە) دەوریان داوە. جێگەی ئەم ناوچەیە لە ڕۆژهەڵاتدا موکریان و شارستانی ڕەزائییە (ورمێ)یە لە ئێران، لە ڕۆژئاوادا ناوچەی مووسڵ، دیارە ناوچە باکوورییەکانی کوردن و خاکەکەیان پارچەیێکە لە کوردستانی باکوور ئەوەی زۆربەی هەرە زۆری کەوتۆتە تورکیا. ناوچەی سۆران سنووری لەگەڵ بەشەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی باکوور (کوردستانی تورکیا) هەیە، هەروەها لە باشووردا سنووری لەگەڵ ناوچەی کەرکووک و سلێمانی (کوردستانی عێراق)دا هەیە. لە نەخشەی کوردستانی باشووردا دەکەوێتە لای باکووری ڕۆژئاوای.

خاکی سۆرانی کۆن، یاخود پارێزگای هەولێری ئێستا بریتییە لە قەزایانی مەرکەز، ڕواندز، کۆیە، مەخموور، زێبار، شەقڵاوە. شەرەفخانی بدلیسی دەڵێ، سەرەتای فەرمانڕەوایی میرانی سۆران لە کەلۆس ناوێکەوە دەست پێ دەکا، لە سەدەی چواردەمی مەسیحی لە ئاوایی هەودیان لە ناوچەی هەولێر پەیدا بوو. لە دوای ئەو عیسای کوڕی کەلۆس میرنشینی بەناوی سۆران لە ڕواندز دامەزراند. لە دوای ئەو شا عەلی بەگی کوڕی عیسا هەولێر و مووسڵ و کەرکووکی لە قزڵباشە ئێرانییەکان سەندەوە، میرنشینێکی سەربەخۆی پێکهێنا. لە دەوروبەری عیزەددین شێری کوڕی شا عەلی بەگ هەولێری کردە پایتەختی میرنشین، سوڵتان سلێمانی قانوونی لە ساڵی ١٥٣٤م.دا کوشتی.

بەهۆی دەستدرێژی عوسمانییەکان ئەم ناوچەیە ئاسایشی تێدا نەبووە، لەبەر ئەوە میرەکان زۆر جار نێوەندی میرنشینیان دەگۆڕی، لە ماوەی فەرمانڕەوایی میرنشینی سۆران چەند جار پایتەختیان گواستۆتەوە بۆ دوین، هەریر، خەلیفان، ڕواندز.

یەکێ لە میرانی سۆران شاکەڵی بەگ نێوەندی میرنشینەکەی هێنایە هەریر. سلێمان بەگی کوڕی یەکێکە لە میرە هەرە بەناوبانگەکانی دەوری کۆنی فەرمانڕەوایی سۆران. ئەم میرە کەسێکی بەهێز و دادپەروەر بوو، بایەخی زۆری بەپێشکەوتنی وڵات دەدا، بەچاوێکی پڕ لە سۆزەوە دەینواڕییە کۆمەڵ لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە، قەڵایێکی سەختی لەسەر شاخی هەریر دروست کرد، تا ئێستا پاشماوەی لەبەرچاوە. خانزادی خوشکی سلێمان بەگ کاروباری وڵاتی بەڕێوە دەبرد لەو کاتەی کە والی عوسمانی سلێمان بەگی

خستە بەندیخانەوە. دادپەروەری سلێمان بەگ و خانزادی خوشکی تا ئێستاش لە ناوچەی سۆران پشتاوپشت لەسەر زاری خەڵکی ئەو ناوچەیەیە. ئەدەبی میللی خەڵکی کورد (فۆلکلۆر) گەلێ شتمان بۆ دەگێڕێتەوە لە بابەت دادپەروەری و لاوچاکی خانزاد و ژیانی خەڵکی کورد لەو سەردەمەدا، ئەم میرە تا ساڵی ١٥٨٩ فەرمانڕەوایی کردووە.

لەو کاتەی سلێمان بەگ لە بەندیخانە کۆچی دوایی کردووە، عەلی بەگی کوڕی نەیتوانیوە خۆی لەبەر هێرشی بابانەکاندا بگرێ لەبەر ئەوە ناچار بووە میرنشین بگوازێتەوە بۆ دەربەندی ڕواندز لە ساڵی ١٧٧٨، ئەم دەربەندە لە دواییدا بەناوی عەلی بەگەوە نرا «دەربەندی گەلی عەلی بەگ»، ئێستا گەلی عەلی بەگی پێ دەڵێن، بەڵام ئۆغوز بەگی کوڕی عەلی بەگ دیسانەوە لە ساڵی ١٧٨٧ میرنشینی گواستەوە ڕواندز.

دەوری زێڕینی ئەم میرنشینە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا بوو لەو کاتەی کە میر محەمەد پاشا کە بە(پاشای کوێرە) ناوی دەرکردبوو لە ساڵی ١٨٢٦ لە ڕواندز میرنشینێکی دامەزراند. باوکی محەمەد پاشا بێ هێز و بێ دەسەڵات بوو، محەمەدی کوڕیشی ئارەزووی ئەوەی دەکرد میرنشینێکی مۆدێرن لەسەر شێوەیێکی ڕێکوپێک دامەزرێنێ، دەیزانی ئەمە بەباوکی ناکرێ، بۆیە دەسەڵاتی لە باوکی سەند و لە ساڵی ١٨٣٠دا جاڕی سەربەخۆیی دا و هێرشی بردە سەر عەشرەتەکانی سوورچی و خۆشناو و خستیانییە ژێر دەستی خۆیەوە و فەرمانبەری هەریریشی دەرکرد کە لە میرەکانی بابان بوو، ئینجا هەولێری داگیر کرد تا زێی بچووک بوو بەسنووری نێوان سۆران و بابان، لە دواییدا کۆیە و ڕانیەشی لە بابانەکان سەندەوە. والی بەغدا عەلی ڕەزا پاشا ناچار بوو دان بەپاشایەتی میری گەورە یا پاشای کوێرە بنێ.

لە دوای ئەوەی میری گەورە لە ساڵی ١٨٣١ ناوچەکانی خوارووی داگیر کرد ڕووی کردە ڕۆژئاوا، لە ڕۆژهەڵاتی مووسڵدا هێرشی بردە سەر خاکی کوردە ئێزیدییەکان، لە پاشانا ڕووی کردە ئاکرێ و ئامێدی و دهۆک و زاخۆ، ئەمانەش کەوتنە ژێر فەرمانڕەوایی میری سۆران. لە دوای ئەمە بەرەو جزیری بۆتان و حەسەن کێف کەوتە ڕێ، ئینجا بەدرخانییەکانی تەنگەتاو کرد تا گەیشتە ماردین و نسێبین.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی پاشای گەورە دەسەڵاتی میرنشین بەهێز بوو، ئەگەر هەندێ دەستدرێژی لە کۆمەڵدا بووبێ لە پێناوی چاکەی خەڵک و ئاسوودەیی کۆمەڵ بووە، لەو ناوچانەدا دەوڵەت بەیەکسانی تەماشای هاووڵاتییانی دەکرد، لەبەر ئەوە بێ یاسایی باڵی



بەسەر کۆمەڵدا نەکێشا بوو، بەهیچ جۆرێ ناوچەی میرنشینی سۆران بەراورد ناکرێ لەگەڵ ئاژاوە و تێکچوونی شیرازەی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری ناوچەکانی دیکەی کە ڕاستەوخۆ لە لایەن والی تورکە عوسمانییەکانەوە بەڕێوە دەچوون.

میری گەورە پیاوێکی تێگەیشتوو و ژیر بوو. بێ گومان تازە بابەتتر بوو لە میرەکانی کوردی دەوروبەری خۆی. پیلانێکی گەلێ فراوانی هەبوو بۆ دامەزراندن و چەسپاندنی حکوومەتێکی کوردی سەربەخۆی پێشکەوتوو، ئەو سەرچاوانەی لە ناوەوەن ئەمە دەسەلمێنن. لەو سەردەمەدا لە ناوچەی برادۆستدا کانی مس و قوڕقوشم و مەعدەنی دیکە دۆزرایەوە، ئەمە بووە مایەی دروستکردنی فابریقەی چەکی جەنگی. بۆ ئەم مەبەسە لە ساڵی ١٨١٥ لە گەڕەکی کاولۆکان لە ڕواندز کارخانەی شیر و خەنجەر و تفەنگ و لوولەتۆپ و گوللە دروستکردن و داڕشتن و زێڕنگەری و دارتاشی دامەزرێنرا.

وەستا ڕەجەب لە سەردەمی فەرمانڕەوایی میری گەورە یەکێک بوو لە وەستا دەست زێڕینەکانی کوردستان لە دروستکردنی چەکی جەنگی. بۆ زیادکردنی زانیاری پیشەسازی میری گەورە وەستا ڕەجەبی ناردە سانت پیترسبورگ (پایتەختی ڕووسیا)، لەوێ ئاشنای تاقیکردنەوەکانی وەستایانی ڕووس بوو. لە پاش گەڕانەوەی لە ڕووسیا دەستی کرد بەدامەزراندنی فابریقە بەناوبانگەکەی ڕواندز. لە دواییدا بەرهەمی فابریقەکەی وەستا ڕەجەب گەیشتە (٢٢٢) دانە لوولەتۆپ. لەمانە هەندێکیان لە مۆزەی چەکی «بابولوەستانی» لە بەغدا پارێزراون. لەسەر هەموو تۆپەکان ناوی «محەمەد» هەڵکەندراوە، هەموو تۆپەکان لە نێوان ساڵانی ١٨١٦-١٨٢٩ داڕێژراون. لە ساڵی ١٩٢٦ سێ تۆپیان لە چۆمی ڕواندز دەرهێنا کە لە جەنگی تورکی عوسمانییانەوە کەوتبوونە ناو ئاوەوە. ئێستاکە ئەم سێ تۆپە لە بەردەرگای سەرای ڕواندز دانراون. هەروەها لە گەلێ شوێنی کوردستانی عێراق ئەم تۆپانە بەرچاو دەکەون، لەمانە یەکێکیان لە هەولێر لە گۆڕستانی چراغ کەوتبوو بۆ مانگی ڕەمەزان بەکاریان دەهێنا.

میری گەورە وڵاتی ڕێکخستبوو، یاریدەدەری بۆ خۆی دانابوو، ناوی ڕەسمی «الأمیر المنصور أمیر رواندوز و حریر و کوی محمد بک ابن مصطفی بک» واتە (میری سەرکەوتوو میری ڕواندز و هەریر و کۆیە محەمەد بەگ کوڕی مستەفا بەگ)، یاریدەدەری یەکەمی ڕەسووڵ بەگی برای بوو، ئەحمەد بەگی برای دیکەشی وەزیری جەنگ بوو، شەش ئەفسەری گەورە یاریدەیان دەدا. سکەی پارەی لێدا، پارەکانی لە زێڕ و زیو و مس بوون. لە دیوێکی «الامیر المنصور محمد بک» لە دیوەکەی تری «ضرب في رواندز» نووسرا

بوون. واته (میری سەرکەوتوو محەمەد بەگ – لە ڕواندز داڕێژراوە).

لە بابەت پێگەیشتوویی و تێگەیشتوویی محەمەد پاشا و ئەمن و ئاسایش لە ناوچەی سۆراندا لە دەوروبەری ئەم میرە گەورەیە کارێکی پڕ سوود و بەکەڵکە قسەی کەسانێک بهێنینەوە کە چاویان پێی کەوتووە، جەی. بی. فرایزەر ئەوە دەگێڕێتەوە لە ساڵی ١٨٣٣ کە محەمەد پاشا لە ئۆردوگای خۆی بوو لە ئاکرێ دوکتۆر ڕووسی بانگ کردە لای خۆی. ئەم پزیشکە لە جێنشینی بەریتانی لە بەغدا کاری دەکرد. دوکتۆر ڕووس چووە لای میر، لە بابەت ئەم کۆبوونەوەیە دەڵێ: محەمەد پاشا بەدەنگێکی سووکی لەسەرخۆ قسەی دەکرد. گەلێ پرسیاری لێ کردم لە بارەی سیستێمی خوێندن و خوێندەواری لە بەریتانیا، لە دواییدا ڕوونکردنەوەی هەندێ شتی لێ پرسیم. خۆشی باسی لە پێوەندی نێوان ئینگلیز و ڕووس و عەجەمی بۆ گێڕامەوە، بەبایەخێکی زۆرەوە تەماشای ئەم مەسەلەیەی دەکرد. ئینجا هاتە سەر نەخۆشی و قەلاچۆکردنی، ئەوجا باسی چەک و سیلاح.

لە دوای ئەوەی دوکتۆر ڕووس لە پاش چەند ڕۆژێک ئۆردووگای بەجێهێشت، پاشا هێزێکی چەکداری لەگەڵدا نارد تا بیگەیەننە سەر سنووری دەوڵەتی عوسمانی لە نزیک مووسڵەوە بوو. لێرەدا دوکتۆر ڕووس باس لە ڕێکوپێکی بەڕێوەبەرایەتی میرنشینی سۆران دەکا لەو کاتەی وڵاتی عوسمانی لە ئاژاوەییەکی بێ سەروبەر دەژیا. دەڵێ هەرکە گەیشتینە ناو سنوور یەکسەر بەخشیشیان لێ داوا کردین، ئەگەر نەیدەین بێ گومان دەکوژرێین، بەڵام ئەم کارە ناپەسەندە لە ناو خاکی حکوومەتی ڕواندزدا نەبوو.

محەمەد پاشا یەکێک بوو لەو گەورە کوردانەی هەوڵیان دەدا بۆ سەربەخۆیی کوردستان، دیاربوو بەبێ کۆششی بێ وچان لە پێناوی بێ هێزکردنی دەوڵەتی عوسمانی ئەم هیوایە نەدەچووە سەر. بۆ ئەم مەبەسە پێوەندی لەگەڵ خدێوی میسر محەمەد عەلی پاشا پەیدا کرد، لە ساڵی ١٨٣١ دەستی کرد بەنامەنووسین بۆی، بۆ ئەوەی هەرکەسە لە لای خۆیەوە هێرش بەرێتە سەر دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام کە عوسمانییەکان هەستیان بەمە کرد بەجارێ کەوتنە خۆ. ڕەشید پاشای سەدری ئەعزەمی پێشوو ئەوەی لە ساڵی ١٨٣٢ فەرماندەی سوپای عوسمانی بوو کە لە قۆنیە کەوتە شەڕ لەگەڵ میسرییەکان داوای لێ کردبوو پیلان دابنێ بۆ لەناوبردنی محەمەد پاشا. ئەمە هانی والی بەغدا و مووسڵی دا خۆیان ئامادە بکەن، یەکەمیان لە باشوورەوە، ئەویتریان لە ڕۆژئاواوە هێرش ببەنە سەر پاشای ڕواندز. دەست بەشەڕ کرا سوپای هەردوو لاکە گەیشتنە گەلی عەلی بەگ، بەڵام لەوێوە نەیانتوانی تێپەڕ ببن.



ڕەشید پاشا نامەیێکی بۆ محەمەد پاشا نووسی کە سوڵح بکا، وا دەگێڕنەوە مەلا محەمەدی خەتی سەدرولئیسلامی پاشای ڕواندز بوو فەتوای دەکرد هەر کەسێکی لەگەڵ خەلیفەی موسڵمانان (سوڵتانی عوسمانی) شەڕ بکا بێ ئیمانە. ئەمە کارێکی گەورەی کردە سەر ئۆردوگای سوپای کورد کە شەڕ نەکەن، لەو کاتە کە هێشتا عوسمانییەکان نەیانتوانی بوو ڕواندز بگرن، بەم جۆرە محەمەد پاشا گیرا و نێررایە ئەستەموول، لە ساڵی ١٨٣٧ بەدەسیسەی تورک خنکێنرا و بوو بەقوربانی تاوان و ستەمی سیاسەتی چەوتی عوسمانی.

بەلای ئێمەوە مەسەلەی فەتوای مەلا محەمەدی خەتی تا ئێستا وەک ڕووداوێکی مێژوویی ساغ نەبۆتەوە، زیاتر قسەی ناو خەڵک و سەرزارە. تا ئێستا دوکومێنتێک نەدۆزراوەتەوە ئەم فەتوایەی تێدا نووسرا بێ.

لە پاش ئەمە کاروباری میرنشین کەوتە ژێر دەستی کەسوکاری میری گەورە. لە دوای دوو ساڵ ئەحمەد پاشای براشی بەفیتی تورکە عوسمانییەکان کوژرا، ڕەسووڵ پاشا بوو بەنیشتەجێی، ئەمەش حەوت ساڵ فەرمانڕەوایی کرد، لە دوای ئەمە ناوچەی سۆران کەوتە ژێر کارگێڕی ڕاستەوخۆی بیروکراتییەتی عوسمانی.

لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا ئێران توانی میرنشینی ئەردەلان و موکریان بڕووخێنێ و تورکی عوسمانیش هەردوو میرنشینەکەی سۆران و بابان بڕووخێنێ.

تا ئێستا لە ناوچەی سۆراندا بەچاوێکی پڕ لە شانازی و ڕێزەوە باسی دەوروبەری فەرمانڕەوایی محەمەد پاشا دەکەن، وەکو سەردەمێکی نموونەی دادپەروەری و ئۆقرەیی و ئەمن و ئاسایش دەیگێڕنەوە. خەڵکەکە بەچاوی خۆیان لە پاش ڕووخانی ئەم دامودەسگایە، زۆرداری و ڕێگری و جەردەیی و ستەمی تورکی عوسمانییان دیبوو، کە تا جەنگی یەکەمی گێتی خایاند.

## بڵاوبوونەوەی ڕینیسانسی ئەدەبی کوردی
## لە هەموو ناوچەکانی باشووری کوردستاندا

نوێکردنەوەی میرنشینی بابان بەدروستکردنی سلێمانی وەک پایتەختێک هۆیێکی گرنگ بوو بۆ پەیدابوونی بزووتنەوەی ئەدەبی لە باشووری کوردستاندا. بەڕاستی لە سەدەکانی نۆزدەم و بیستەم و تا ئێستاش شاری سلێمانی نێوەند و مەڵبەندی یەکەمی بزووتنەوەی ئەدەبی کوردییە و شایانی ئەوەیە بەپایتەختی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی ناو ببرێ لە باشووری کوردستان و تا ڕادەییێک لە هەموو کوردستان.

وەک ئاشکرایە شاری سلێمانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا سێ شاعیری گەورەی دەور کردەوە، نالی و سالم و کوردی، ئەمانە خەڵکی ڕەسەنی شار بوون و زۆربەی ماوەی ژیانیان لە سلێمانی بردە سەر. ئەم بزووتنەوەیە کە زادەی داهێنانی ڕۆشنبیری ئەو شارە بوو لە دواییدا ئەو پلە مەزنەی لە ژیانی خوێندەواری کوردەواریدا پاراست. بزووتنەوەکە تا دەهات زیاتر پەرەی دەسەند و لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە پێش دەکەوت. ژانر و بابەتی تازەی دەهێنایە ناو ئەدەبی کوردییەوە لە پێشانا لە شیعر، لە دواییدا لە پەخشانیش. دەتوانین بڵێین تا ڕۆژی ئەمڕۆ شاری سلێمانی ئەو جێگە بەرزەی پاراستووە، ئەمە دیاردەییێکی ئاساییە لەناو هەموو کۆمەڵ و میللەتانی سەر ڕووی زەوی لە هەموو سەردەم و ڕۆژگارێکدا، ناوچەییێکی دیاریکراو بۆ ماوەییێکی درێژ تیشکی مەشخەڵی ئەدەب و هونەر لە وڵاتێک یا نەتەوەییێکدا هەموو لایێک ڕووناک بکاتەوە.

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم نەوەی دووەمی قوتابخانەی نالی لە شاری سلێمانی و دەوروبەری واتە میرنشینی بابانی کۆن پەیدابوون، ئەمانە بەردەوام و تەواوکەری بزووتنەوە ئەدەبییەکە بوون. بەم جۆرە ئەدەبی کوردی پەلی هاوێشت بۆ هەموو ناوچە جوگرافییەکانی دیکەی کوردستانی باشوور، بەواتاییێکی دیکە بۆ هەموو ئەو ئاقارانەی بەدیالێکتی کرمانجی باشوور دەدوێن لەگەڵ بەشێکی زۆر لە ناوچە جوگرافییەکانی گۆرانزەمینی کوردەواری کە بەدیالێکتی گۆرانی دەدوێن، بەتایبەتی ئەو ناوچە گەورە و فراوانەی گەرمیانی پێ دەڵێین و نێوەند و پایتەختەکەی کەرکووکە.

بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی نوێ لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا بەخشکەیی و لەسەرخۆ هەر چواردەوری ناوچەی سلێمانی گرتەوە، ئینجا لە دواییدا لە هەموو ناوچەکانی باشووری کوردستان بڵاو بووەوە.



### ناوچەی گەرمیان

نێوەندی ناوچەی گەرمیان شاری کەرکووکە. لە ڕووی زمانی قسەکردنەوە ناوچەی بەیەک گەیشتنی هەردوو دیالێکتی گۆرانی و کرمانجی باشووری زمانی کوردی بوو. خەبات و زۆرانبازی زۆر بەهێز بوو لە نێوان ئەم دوو دیالێکتە، وەزعی سیاسی و کۆمەڵایەتی و خوێندەواری لە چاکەی دیالێکتی کرمانجی باشوور بوو. لەبەر ئەوە لە ماوەی سەدە و نیوێک بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی، قوتابخانەی نالی خۆی سەپاندە سەر دیالێکتی گۆرانی. ئەگەرچی دیالێکتی گۆرانی وەک زمانی دایک لە ناو خەڵکی و شاعیرانیان مایەوە، بەڵام زمانی نووسین بوو بەدیالێکتی کرمانجی باشوور. گەرمیانی کەرکووک لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و تا ئێستاش شاعیری گەورەی دەور کردۆتەوە، یەکێک لەمانە لەندەهوورێکی وەکو شێخ ڕەزا لە عەشرەتی زەنگنە بوو و دەبوو لە بنجدا بەدیالێکتی گۆرانی شیعر بڵێ، بەڵام ئەو لە ڕێزی ڕێڕەوە سروشتییەکە بوو کە دەبوو بەدیالێکتی کرمانجی باشوور شیعر بڵێ.

### ناوچەی موکریان

نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم بەگشتی ماوەی لەناوچوونی میرنشینە کوردییەکان بوو، لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تا ئەو سەردەمە میللەتی کورد لە ناو دوو دەوڵەتە ئایینزاییییە سوننی و شیعییە عوسمانی و عەجەمەکاندا بوو، بەدرێژایی مێژوو ئەم دوو دەوڵەتە دوژمنی یەکتری بوون، زیانی ئەم دوژمنایەتییەیان بۆ خۆیان کەمتر بوو، زیاتری بەر کورد دەکەوت. لەو ڕۆژگارەدا بوو بیری نەتەوەیی بەشێوەییێکی نوێ لە ژێر کاریگەری بیری نەتەوەیی ئەورووپا بەڕێگەی ئەستەموولەوە (دەوڵەتی عوسمانییەوە) گەیشتە کۆمەڵی کوردەواری.

ئەگەر ناوچەکانی زۆربەی خاکی کوردستان تاقیکردنەوەی فەرمانڕەوایی میرنشینییان زۆر بووبێ، ئەم دیاردەیە لە موکریاندا کەم بووە. دەتوانین ئەوە دیاری بکەین مێژووی کوردستانی ئێران کۆنە و دەگەڕێتەوە سەردەمی فەرمانڕەوایی سەفەوییەکان. ئەو سنوورەی لە نێوان عوسمانی و ئێران کێشرا بوو لە ئەنجامی جەنگی چالدیران (١٥١٤م) تا ئێستا وەکو خۆی ماوەتەوە. لە دابەشکردنی خاکی عوسمانی کۆن لە دوای جەنگی یەکەمی گیتی، کە دابەشکردنی دووەم بوو، تەنیا کوردستانی عوسمانی گرتەوە، ئەوەی ئێران وەکو خۆی مایەوە.

پێوەندی ناوچەی سلێمانی (بابانەکان) بەموکریانەوە گەلێ بەهێزتر بووە لەو پێوەندییەی کە ناوچەی بابان لەگەڵ کوردی ناوچەی ئەردەلان و سۆران بوویەتی، چونکە ناوچەی سلێمانی و موکریان دیالێکتی قسەکردنیان، واتە کرمانجی خواروو لە یەکترییەوە نزیکن، هەندێ نەریتی کۆمەڵایەتی و ئەدگاری ئەتنۆگرافییان لە یەکتری دەکا، هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی هەردوو ناوچەکە لە یەک ڕەگەزی هۆز و تیرە و عەشرەتن. پێویستە ئەوە بزانرێ بابانەکانیش لە بنجدا لە موکریان سەریان هەڵداوە، لەبەر ئەوە کارێکی ئاساییە بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی بەڕوونی لە سەدەی نۆزدەم لە موکریان ڕەنگی بداتەوە. لەیەکچوونی زمان و نەریتی کۆمەڵایەتی بوو بەهۆی ئەوەی ڕۆشنبیرانی موکریان ئەدەبێکی نوێی ناوچەی سلێمانی بەهی خۆیانی بزانن و لاسایی بکەنەوە. بەم جۆرە لەو ڕۆژگارەوە تا ئێستا ناوچەی موکریان کە نێوەندەکەی مەهابادە (ساباڵاغ) بوو بە نێوەندێکی گرنگی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی. کۆمەڵێک شاعیری لێ پەیدا بوو وەکو وەفایی و ئەدەب و گەلێکی دیکەی کە مێژووی ئەدەبی کوردییان دەوڵەمەندتر کرد.

## ناوچەی ئەردەلان

ناوچەی ئەردەلان کە شاری گەورە و پایتەختی سنەیە و لە جوگرافیای ناوەوەی ئێران ئێستا بەئوستانی کوردستان ناو دەبرێ کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی ناوچەی سلێمانییەوە. لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تەنانەت لە ڕۆژگارانی فەرمانڕەوایی سەفەوی و قاجارەکانەوە میرنشینێکی سەربەخۆ و نیوە سەربەخۆ بووە لە خاکی ئێراندا.

یەکێ لە خاسیەتەکانی ئایینی - کۆمەڵایەتی بنەماڵەی فەرمانڕەوای ئەردەلانییان لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی ئایینزای شیعە بۆ یەکەمین جار بوو بەئایینزای دەوڵەت، ئەم بنەماڵە کوردە گۆرانەش بوون بەشیعە، کەچی خەڵکی ناوچەی ئەردەلان بەشاری سنەوە لەسەر ئایینزای سوننی و سەر بەئیمامی شافعی بوون. لەو کۆمەڵەدا هەردوو دیالێکتی زمانی کوردی گۆرانی و کرمانجی باشوور لە ناوەوە بوون. لە پێشانا زمانی شیعری کوردی گۆرانی بوو لە ناو خەڵک و لە بنەماڵەی فەرمانڕەوا و دەرباری والییانی ئەردەلان. بزووتنەوەیێکی ئەدەبی لە ئەردەلاندا بەدیالێکتی گۆرانی کەوتە ناوەوە. هەندێ لە والییانی ئەردەلان بەکوردی گۆرانی شیعریان دەنووسی، لەوانە خوسرەو خانی والی و خێزانی ماه شەرەف خانمی ئەردەلانی «مەستوورە» (١٨٠٤-١٨٤٧). لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم لەم ناوچەیەدا ئەدەبی دیالێکتی گۆرانی هەندێ کز بوو



لەسەر حسێبی پەرەسەندنی بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی باشووری کوردستان، واتە قوتابخانەی نالی.

زمانی قسەکردن و ئەدەبی میللی (فۆلکلۆری) ناوچەی ئەردەلان دیالێکتی کرمانجی باشوور بوو، ئەمە زەمینەی خۆش کرد نەوەی دووەمی قوتابخانەی نالی لە ناوچەی ئەردەلاندا پەیدا ببێ. دیارە ئەم ناوچەیەش وەکو ناوچەی گەرمیانی کەرکووک ئەدەبی دیالێکتی گۆرانی تێیدا مایەوە تا ئێستا، بەڵام کرمانجی باشوور بەسەر گۆرانییەکەدا زاڵ بوو.

نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم هەندێ شاعیری دەور کردۆتەوە لەم ناوچەیە و ناوچەکانی دیکەی کوردستانی ئێران وەک کرماشان و لوڕستان بەهەردوو دیالێکتی زمانی کوردی کرمانجی باشوور و گۆرانی شیعریان داناوە. یەکێ لە شاعیرە ناودارەکانی ناوچەی کوردستانی ئێران (سنە) سالمی سنەییە.

## ناوچەی سۆران

ناوچەی سۆرانی ئێستا لە نەخشەی باشووری کوردستاندا لە ڕووی مێژووی دێرینییەوە جێگەیێکی گرنگی بووە بۆ دروستبوون و خەملاندنی نەتەوەی کوردی سەردەم، چونکە لەگەڵ هەموو کوردستانی تورکیا و سوریای ئێستا پارچەیێک بووە لە میزۆپۆتامیای باشوور، بەتایبەتی لە ناوەڕاستی هەزارەی یەکەمی پێش لە دایکبوونی مەسیح کە میدییەکان بەهاوکاری لەگەڵ کلدانییان دەوڵەتی ئاشوورییان (ئەکەدی - بابلی - ئاشووری) هەتا هەتایە بنبڕ کرد و ناوی نەتەوەکانی ئەو ڕۆژگارە کۆنە ون بوو و ناوی تازە کەوتە ناوەوە.

ناوچەی سۆران لە سەردەمە دێرینەکانی مێژووی کۆنی پێش مەسیح و لە دواییدا ڕۆژگارانی مەسیحی و ئیسلامی دەوری گرنگی بووە لە مێژووی نەتەوەی کوردی ئێستا و باب و باپیرانی کۆنی، کەچی لەو دوو سەد ساڵەی دواییەدا بەتایبەتی لە سەدەی نۆزدەمدا ئەو دەورەی نەبووە، چونکە ناوچەیێکی سەر ڕێی سوپای عوسمانی بووە، دەوڵەت بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەداوە. ئەمە لە لایێک لە لایێکی دیکەوە دووری لە سلێمانی بۆتە هۆی ئەوەی تاقیکردنەوە شارستانییەکانی سلێمانی درەنگ بگاتە هەولێر. لەبەر ئەوە بزووتنەوە ئەدەبییەکەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم وەک لاساییکردنەوەیێک درەنگ گەیشتە هەولێر. دەکرێ ماوەی پاش جەنگی یەکەمی گیتی دیاری بکرێ بۆ

بەرپابوونی بزووتنەوەی شیعری کوردی وەک ڕەنگدانەوەییێکی قوتابخانەی سلێمانی لە ناوچەی سۆراندا.

لەم ماوەیەدا پێویستە ئەوە بزانرێ ناوچەی سۆران بەدرێژایی ئەو چوار سەدەی دواییە لە ڕووی سیاسی و بەڕێوەبردنەوە تەنیا شاری هەولێر نێوەند و پایتەختی نەبووە، بەڵکو ڕواندز و هەریر دەوریان لە هەولێر گرنگتر بووە، لەبەر ئەوە دەبینین نوێنەری ڕاستەقینەی ناوچەی سۆران لە ڕووی ئەدەبییەوە کۆیە بووە. بەڕاستی ئەو شارە بووە بەپایتەختی بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و وەک نێوەندێکی گرنگ و نوێنەری ڕاستەقینەی قوتابخانەی نالی لە ناوچەی سۆراندا کەوتۆتە ناوەوە. کۆیە و دەوروبەری ناوی شاعیری گەورەمان بۆ دەور دەکاتەوە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە تا ئێستا.

## بەشی دووەم

# ڕینیسانسی شیعری کوردی لە کۆیە

## شاری کۆیە

کـۆیە شـارێکە بەم ناوەوە ناسـراوە و هەندێ جـاریش بەشـێـوەی «کـۆ» و بەڕەسـمی بە«کۆیسنجەق» ناو دەبرێ. لە دێرزەمانەوە مەڵبەندی ژیان و ئێستگەی بازرگانی و ڕێی کاروانان بووە، بەشداری لە جموجۆڵی کۆمەڵایەتی و ئابووری سەردەمی نەتەوە کۆنەکانی ئەرکیـۆلۆجی کـردووە. لە قـۆناغی دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسـلام شـاری کـۆیە سـەر بەمیرنشینەکانی باشووری کوردستان بووە.

لە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی نۆزدەم کـۆیە و دەوروبەری مـەیدانی جـەنگ بووە لە نێـوان مـیـرنشـیـنە کـوردییـەکـانی ئەردەلان و بابان و سـۆران. لە ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەم (١٨٤٣)دا کۆیە لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە داگیر کراوە، فەرمانڕەوایی عوسمانی تا کۆتایی جەنگی یەکەمی گێتی خایاندووە (١٩١٨)، لەم ماوەیەدا کۆیە سەر بەویلایەتە جیاوازەکانی عوسمانی عێراقی کۆن بووە، لە ساڵی ١٨٧٩ ویلایەتی مووسڵی عوسمانی دوو سنجـاقی هەبووە، کـەرکـووک و سلێـمـانی، لەو سـەردەمـەدا کـۆیە قـەزا بووە و سـەر بەکەرکووک بووە.

مـەڵبـەندی خوێندەواری لە نیـوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم لە کۆیە حوجرەی مـزگەوت و قوتابخانەی تازەی دەوڵەتی عـوسمـانی بوو. لە ساڵی ١٨٨٥ یەکەمین قوتابخانەی میری لە کۆیە کرایەوە، زمانی فێرکردنی تورکی بوو. هەرچەندە ئەم قـوتابـخـانەیە دەوری گرنگی هەبوو لە پێگەیاندنی خەڵکی ئەو سەردەمە لە ڕووی خوێندەواری و ڕۆشنبیری گشتییەوە، بەڵام لە ڕووی شیـعر و ئەدەبەوە کاری حوجرەی مزگەوت گرنگتر بوو بۆ پێگەیاندنی ئەو خوێندەوارانەی بایەخیـان بەشیـعر و ئەدەب دەدا. بێ گومـان شاری کۆیە وەکو شارەکـانی دیکەی هەمـوو کوردستان خەڵکی خوێندەوار لە حوجرەی مزگەوتدا پێ دەگەیەنرا. زۆربەی ئەو خوێندەوارانە مەلا بوون. لە کۆیە مەلای چاک و بەناوبانگ هەڵکەوتبوون. هەندێکیان سیـفـەتی مـەلا و مـیـرزایان هەبوو، جگـە لە زمـانی کـوردی شـارەزای زمـانەکـانی عـەرەبی و فارسی و تورکی عـوسمانی بوون.



دەسـەڵاتی عـوسـمـانی لە کـۆیە تا دوا ڕۆژانی جـەنگی یەکـەمی گـێـتی خـایاند، لە دوا مانگی ساڵی ١٩١٨ فەرمانڕەوای سیاسی ئینگلیز دەبلیوو. ئار. های وەک داگیرکەرێک هاتە ناو شاری کۆیە.

## شاعیرانی کۆیە

ڕینیسـانسی شیـعری کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم لە سلێمانی لەسەر دەستی نالی لە دایک بـوو. لە نیــوەی دووەمی سـەدەی نۆزدەم لە ناوچەکـانی دیکەی باشـووری کـوردسـتـان بڵاو بووەوە. لێـرەدا بەڕاسـتـی دەتوانرێ شـاری کـۆیە بکرێ بەنوێنەری ئەم بزووتنەوەیە لە ناوچەی سۆران. ئەگەر بەدرێژایی مێژوو هەولێر و ڕواندز و هەریر نێوەند و پایتـەخـتی ناوچەی سـۆران بووبن لە ڕووی سـیـاسی و بەڕێوەبردنەوە کـۆیە نێـوەند و پایتـەختی بزووتنەوەی ئەدەبی کـوردی بووە. لە مـاوەی نیـوەی دووەمی سـەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم کۆیە کۆمەڵێک شاعیری گەورەی پێ گەیاند. ئەمانە دەورێکی باڵایان هەبوو لە پێشـخستن و دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی کوردی. سەردەستەی شاعیـرانی کۆیە حاجی قادری کۆیی بوو، لەبەر ئەوە لەم کتێبەدا بەشێکی تایبەتی بۆ تەرخان کراوە.

لەم ماوەیەدا باس لە شاعیرانی دیکەی کۆیە دەکرێ.

# کەیفی

**١٨٨٣-١٨١٤**

## ژیانی شاعیر

کەیفی ناوی فەتحوڵڵایە، بەکەیفی جوانرۆیی ناوبانگی دەرکردووە. زانیاری لە بابەت ژیانییەوە زۆر کەمە. لە بارەی جێگەی لە دایکبوون و ژیانی بەرایی شاعیرەوە حاجی قادری کۆیی دەڵێ:

لە کوێرە دێیێ کە کەیفی تیا بی فیردەوسە
جەهەننەمە کە نەما (کەیفی) شاری قوستەنتین

ناوی «کوێرەدێ» لێرەدا دوو مانا هەڵدەگرێ، یەکەمیان ئەو گوندەی کەیفی تێیدا لە دایک بووە و ژیاوە ناوی «کوێرەدێ» بووە، دووەمیان گوندێکی بچووک و کاول و بێ بایەخ.

کەیفی لە ساڵی ١٨١٤ لەو گوندەی ناوچەی جوانرۆ لە دایک بووە. لەبەر هەر هۆیێک بێ یا وەک فەقێیێک مەڵبەندی خێزانی خۆی و باب و باپیرانی بەجێهێشتووە و لە کۆیە نیشتەجێ بووە، ئەو کاتە لە تەمەنی مێردمنداڵیدا بووە.

بەپێی ئەو زانیارییانەی حاجی قادری کۆیی دەریدەبڕێ دەبێ کەیفی لە شارەزوور لە دایک بووبێ، لەبەر ئەوە بەشارەزووریش ناوبانگی دەرکردووە. لەوانەیە ڕاستییەکە ئەوە بێ کەیفی خەڵکی جوانرۆ بێ، قۆناغی یەکەمی کۆچکردنەکەی شارەزوور بووە، لەوێوە لە دەوروبەری ساڵی ١٨٦٣ ڕووی کردۆتە کۆیە. وەکو هەموو فەقێیێکی بێگانە بووە بەمیوانی مزگەوت بەمەبەسی زیندەگانی و تەواوکردنی خوێندنی حوجرە.

کەیفی لە لای مەلا عەبدوڵڵای جەلی خوێندوویەتی. لەودەمەدا کۆمەڵێک لە مەلا و فەقێیانی مزگەوت دەمیان لە شیعر دەدا. شیعر شیعرێن و شەڕە شیعریان دەکرد. وا ڕێک دەکەوێ شێخ ڕەزا ماوەیێک لە کۆیە دەژی بەمەبەسی خوێندن و میوانی شێخ غەفوری مامی دەبێ. لەسەر شیعر وتن ناخۆشی دەکەوێتە نێوان کەیفی و شێخ ڕەزا و ئەو کەسانەی دەم لە شیعر دەدەن. ئەنجامی ئەم مەسەلەیە دەگاتە ئەوەی کەیفی ڕیسوا بێ و هیچی بۆ نەمێنێتەوە تەنیا ئەوە نەبێ لە ساڵی ١٨٦٩ کۆیە بەجێ بێڵێ هەتا هەتایە، بەڕێگەی هەولێر و مووسڵ و حەڵەب ڕوو بکاتە ئەستەمووڵ. لەوێ لەگەڵ حاجی قادر



جارێکی تر دەست لە ملی یەکتری دەکەنەوە. دەڵێن کەیفی لە ئەستەمووڵ پێوەندی لەگەڵ باڵیۆزخانەی فەرەنسا بووە و شارەزایی لە زمانی فەرەنسی پەیدا کردووە.

وا دەگێڕنەوە کەیفی تەنیا هۆنەرەوەی شیعر نەبووە، بەڵکو دەس ڕەنگین و وەستای کۆڵین (زەنگوگراف و لیتوگراف) و دارتاشین و مۆزاییک و گرافیک و خەت خۆشیش بووە.

کەیفی لە ساڵی ١٨٨٣ لە ئەستەمووڵ کۆچی دوایی کردووە. تا ئێستا گۆڕی پیرۆزی نەدۆزراوەتەوە.

## ناخۆشی نێوان کەیفی و شێخ ڕەزا

کۆمەڵێک شاعیر لە دەوری مزگەوتی گەورەی کۆیە کۆبووبوونەوە، ئەم مزگەوتە نێوەندێکی گرنگی خوێندەواری و ڕۆشنبیری بوو لەو ڕۆژگارەدا. گۆشەیێکی شیعری لەو کاتەدا لە ناوەوە بوو، فەقێیانی مزگەوت لە شێخ ڕەزا بەولاوە هیچ یەکێکیان لە پلەی کەیفی نەبوو، لەبەر ئەوە شێخ ڕەزا بەسەر هەموو ئەو شاعیرە پێگەیشتووانەدا زاڵ بوو.

شیعر شیعرێن یا شەڕە شیعر جموجۆڵی یەکەمی ئەم کۆمەڵە خوێندەوارانە بوو. وا دەردەکەوێ گەلێ جار ئەم دوو شاعیرە کەیفی و شێخ ڕەزا بەرامبەر بەیەکتری خەریکی شەڕە شیعر بووبن. لە پێشانا بەهێمنی و لەسەرخۆ و ئاشتییانە بەشیعر وەرامی یەکترییان داوەتەوە، بەڵام لە دواییدا دەمیان لە یەکتری کراوەتەوە. لەبەر ئەوەی شاعیریەتی کەیفی لە هی شێخ ڕەزا کەمتر نەبووە هەرگیز لە هەموو هەڵوێستێکدا نەیتوانیوە بەرامبەر بەکەیفی بوەستێ، بەپێچەوانە زۆر جار کەیفی پشتی شێخ ڕەزای بەئەرز داداوە. ئەم حاڵەتە دەماری چینایەتی شێخ ڕەزای بزواندووە و پێی ئاستەم بووە یەکێکی کەس نەناسی کەلاش خواری وەکو کەیفی لە ڕووی ڕابوەستێ، هەروەها بەبێ هیچ هۆیێک ئەو دەمارە لە لای مەلا عەبدوڵڵای جەلی مامۆستای کەیفی و چڵکاوخۆرەکانی بزواندووە بەتایبەتی لە ناو کۆمەڵی فەقێیانی ناو مزگەوت، تا مەسەلە گەیشتۆتە ئەوەی هەندێ لە فەقێکان وێنەی زۆر ناشیرین لەسەر دیوارەکاندا بۆ کەیفی بکێشن وەکو ئەوەی کەر و ئاژەڵی دیکە سواری بوون. بۆ کۆتایی هێنان بەم کارە نارەوایە مەلا عەبدوڵڵای جەلی بێ بەزەییانە تەنیا بەوە ڕازی نابێ بەجنێو کەیفی ڕیسوا بکا بەڵکو بەلێدان لە مزگەوت دەریدەکا. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کەیفی کۆیە بەجێ بێڵێ و بچێتە هەولێر و لەوێوە ڕوو بکاتە ئەستەمووڵ.

ڕەشید ئاغای بەکر ئاغای حەوێزی هاوڕێی کەیفی دەبێ، نامەیێکی بۆ دەنووسێ و تکای لێ دەکا بگەڕێتەوە کۆیە. کەیفی بەشیعرێک وەرامی دەداتەوە. تێکستی ئەو شیعرە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا تۆمار دەکرێ.

## شیعری کەیفی

شیعری کەیفی لە ڕووی ڕوخسارەوە لە دەستوورەکانی شیعری عەرووزی نەچۆتە دەرەوە. یەکێتی کێش و قافیە مەرجی سەرەکی شیعرەکانییەتی. لە ڕووی ناوەڕۆکەوە تازەیە، ڕاستە لە شیعری دڵداریدا بەرهەمی دەچێتە ناو هەموو شیعری کلاسیکی لەم بابەتەی ئەدەبی کوردی کە سیفەتی لاسایی دەدرێتێ، بەڵام لە داشۆرینەکان و وەسفی دەروونی پڕ لە نائومێدی و دڵ شکاوییەکانیدا شاعیرێکە ئەم لایەنەی شیعری کوردی پڕ کردۆتەوە، بەڵام داخی گران لە هەندێ مەبەس شیعری ون بووە و هیچ نموونەیێک لە ناوەوە نییە، لە هەندێکی دیکە بەرهەمی زۆر کەمە و تێنوویەتی شیعر دۆستان ناشکێنێ.

شاعیرێکی وەکو کەیفی بتوانێ بەشیعر بەرهەڵستی شێخ ڕەزا بکا و لە ڕووی ڕابوەستێ دەبێ ئەو شیعرانەی لە پلەیێکی ئیستێتیکی بەرز بووبن!

## نموونەی شیعری کەیفی

– ١ –

کەیفی کە ڕوو دەکاتە وڵاتی ئاوارەیی و لە ئەستەموولّ نیشتەجێ دەبێ ڕەشید ئاغای بەکر ئاغای حەوێزی دۆستی کەیفی نامەیێکی شیعری بۆ دەنووسێ، تکای لێ دەکا بگەڕێتەوە کۆیە. کەیفی بەم شیعرە وەرامی دەداتەوە:

ئەی نووحی نەجاتم لە دەسی چەرخی جەفاکار
وەی ڕووح و سەر و ماڵی منت جوملە بەنیسار
با خاکی بەری پێت بێ دڵی زار و نەزارم
با فەرشی سەری ڕێت بێ گوڵ و گوڵشەن و گوڵزار
لەو ساوە بەنەی خامەی غەزەل نووسی چی شیرین
شەککەر شکەنیت کردووە وەک تووتی بەمینقار
ڕەشمەی قەڵەمت موشکی لەسەر نامەفشان کرد
هەم نامەو و هەم خامە هەم ئەشعار و هەم ئیشعار



فیلجوملە کە نووسیوتە لە بۆ نایەوە کۆیە
چۆن بێمەوە ئێستەش کە لەسەرمایە شەڕی پار
ئێستەش وەکو مورغێ کە زەدەی چنگی هەڵۆ بێ
بێ هۆشم و ئوفتادە پەریشان و نگوونسار
بێ غیرەت و بێ عارم ئەگەر بێمەوە کۆیە
وەک پەیکەری پێ ڕووت و وەکو سەر ڕەشی موختار
ئیمان و دڵم وا بەدەسی دلبەرێ دابوو
نەیدابوو وەها حاجی ڕەشک دینی بەدینار
من خەستە تەن و جەستە شکەستەی غەمی ئەو بووم
ئەو بوو بەدەوا و مەرهەمی بێگانە و ئەغیار
خۆت واقیفی ئەسراری کە چۆن ئاخری کاریش
بێ حورمەتی کردم بەقسەی موفسید و بەدکار
چۆن هەیبەتی بردم لە حوزووری حەزەراتی
چۆن هەیئەتی کردم بەسەر و سووڕەتی دیوار
هەرچەندە جەفای دام و سەفام لێ نەدی ئەمما
شاهانە دەکەم مەدح و سەنای چاکی بەئەشعار
دایم لە خەراباتی حوزووری حەزەراتم
ئەم ماوە لەبەر تاعەتی تەن تاقەتی دیدار
هەڵناغەڵەتێ (کەیفی) لەمەولا بەفریبیت
با بەس بێ وەفای ئێوە و با بەس بێ جەفای یار

ئەم شیعرەی کەیفی ئاه و هەناسەیێکی ئاگرینە لە دڵ و دەروون و هەناوێکی پڕ لە زوغاڵەوە وەک بورکان تەقیوەتەوە. دڵێکی ناسکی قانگدراو بەهەوای شیعرایەتی و گیانی سۆفیزم چۆن بەرگەی دار و حەیزەرانی شەریعەتمەدارانی دڵ ڕەق هەڵدەگرێ. دیارە ڕەشید ئاغا کەیفی خۆشویستووە بۆیە تکای لێ کردووە بگەڕێتەوە کۆیە، بەڵام کارەساتەکە لەوە گەورەتر بووە کەیفی بەقسەی ئەو هەواڵە دڵسۆزەی بکا.

- ٢ -

لە غـەزەلێکی کـەیفی وەسـفی یار دەکـا ، لە برۆ و برژانگی چاوەوە دەست پێ دەکـا تا زولف و لێـو و دەم. ئەوجـا لە کـەمـەرەوە بەرەو خوار دەبێـتـەوە تا ئەندامی مـێـیینەی ئەو پەرییە زەمینییەی کردوویەتییە بووکی شیعری دڵداری مەجازی:

ئەم دڵ ڕەشـە بێ ڕەحـمـە فـەڕەنگێکی تەواوە
ڕەش قـەلبی ڕەشـە فـیـتنە بەچاو ناوی نراوە
قـەوسی بەسـوپەر کـردووە گـرتوویە بەدەسـتی
سەد خەنجەری خوێنڕێژ و دوو سەد تیری سواوە
زنجـیـری عـەدالەت نـیـیـە ئەم زاڵـمـە زولفـە
هەرچەند بنی بەندە بەڕووی عـەرشی خـوداوە
دایناوە لەسەر مەسحەفی ڕووی داوی سیاهی
لەم وەجـهـە بەدەست کـفـرەوە ئیـمـانمی داوە
ڕەمزی دەمە ئەم نوقتە لەسەر شانەیی هەنگوین
نەقشی قـەدەمی مـێـشـە کـە نیـوێکی نەماوە
خـەتتی نەزەرت گـرتیـە ڕشـتەی کـەمـەرت بۆچ
لەم کـێـوە کـە وەک زیوە بەحـەسرەت بەسراوە
ژێری کــەمــەری باسی بکەم باری گــوناهە
(کـەیفی) لە بن ئەم باری گـوناهە ملی ناوە

ئەم غەزەلەی کەیفی وەک زۆربەی غەزەل و قەسیدەی کلاسیکی کوردی یەکێتی دێرە شیعری پێوە دیارە، واتە دەتوانرێ هەر دێرە شیعرێکی ئەم غەزەلە بەتاکێکی (فەردێکی) سەربەخۆ بژمێررێ.

- ٣ -

لە غەزەلێکی دیکەیدا کەیفی سەما بەوشە و ڕستەی ڕەوانبێژی دەکا. ئاواز و ڕیتمی مەبەسە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانیویەتی مۆسیقا لەگەڵ ناوەڕۆک بگونجێنێ. کۆمەڵێک وێنەی جـوانی لەمـلا و لەولا هێناوە کـەچی سـەرنجی خـوێنەر زیاتر بۆ ئاواز و ڕیتم ڕادەکێشێ:



کـافـرە مـەسـتـە چاوەکـەی غـارەتی دین و دلبـەرە
پەرچەم و زولفە خاوەکەی بینی لە میسک و عەنبەرە
زولفی سـیـاهی وەک زرە تـاکـو دەگـاتە کـەمـبـەرە
شکەن شکەن گـرە گـرە حـەلقـە و چین و چەمـبـەرە
لە چینی زولفی تابە تا خـوتەن خـوتەن خـەتا خـەتا
لە پێـچی پەرچەمی هەتا نەزەر دەچی مـوعـەتتـەرە
ڕوومـەتی ماهی نەوشەبی خـەتی غـەریبی سـەرلەبی
مەتلەعی چاهی غـەبغـەبی خدر سەر ئابی کـەوسەرە
قــەدی بەڵا و ئافــەتە قــامــەتە یا قــیــامــەتە
نازکـەری نەزاکـەتە ئافـەتی سـەر ڕووی کـیـشـوەرە
(کـەیفی) لەبەر گـرینی تۆ کـوڵـکنە مـەنزڵی دڵی
سـینە لەبەر گـرینی تۆ کـون کـونە مـیـسلی پەنجـەرە

ئەم بڕە شیعرە کەمانەی کەیفی مایەی شاعیرێکی گەورەیە ، کەسێکی وەک ئەو شەست و حەوت ساڵ ژیا بێ دەبێ دیوانێکی گەورەی لە پاش بەجێـما بێ. داخی گران زۆربەی بەرهەمی شیعری شاعیرێکی مەزنی وەک کەیفی لەناوچووە.

***

شـاعـیـرێکی بەدیمەنی وەک کـەیفی لە نیـوەی دووەمی سـەدەی نۆزدەم ژیاوە. لە ناوچەی جوانڕۆ لە دایک بووە ، ژیانی بەرایی لە شارەزوور بردۆتە سەر ، ئینجا لە کۆیە نیشتۆتەوە ، ئەو کۆمەڵە نالەبارەی حاجی قادری ئاوارە کرد ، هەر ئەو ڕژێمە دەرەبەگییە بوو کەیفیشی لە کۆیە دەرکرد. سلێمانیش لەم کارەساتە ڕزگاری نەبوو. کەیفی کە گەیشتە ئەستەموول نالی و حـاجی هەردووکـیـان لەوێ بوون. بێ گـومـان حـاجی نالی و کـەیفی بەیەکـتـری ناساندووە. چارەنووسی ئەم سێ فرزەندەی کورد ئەمە بوو. گۆڕیشیان دیار نییە.

# جەلی

**١٨٣٤ – ١٩٠٨**

## ژیانی جەلی

شاعیری ئەم ماوەیە عەبدوڵڵا کوڕی مەلا ئەسعەدی جەلی زادەیە، لە ساڵی ١٨٣٤ لە کۆیە لە دایک بووە. سەرەتای خوێندنی حوجرەی مزگەوتی لە لای باوکی بووە. لە قۆناغی فەقێیەتیدا هاوڕێی حاجی قادری کۆیی بووە. پێکەوە ڕوویان کردۆتە ناوچەی باڵەکیان و لە گوندی شێخ وەتمان لە حوجرەی مەلا محەمەدی کاک عەبدوڵڵا خوێندوویانە. عەبدوڵڵای جەلی زادە لەو ماوەیەدا دڵی دەچێتە حەلیمەی کیژی مەلا محەمەدی مامۆستای. ئەو کچە جوان بووە و گۆیا دەستی شیعریشی بووە، بەڵام هیچ شیعرێکی نەماوەتەوە. لەوانەیە هەردووکیان شیعریان بۆ دڵدارییەکەیان هۆنیبێتەوە، جەلی زادە لە چوارینێکیدا لەم بابەتەوە دەڵێ:

کە بیرێ هاتە ناو مێگەل سەراسەر قرمزی پۆشی
مەلا ئیدراکی چوو، شێخیش تەریق، عارف نەما هۆشی
حەبیب دیتی ڕەقیب وەستاوە چارۆکەی بە ڕوو دادا
گوتم هەوری سیاهات شەعشەعەی خورشیدی داپۆشی

باوکی شاعیر کە بەم دڵدارییەی زانیوە بەوە ڕازی نەبووە عەبدوڵڵای کوڕی ئەو کچە بخوازێ. ئەم مەسەلەیە کارەساتی لێ دەکەوێتەوە، بەنەخۆشی سیل کۆتایی بەژیانی حەلیمە دێ.

جەلی لە ساڵی ١٨٧١ لەگەڵ باوکی حەجی کردووە لە ماوەی جێبەجێکردنی شەعایری حەج مەلا ئەسعەدی باوکی کۆچی دوایی کردووە و لە وڵاتی حیجاز بەخاک سپێرراوە، ئیتر خۆی گەڕاوەتەوە کۆیە و بووە بەجێنشینی باوکی.

جەلی پێوەندی و ناسیاوی لەگەڵ مەلا و شێخانی دەروێشی ئەو سەردەمەدا بووە هی وەکو شێخ عومەری بیارەی نەقشبەندی و کاک ئەحمەدی شێخی قادری و مفتی زەهاوی و هی دیکە.

مەلا عەبدوڵڵا «جەلی» هەڵبژاردووە وەک نازناوی شیعری، ئەمەی لە لەقەبی بنەماڵە «جەلی زادە»وە وەرگرتووە.



## شیعری جەلی

جەلی شیعری نەکردووە بەپیشە، لەبەر ئەوە شیعری کەمە، شیعری لە موناسەبە وتووە، لەگەڵ ئەوەشدا گومان لەوەدا نییە ئەو بەرهەمەی لە بەردەستدایە هەموو شیعری ئەم شاعیرەمان نییە و بەشێکی لەناوچووە.

لە گەشتێکیدا لە بەغدا جەلی ناسیاوی لەگەڵ شێخ عومەری بیارەی نەقشبەندی پەیدا کردووە، لە دوای ئەوەی هەر کەسە گەڕاوەتەوە جێی خۆی شێخ عومەر نامەیێکی شیعری بۆ جەلی نووسیوە بەدەستی مەلا عەبدولسەمەدی گۆجی خەڵکی شیواشان ڕەوانەی کۆیەی کردووە، لە نامەکەدا دەڵێ:

دەمێکە کاغەزت نایێتە لامان
عەجەب سستی لە پەیغام و سەلامان
جەلی دایم دەبێ جیلوەی دیار بێ
لە نێو گێژاوی شەت بێ یا کەنار بێ
عومەر عومرێکە بۆ تۆ ئینتیزارە
لە شەوقی تۆ وەکو ئاو بێ قەرارە

شاعیری ئەم ماوەیەمان جەلی بەم شیعرە وەرامی دەداتەوە:

ئەمرنامەت بەدۆستی گۆجی موخلیس
گەیشتە دەستی سستی عەبدی موفلیس
لە پاش بۆ سیدەن بوبیدەنی تام
نیامە سەر سەر و چاوم بەئیکرام
نیگاهم کرد هەموو لوتف و عیتاب بوو
بەهەم ئامێزەشی قشرولوباب بوو
سەلامی من چییە بۆ تۆ بنێرم
ئەتۆی عەزب و فورات من تاڵ و سوێرم
جەلی ئیسمم خەفی ڕەسمم دوو ڕەنگی
میسالی مەسئەلەی کافوور و زەنگی
سوهای بێ چارە قوربان چۆن دیارە
کە وەعدەی شەعشەعەی شەمسوننەهارە

عومەر عومرێکە گەر مەیلی بەلامە
ئەدی بۆ مەرکەزی دەرد و بەڵامە
حەیاتی من لە دووری تۆ مەماتە
عەجایەب نیسبەتێک و ئیرتیباتە
هەموو عومرم بەپاییز چوو لە هیجران
بەهارم هیچ نەدی بۆ گەشت و سەیران
بەقوربان شارەزووری چۆن ببینم
زەڕ و زوورم نییە شاقاو هەڵێنم
لەباتی کێوی هەورامانی پڕ نوور
لە ژێر کێوی غەمان کەوتووم وەکو موور
ئەگەر لوتفت هەبێ پێ ڕادەکێشم
لە قافڵەی مەتڵەبا هەردەم لە پێشم
لەوێ ڕۆژێ کە تۆم دیوە لە بەغدا
ملم داوە بەحەق وەڵڵا بەبیللا
لە بۆ بەعزێکی زۆر نادانی بێ فام
لە جێیێ بەشەقی دام و لەقی دام
ئیجازە و خیرقە و تاجی موسەڵلا
بسێنم بۆ ڕەواجی کاری دنیا
فرە خاسە گەلێ چاکە بەجێیە
وەلێ گەر حەز بکەی ئێرەش ئەوێیە
لە لای تۆ دەرحەقم بێ ئیلتیفاتی
نییە پەروات بەئیستیحقاقی زاتی
لەبەر شێخان ئەگەرچی دبن بڕاوە
بەتیغی تۆ زمانی من بڕاوە
وەلێ بۆ خاتری تۆ بەندەیانم
زمان دەگرم لە حەقیان تا بتوانم
لە پاشی تۆ خودا بۆ خۆی عەلیمە
لە کەرکووکیش دوعاگۆیی عەلیمە



ئەم شیعرەی جەلی لەسەر شێوەی جووت قافیە (مەسنەوی) هۆنراوەتەوە، بەزۆری نامەی شیعری لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا ئەم جۆرە قافیەی بۆ بەکارهێنراوە.

ئەوەی لەم شیعرەدا سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە ئەتیکێت لە هەڵوێستی بەراوردکردن و موجامەلەدا ئەوە دەخوازێ پیاو ئەوەی بەرامبەری بەگەورە بزانێ و خۆی بەبچووک. لەبەر ئەوە جەلی ئەمەی لەگەڵ شێخ عومەری بیارە کردووە. لە کۆتایی شیعرەکەدا ئەوەی لە بیر نەچووە یادی شێخ عەلی تاڵەبانی برای شێخ ڕەزا بکاتەوە، بەمە جەلی ویستوویەتی بڵێ، هەرچەندە دڵسۆزی شێخ عومەری بیارەیە و لە ڕووی تەریقەتیشەوە نەقشبەندییە، بەڵام سۆزی بۆ شێخ عەلی تاڵەبانیش هەیە کە شێخی تەریقەتی قادرییە.

شانازیکردن بەخۆ سیفەتی زۆربەی شاعیرانی ڕۆژگارانی کلاسیکی بووە. لەوانەیە جەلی هەستی بەوە کردبێ لە ڕووی شاعیرییەوە مافی خۆی نەدرابێتێ، واتە وەک شاعیرێک لە ناو خەڵکیدا ناوبانگی دەرنەکردبێ، لەم لایەنەوە دەڵێ:

دەفتەری ئەهلی هونەر بگرن ئەگەر لەم عەسرەدا
ماڵی بێ ئیقبال نەبێ وەڵڵا (جەلی) سەر دەفتەرە

ئەمە نارەزایی هەموو شاعیرێکە، یا هەموو ڕۆشنبیرێکە بەرهەمی ئەدەبی و هونەری هەرچی بێ کە بەچاوی خۆی تەماشا نەکرێ دەبێتە گرێ لێی و ناچار دەکەوێتە ستایشی خۆی، بەڵام هەر چۆنێ بێ ئەو ستایشە ڕەوایە ئەگەر ماکی داهێنانی ئیستێتیکی تێدا بێ.

پەیدابوونی بیری کوردایەتی بەشێوەییێکی تازە لە دوا ساڵانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم کاری کردبووە سەر خوێندەوارانی ئەو سەردەمانە کە زۆربەیان مەلا بوون. جەلی یەکێک بووە لەو مەلایانەی هەستی کوردایەتییان لە لا دروست بووە. بۆ دەربڕینی هەڵوێستی خۆی لەوانەیە بەئانقەست شیعرێکی بەزمانی فارسی دانابێ بۆ ئەوەی لەو زمانە لابدا و بێتە سەر زمانی کوردی، لەم لایەنەوە دەڵێ:

با بکەم تەبدیلی نەزم و قافیە و ڕەویە و عەرووز
بەم زمانە هیچی تر شیعرم لە بۆ هەڵناستێ
بیکەمە کوردی زمانی خۆمە چاکی تێدەگەم
خوایە تۆفیقم بدەی من بەندە تۆ مەولاستی

بۆ ئەم شاعیرەمان بێژتنی شیعر بەزمانی فارسی ئاسانتر بووە، لەبەر ئەوە هەندێ جار

که شیعرێکی فارسی بۆ هاتووه له ناوەڕاستی شیعرەکەدا لایداوه و کردوویەتی بەکوردی، بۆ ئەوەی گیانی کوردایەتییەکەی خۆی بخاته ڕوو. لەم لایەنەوه له موناجاتێکی فارسیدا بەم دێره کوردییانه کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

یا سەییدەڕڕوسول چ غەریبە حیکایەتم
یا هادیەسسوبول چ عەجیبە شیکایەتم
ئیدبار و ڕوو سیاه و فەقیر و قەلەندەرم
بێ فیکر و زیکر و هۆش و قەلیلولبیزاعەتم
بیللاهی دل فگارم و مەبەررام له خەلقی چاک
تەڵڵاهی شەرمەزار و مەعەرری له تاعەتم
بۆ مەدحی ئەهلی فەقر زمان لال و ئەبکەمم
وەقتی سەنای ئەهلی غینا پڕ فەساحەتم

***

سەد جار سەگێکی پیس و گروو بم هەزار شوکور
چونکه سەگی محەمەد و ئەسحاب و عەشرەتم
ووس به (جەلی) حەددی تووه ئەم شیکایەته
بۆ خۆی دەزانێ حاڵ و حیکایەتم

بێ گومان ئەم کارەی شاعیر، بەکارهێنانی دوو زمان له غەزەلێک یا قەسیدەییێکدا سەرەتای ئەو بیرۆکەیە بووه جەلی یا هەر شاعیرێکی دیکه واز له زمانه بێگانەکه بهێنێ و بەزمانی دایکی خۆی شیعر بلێ.

***

مەلا عەبدوڵڵای جەلی بەشداری له بزووتنەوەی شیعری ناوچەی کۆیەی کردووه. جێ پەنجەی تا پلەییێک دیاره. گێتی شەریعەتی ئایینی ئیسلام بەسەر لایەنی دیکەی ڕۆشنبیری شاعیر زاڵ بووه، دانانی شیعری نەکردووه بەپیشه، لەبەر ئەوه شیعری کەمه، بەڵام چێژ دەداته خوێنەری کورد.

# ئەختەر

## ١٨٣٩ – ١٨٨٨

### ژیانی ئەختەر

ئەختەر بەمانای ئەستێرە نازناوی ئەمین ئاغای کوڕی بەکر ئاغای کوڕی محەممەد ئاغای حەوێزییە. لە ساڵی ١٨٣٩ لە گەڕەکی بەفری قەندی لە کۆیە لە دایک بووە.

سەرەتای خوێندنی ئەختەر لە یەکێ لە حوجرەکانی مزگەوتی گەورەی کۆیە بووە. لە تەمەنی مێردمنداڵی وانەی فارسی لای مەلا سمایل مەنتک خوێندووە، ماوەیێکیش لەگەڵ ئەسعەد ئاغای حەوێزی برای لە بەغدا هەردووکیان بەردەوام دەبن لەسەر خوێندن. لە پاشانا لە تەمەنی پازدە ساڵیدا ناچار دەبێ دەست لە خوێندن هەڵبگرێ بەهۆی مردنی باوکییەوە و لە جێی ئەو دادەنیشێ. بەم جۆرە دەبێتە سەرۆکی بنەماڵەی حەوێزییان و دیوەخانەی تایبەتی وەک نێوەندێکی ئەدەبی لەو ڕۆژگارەدا خۆی دەنواند. مەڵبەند و جێی کۆڕ و کۆبوونەوەی شاعیرانی ئەو سەردەمە بوو، بەتایبەتی حاجی و کەیفی و شێخ ڕەزا میوانی بەرێزی ئەو دیوەخانەیە بوون و جێگەی دیارییان تێیدا هەبوو.

ئەختەر وەک ئاغاییێکی بەدیمەن و دەوڵەمەند لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا ئوروستوکراتیانە نەبووە، بەزەیی بەهەژارانا هاتۆتەوە، دەستی گرتوون و یارمەتی داون. ئەختەر خاوەنی قسەی خۆی بووە، بەرهەڵستی خراپەی داگیرکەری عوسمانی کردووە، تا گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی هەجووی سوڵتانی عوسمانی بکا. لەسەر ئەمە والی عوسمانی تەقیەدین پاشا ئەختەری ئاوارەی شاری حیللەی باشووری عێراقی کردووە. لە دوای ماوەیێک کە نامیق پاشا بووە بەوالی ئەختەری لە ئاوارەیی ئازاد کردووە و گەڕاوەتەوە کۆیە.

لە ژیانی تایبەتی خۆیدا ئەختەر دڵداری کردووە، دڵی چۆتە کچێکی جوانی بنەماڵەی دارۆغە ناوی ڕابی بووە. ئەم دڵدارییە پاک و بێ گەردە زیندەبەچاڵ دەکرێ بەبەهانەی ئەوەی ئەختەر و ڕابی بەمنداڵی شیریان پێکەوە خواردووە.

ئەختەر تەنیا شاعیر نەبووە، بەڵکو هونەروەرێکی ڕەسەنی مۆسیقا و گۆرانی بووە، ئاوازی بۆ هەندێ شیعری کوردی داناوە، جگە لەوەی شیعری خۆی کە دەکەوتە بەر دەنگی گۆرانیبێژان ئاوازەکانیان لە لایەن شاعیرەوە دادەنران، هەروەها هەندێ جار بۆ ئاوازێکی دیاریکراو شیعری هۆنیوەتەوە، بایەخی بەگۆرانی و سروودی میللی (فۆلکلۆری) داوە.



دیوەخانەی مەڵبەندێکی ئەدەب و هونەر بووە. بەگشتی ئەختەر دەورێکی گرنگی بووە لە ژیانی خوێندەواری کۆمەڵی کۆیە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم.

ئەختەر لە ساڵی ١٨٨٨ لە کۆیە کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی عارەبیان لە تەنیشت باوکی نێژراوە.

### شیعری ئەختەر

ئەختەر لە هەندێ لە شیعرەکانیدا ناوی ڕاستەقینەی خۆی «ئەمین»ی بەکارهێناوە وەک نازناوی شیعری. بەرهەمی شیعری ئەختەر ئەوەی بۆمان ماوەتەوە زۆر کەمە بۆیە زۆربەی بەحرەکانی عەرووز و قافیەی دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی تیایاندا نابینرێن. پلەی ئیستێتیکی ئەو شیعرانەی لەبەردەستدایە، ئەوە دەگەیەنێ دیوانی شیعری ئەختەر زۆر لەمە زیاتر بووبێ.

بێ گومان ئەختەر سەر بەقوتابخانەی نالییە، بەڵام لەو شاعیرە بەرچاوانەیە داهێنانی هونەری زۆرە لە ناو چوارچێوەی ئەم قوتابخانەیەدا. شیعری ئەختەر لە ڕێکخستنی ڕستە و تەعبیر سفت و ئاسانە. مانای ڕستە و داهێنانی ڕەوانبێژی خۆیان بەچێژی خوێنەر دەناسێنن.

بەگشتی ناوەڕۆکی شیعری ئەختەر لە دوو مەبەسی سەرەکی پێکهاتووە وەسف و دڵداری. ئەم دوو بابەتە بەشێوەیێک تێک ترنجاوون بەهیچ جۆرێ لە یەکتری جیا ناکرێنەوە. شاعیر بەشێوازێکی ڕەوان و بەهەناسەییێکی گازاندە و گلەیی ئامێزەوە وێنەی شیعری دروست دەکا و مانای داهێنراو دەخوڵقێنێ.

### گەشتی گوڵزاری شیعری ئەختەر

– ١ –

لە غەزەلێکیدا ئەختەر دەڵێ:

ڕووحی شیرینم لە بۆچ ئەمڕۆکە وا لوتفت نییە
نووری بینای دیدەکانم پێم بڵێ سووچم چییە
بێ قەباحەت لێم زویری چاکە ئینسافت هەبێ
تاکو ئەمرم خۆ مەحاڵە ڕۆیینم لەم قاپییە
خوێن لە چاوانم خرۆشا وا فووارەی بەستووە
نابێ جارێ بێیتە سەر ئەم حەوز و جۆگە و کانییە

ئاگری عەشقت وەها کوورەی دڵی هێناومە تاو
شێت و شەیدای کردووم ئاگام لە دنیایێ نییە
واعیزێ دوێنێ لەسەر مینبەر وەها وەعزی دەدا
هەر کەسێ یاری نەبێ تەحقیقە عومری فانییە
قازی و موفتی کە دوێنێ نیسحەتی منیان دەکرد
ئیمڕۆ قازی موتریبە و ساقی جەنابی موفتییە
زاهید و سۆفی ئەگەر سەد ساڵی تر تەقوا بکەن
شارەزا نابن وەکو من موشکیلە ئەم وادییە
شێخی سەنعانی ئەگەر دەستی بەدامانت بگا
خەرقە و تەسبیح و تاج و تەیلەسانی بۆچییە
ئەی (ئەمین) بیستوومە ئیمڕۆ یار خەڵاتی کردووی
سا وەرە ئەوجاکە بمرە تۆ لەسەر ئەم خۆشییە

لە سەرەتای ئەم شیعرەدا ئەختەر ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە یاری خۆشەویستی لێی تۆراوە. بێ گومان هیچ هۆیێک لە ناوەوە نەبووە بۆ ئەو تۆرانە. واعیز ئامۆژگاری هەموو کەسێکی کردووە پێویستە یار و دلبەری هەبێ، ئەوەی نەیبێ تەمەنی بەخۆڕایی دەباتە سەر. دڵداری پێویستی هەموو کەسێکە قازی و موفتیش دەگرێتەوە. ئەمانە لە ڕابردوودا ئامۆژگارییان دەکرد خەڵکی لە ئەڤین و دڵداری دوور بکەونەوە کەچی ئەمڕۆ قازی بووە بەگۆرانیبێژ و موفتیش بووە بەمەیگێڕ. لە کۆتایی شیعرەکە دلبەر لەگەڵ شاعیردا ئاشت دەبێتەوە، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی لە خۆشیانا مردنی بۆ خۆی بووێ.

- ٢ -

لە شیعرێکی دیکەیدا شاعیر دەڵێ:

لە سینەی ئیجاد بوو دوو بەی
قوبەی تاجی کاووس و کەی
زینهار نەکەی دەستیان لێ دەی
با بمێنێ بۆ نیشانە

***



لە پەنهان دەستم برد بۆ بەی
ماران گاز بووم ترسام لە حەی
باغەوان بانگ دەکاتە کەی
ئێرە باغی شای مارانە

***

خاڵی ڕەشی سەر ڕوومەتی
حەجەرولئەسوەد خۆیەتی
هەرچی بکا زیارەتی
لە مەرتەبەی شەهیدانە

***

ئاهووەکانی سەحرای خوتەن
ئێرەیان لێ بۆتە مەفتەن
لێیان گەڕێن سڵیان مەکەن
با چارە کەن ئەم دەردانە

شاعیر لەسەر ئاوازێکی لە پێشانا سەما بەوشەکانی ئەم شیعرە دەکا، وێنەکانی شاعیر ئەوە هەڵدەگرن. لە سەرەتادا باسی دوو بەهێ، یا دوو مەمکی یاری دەکا، هەڵبەز و دابەزی مەمکەکان لەسەر ئاواز و ڕیتمی شیعرەکە شایی هەڵدەبەستێ. شاعیر بەدزییەوە دەستییان بۆ دەبا، بەڵام بسکی دلبەر کە شای مارانە لە دەوروبەری سنگ مەمک دەپارێزێ. ئەوجا خاڵی ڕەشی سەر گۆنا بەبەردە ڕەشی کەعبەی دەچوێنێ، ڕەوتی یار لەگەڵ ڕەوت و سرکی مامزەکانی ناوچەی خەتا و خوتەنی چینستان بەراوورد دەکا.

- ٣ -

لە شیعرێکی دیکەیدا ئەختەر یادی کۆمەڵێک شار و ئاوەدانی و ناوچەی جوگرافی دەکاتەوە کە بەجوانی کچ ناوبانگیان دەرکردووە، لە غەزەلەکەیدا دەڵێ:

دەخیلت بم لە عوشاقت مەڕەنجە
دڵ و دینم فیدای ئەم لاو لەنجە
لە دەوری عاریزت کاکۆڵی پرچین
دەڵێی ماری سیای ئێشکچی گەنجە

لە گـورجـسـتـان و چین وەک تۆم نەدیوە
لە مـاچین پشکنیم تا مـوڵکی گـەنجـە
بەهایی خـاڵی هیندووت هیند و نەوبە
فـیـدایی لەنجـەکـەت شـیـراز و تەنجـە
هەتا وەک شیری دایکت لێت حەڵاڵ بێ
خـەناوی کـە بەخـوێنم دەست و پەنجـە
ئەوەندەم خاک بەسەردا کرد لە هیـجرت
زەمین دووی بوو بەتۆز ئێستاکە پێنجە
لە دووری تۆ لە تۆ دوور ڕووحەکەی من
نەسـیبی دڵ بڵاو و دەرد و ڕەنجـە
تەمـاشا کـە سـەراپا مـاهم (ئەختـەر)
هەمـوو عیـشوە و فریب و ناز و غەنجە

شاعیر لەو غەزەلەدا ناوی گورجستان و چین و ماچین و گەنجە و هیندستان و نەوبە و شیراز و تەنجە دەبا. ئەمانە ناوی جێگەی جوگرافی و ئاوەدانین لە نەخشەی ڕۆژهەڵات و ئەفەریقادا. ئەختەر بەچاوی ڕەمز ئەو جێیانەی کردووە بەمەڵبەندی ژنی جوان.

شـاعـیـر پەشـۆکـاوە لە دووری لە دلبـەر، شین و شـەپۆریەتی، لە حـەوت چینەکـەی (تەبەقەکەی) زەوی خۆڵی دوو چینی بەسەری خۆیدا کردووە. لە حەوت چینەکە پێنجیان ماون، ڕەنگە مەبەسی پێنج کۆنتینێنتەکەی وشکایی سەر ڕووی زەوی بێ.

- ٤ -

لە شیعرێکیدا ئەختەر هەرچی ئەندامی جوانی دلبەر هەیە لەگەڵ کردەوەکانی دەکاتە کەرەستە بۆ کوشتنی شاعیر، لە غەزەلەکەدا دەڵێ:
گرفتارم بەسیحری چاوەکانی مەستی فەتتانت
بریندارم بەزەخمی سینە دۆزی تیری موژگانت
بەزولف و پەرچەم و ئەگریجەکانت غارەتت کردم
دڵێکم بوو ئەویشت خستە ناو جاهی زەنەخدانت
تەشەککور واجیبە بۆ من کە من بمرم بەزەخمی تۆ
بەشەرتێک کفنەکەم بدرووی بەتای زولفی پەریشانت



لە کوشتن گەردەنت ئازا دەکەم گەر بێیتە سەر قەبرم
بەڕۆژی جومعە بمنێژن لەگەڵ جەمعی شەهیدانت
جەمیعی عاشقان ئەمڕۆ هەمووی هاتوونە پابۆست
منیش هاتم بفەرمووی بمکوژن بمکەن بەقوربانت
کەسێ تۆ کوشتبێتت ڕۆژی مەحشەر ئەزیەتی نادەن
مەگەر هەروەک لە دنیادا کە سووتا بێ لە هیجرانت
بەوەڵڵا عاشقی (ئەختەر) کە ئیمڕۆ نادیری عەسرە
بەڕەسمی زیندەگی قوربان ئەوا هاتووتە دیوانت

لەم شیعرەدا ئەختەر لە مردن دەدوێ، بکوژ یاری نازدارە، شەهید شاعیرە، نەک تەنیا ئەختەر خۆی بەڵکو هەموو ئەو عاشقانەی شەهیدی ئەو یارەن. شاعیر لە هەموو زۆرداریییێکی دلبەر خۆش دەبێ ئەگەر لە پاش مردن زیارەتی گۆڕی بکا. ئارەزووی شاعیر ئەوەیە بەڕۆژی هەینی پیرۆز لەگەڵ هەموو قوربانییەکانی دیکەی دڵداری بنێژرێ.

- ٥ -

لە غەزەلێکیدا ئەختەر موناجات لەگەڵ یاری نازداری دەکا و دەڵێ:
فیدات بم تا کەی ئەم جەور و جەفایە
بەهیجران گوشتنی عاشق خەتایە
بەلا گەردانی باڵات بم ئەگەرچی
نەسیبی من لەوی دەرد و بەڵایە
مەکەن لۆمەم لە ڕیسوایی ڕەفیقتان
کە عەقڵ و عاشقی لێکتر جودایە
ئەگەر تەقسیر و سووچم عەشقی تۆبە
بەدەستی من نییە کارم کرایە
لە لام قوربان ئەگەر بمرم شەهیدم
لە لای تۆ کوشتنی عاشق غەزایە
هەموو عالەم لە تۆ دڵشاد و حەیفە
بەمیحنەت ڕوح بدا ئەم موبتەلایە
سەر و ماڵم لە تۆ گەر چاو بی چاوم
بڵێ ئەوساکە (ئەختەر) بێ وەفایە

ئەم شیعرە هەمووی وەکو گفتوگۆی شاعیر دەکەوێتە بەرچاو لەگەڵ یاری خۆشەویستی دەکا، کەچی بەڕاستی دیالۆج نییە و مۆنۆلۆجە، واتە موناجاتێکە لە خوارەوە بۆ سەرەوە. شاعیر قسە دەکا، وەرام لە یارەوە نییە. وەکو هەموو موناجاتێکی کە لەگەڵ کردگاردا دەکرێ، قسە تەنیا هی بەندەیە و کردگار نایەتە قسە. لەبەر ئەوەی ئەقڵ و عاشقی دوو شتی پێچەوانەی یەکترین، ئەقڵ عاقڵییە و عاشقی شێتییە، دڵدار هەمیشە تاوانبارە. لێرەدا ئاماژەیێکی نهێنی نادیار هەیە بۆ سۆفیزم وەک بزووتنەوەیێکی بێ سنوور و نالۆجیکی بەرامبەر بەهەموو دەستوور و یاسایێک دەوەستێ.

- ٦ -

لە شیعرێکیدا ئەختەر نالییانە خەیاڵی کردووە:

سەرم گێژ و دڵم بریانە بێ تۆ
لە دووریت پیشەکەم گریانە بێ تۆ
دەخۆم سوێندێ بەقورئانی جەمالت
ریازی جەننەتم زیندانە بێ تۆ
لە لای تۆ بێ منی هاوین بەهارە
لەکن من فەسڵی گوڵ زستانە بێ تۆ
دەروونم لەت لەتە ئاهم شەڕارە
کە ئاوی چاوی من بارانە بێ تۆ
شیفا و زیندەگانیم پێ نەماوە
لە عیشوە نۆشی بن بێگانە بێ تۆ
قەسەم بەو نێرگسی خومماری چاوت
کە (ئەختەر) خواردنی دووخانە بێ تۆ

بەگشتی هەست بەشێوازی نالی دەکرێ لە بەرهەمی شیعری ئەختەردا. بەتایبەتی ئەم غەزەلە لاساییکردنێکی تەواوی شیعرێکی نالییە کە دەڵێ:

نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ
نەچم شەرت بێ هەتا ئەو خوارە بێ تۆ

لێرەدا دیارە ئەختەر لە کێش و قافیە لاسایی نالی کردۆتەوە، جگە لەوە هەوڵیداوە



ئەوەی نالی نەیووتووە، لە ناو ئەم قاڵبەدا ئەو بیڵێ. هەروەها وێنە و لێکسیکۆنی نالیش لەم شیعرەدا دەکەوێتە بەرچاو، بەڵام بەشێوازێکی دیکە ئەختەر دەربڕیوە.

***

شاعیری ئەم ماوەیە ئەختەر یەکێکە لە شاعیرە دیارەکانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم، داهێنانی تازە لە شیعریدا بەدی دەکرێ. شیعری زۆر بووە بەڵام داخی گران کەمی ماوە.

# سانی

## ١٩٠٦ - ...

### ژیانی سانی

کاک عەبدوڵڵا کوڕی کاک عەلی کوڕی کاک عەبدوڵڵا کوڕی کاک مستەفایە. نازناوی شیعری «سانی» بووە، ئەمەی لە وشەی «الثاني» عەرەبی وەرگرتووە. ناوی باپیری عەبدوڵڵا بووە، ئەوی بەعەبدوڵڵای یەکەم داناوە خۆشی بەعەبدوڵڵای دووەم. بەڵام وشە عەرەبییەکەی هەڵبژاردووە بۆ نازناوی (سانی = الثاني).

سەردەمی لە دایکبوونی سانی نەزانراوە، بەڵام دیارە کەسێتی شیعری لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بووە، خوێندنی سەرەتایی لە مەڵبەندی خۆی بووە و هەر بۆ ئەم مەبەسەش ناوچەکانی دیکەی خۆشناوەتی بەسەر کردۆتەوە. پێوەندی و تێکەڵاوی لەگەڵ کۆیە زۆر بووە بەتایبەتی نموونەی بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی قوتابخانەی نالی لە خاکی سۆران لە کۆیە بووە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم. لە ڕووی بەڕێوەبردن و کاروباری میرییەوە مەڵبەندی بنەماڵەی کاکی هیران گوندەکانی هیران و نازەنین سەر بەکۆیە بوون.

سانی کەسێک بووە لە ئەنجامی چێژی شاعیری و ئاواز گیرۆدەی گۆرانی و سروود و مۆسیقا بووە. غەزەلەکانی لەسەر ئاوازی دەف دەنگخۆشەکان چڕیویانە.

شاعیر تەمەنێکی درێژی بردۆتە سەر و لە ساڵی ١٩٠٦ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی بنەماڵە لە گوندی هیران نێژراوە.

### شیعری سانی

ئەو شیعرە کەمەی ئەم شاعیرەمان کە لەبەردەستدایە لە چوارچێوەی قاڵبی غەزەلی دڵداری و وەسف نەچۆتە دەرەوە. شاعیر بایەخێکی زۆری بەڕەوانبێژی داوە، کێشی شیعری ڕەوانە، قافیەی بێ خەوشە، وشەی هەڵبژاردەیە، ڕستە و تەعبیری بێ گرێیە، مانای ئاشکرایە.



### نموونەی شیعری سانی

- ١ -

لە شیعرێکیدا سانی هانا دەباتە بەر مەیگێڕ بۆ ئەوەی لە خراپەی ڕەقیب بیپارێزێ:

دەخـــیل ســـاقی وەرە وەعـــدەی وەفـــاتم
بـدە جـــــامێ بەقـــــوربانی وەفـــــاتم
لەبەر جـــەوری ڕەقـــیب و دەردی دووری
هەمـــیـــشـــە چاوەڕێی مـــەرگـــە حـــەیاتم
هەزار دەفـــعـــە شـــەو و ڕۆژ گـــەر دەرم کـــەی
غـــــولام و بەنـدەیی تـۆم خـــــاکی پـاتم
لە عـــەشـــقی چاوەکـــانی مـــەســـتی لەیلا
وەکـــــو مـــــەجنوون شـــــەیدایی وڵاتم
گـــوتم (ســـانی) هەڵێ بۆ خـــۆت هەڕاکـــە
گـــــــوتی چارەم نـەبـوو هـەرچـەنـد هـەڵاتم

شاعیر لێرەدا باکی بە ڕەقیب نەکەوتووە، ئەگەر یاری نازدار بەقسە دەریشی بکا سانی عەبد و غوڵام و خاکی بەرپێی ئەو یارەیە، وەک مەجنوون سانیش ناگاتە لەیلای خۆی.

- ٢ -

سانی غەزەلێکی حەوت دێری مستەفا بەگی کوردی هەڵبژاردووە، سێ دێر لەو غەزەلەی کردووە بەپێنج خشتەکی، دێری یەکەم و دووەم و کۆتایی، لەوانەیە هەمووی کردبێتە پێنج خشتەکی و ئەوانی دیکە ون بووبن:

بەدڵ ئەفـــغـــان و زاریمە لە چاوان گـــوڵ دەبارێنم
لە هیـجری یاری بێ میـهرم لە جەوری چەرخی پڕ کینم
وەها سـەرگـەشـتـە و مـەحـبـووسی ئەم کـاکـۆڵی پڕ چینم
(ڕەفیـقی کونجی میـحنەت عـاجزن هەر شەو لە ناڵینم
گـورێزانن لەبەر لێـشـاوی بەحـری مـەوجی ئەسـرینم)
فـیـدای لەعلی لەبانت بم جـەفـا لەبیـە حـەمـیـیـەت بێ
هەتا کەی قیـسـمـەتی من لەو قـەدی ڕەعنا ئەزییـەت بێ

بەقوربانی نیگاهت بم لە ڕێگەی خوا مورووەت بێ
(ئەگەر مومکین نەبوو وەسڵم کە من مردم وەسییەت بێ
لەباتی قەوم و خوێشانم لەسەر مەیتم بکا شینم)

***

سەدایی مەقسەدی قەتلە بەئەو موژگانی خوێنینت
تەشەببوس نابەمە بەر کەس بەغەیرەز لێوی شیرینت
سوئالی بێ جەوابە گەر بکەن لەو عەبدی دێرینت
(عەبەس(کوردی)مەلاییێک دێن دەپرسن مەزهەب و دینت
کە قادر خۆی دەزانێ من لەسەر کام مەزهەب و دینم)

ئەم کارەی سانی ئەوە دەگەیەنێ کە هۆگری شیعری مستەفا بەگی کوردی بووە و تەنانەت ئەم غەزەلەشی بەدڵ بووە، بۆیە کردوویەتی بەپێنج خشتەکی، ئەم کارە لە ئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پێڕەو دەکرێ.

- ٣ -

لە غەزەلێکی دیکەیدا سانی دەڵێ:

دڵیشم چوو، گوڵیشم چوو، کە یاری گولعوزارم چوو
نەما عەیشم لەگەڵ خۆشی بەتاراجی نیگارم چوو
بەهارا فەسڵی گوڵ دابێ سەلای بولبول لە هەر لا بێ
گرینم سەمتورە سا بێ کە غونچەی لالەزارم چوو
ئەگەر ئیقلیمی حەوت کیشوەر هەموو گەنج و دوڕڕ و گەوهەر
بەچیم نایێتە پێش مەنزەر کە دوڕڕی شەهسوارم چوو
چ پاشایی چ دەروێشی غەمی عەشقت ئەگەر نۆشی
هەمیشە مەست و مەدهۆشی کە دۆستی غەم گوسارم چوو
زەعیف و زەردی پاییزم لە زستان یار گوتی زیزم
بەتەن بیمار و دڵ ڕێزم کە هاوین هات بەهارم چوو
بەداغی دەردی هیجرانی لە زەبری تیری موژگانی
وەهای کردوومە بریانی بەتەن ڕووحی ڕەوانم چوو
گوتم (سانی) کەوا ئیمڕۆ لەسەر چی وا پەرێشانی
گوتی هات گاوورستانی ئەسیریان کرد و یارم چوو



لەم شیعرە دڵدارییەدا سانی هەموو شتێکی لە دەست چووە چونکە دلبەری لێ دوورە. پاش قافیەی «چوو» بوعدێکی جوانکاری داوەتە شیعرەکە بەتایبەتی لە ڕووی ئاواز و ڕێتمەوە. شاعیر گەلێ شتی لە دەست چووە، دڵ و گوڵ و خۆشی و بەهار و ئاوازی بولبول و خەزێنە و گەورەیی و دەروێشی و هەموو شتێک کە یاری لێ دوورە بەڵام ئەمانە هەموویان بەهیچ ناچن ئەگەر خۆشەویست لە نزیکییەوە بێ.

***

سانی شاعیرێکی ڕەسەن و خاوەن چێژی شیعری بووە، ئاگاداری مێژووی شیعری نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمی نالی و هاوڕێیانی بووە. شارەزای بەرهەمی شاعیرانی سەردەمی ژیانی خۆی بووە. هەر چۆنێ بێ شیعری زیاتر بووە لەوەی ئێستا لەبەردەستدایە.

# نیهانی

**١٨٦٥ - ١٩٣٤**

## ژیانی نیهانی

ناوی ئەم شاعیرە شێخ محیەدین کوڕی شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ ئەحمەدە. لە ساڵی ١٨٦٥ لە شاری کۆیە لە دایک بووە. سەرەتاکانی خوێندنی قورئان و فێربوونی زانستییەکانی ئایینی ئیسلام لە حوجرەی مزگەوتی مەلایان بووە. قۆناغی فەقێیەتی لە مزگەوتی بابیز ئاغا لە کۆیە تەواوی کردووە، مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلا عەباس مامۆستای بووە.

لەودەمەی شێخ محیەدین دەستی بەشیعر نووسین کردووە ناوی «نیهانی» هەڵبژاردووە وەک نازناوی شیعری. هێشتا لە تەمەنی مێردمنداڵی بووە کە لەگەڵ باوکی گەشتی سلێمانییان کردووە بەتایبەتی بۆ بینینی کاک ئەحمەدی شێخ بەمەبەسی وەرگرتنی ئیجازەی دەروێشی تەریقەتی قادری. لە دوای ئەمە نیهانی وەکو هەموو فەقێکانی کوردستان گوند بەگوند گەڕاوە بەمەبەسی کۆتایی هێنان بەخوێندنی زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی. لە پێشانا چووە بۆ گوندی «زێوە»ی ناوچەی خۆشناوەتی لە لای مەلا حوسێنی کەرکووکی خوێندوویەتی، لە پاشانا لەگەڵ مامۆستای خۆی ماڵبەندی ژیانیان دەگوێزنەوە گوندی «قەرەناو»ی ناوچەی شوانی کەرکووک. لە دوای ئەمە ڕووی کردۆتە گوندی «عەزە»ی دەشتی هەولێر و ماوەیێکیش لای مەلا شەریفی ڕەنگەڕێژانی خوێندوویەتی. دوا جار ڕووی کردۆتە شەقڵاوە و لەوێ پێویستییەکانی خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووە.

وەک زانراوە نیهانی لە تەمەنی هەژدە ساڵی ئیجازەی تەریقەتی قادری لە کاک ئەحمەدی شێخ وەرگرتووە، بەڵام پێش کۆچی دوایی باوکی لەسەر دەستی ئەو ئیجازەی تەریقەتی تازە کردۆتەوە. کە باوکی لە ساڵی ١٨٩٦ کۆچی دوایی کردووە نیهانی لە جێی ئەو دانیشتووە و بووە بەڕێبەری تەریقەتی قادری لە تەکیەی شێخ ئەحمەد.

لە ساڵی ١٩٢٢ لەو کاتەی ئینگلیز بەردوومانی کۆیەیان کردووە نیهانی ئەوێی بەجێهێشتووە و چووە بۆ گوندی «هەڵەجە»ی دەشتی هەولێر، لە لای شێخ مەعرووفی برا گەورەی نیشتەجێ بووە، تا ساڵی ١٩٣٤ لەوێ ژیاوە و هەر لەو ساڵەدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی هەڵەجە نێژراوە.



## شیعری نیهانی

نیهانی شیعری کەمە، ئەوەی هەیە هەمووی بەچاپ نەگەیەنراوە، بەشێکی کەمی بڵاو کراوەتەوە. بەگشتی شیعری ئەم شاعیرە خەریکی دڵدارییە، دەوری گرنگی بووە لە پەرەپێدانی شیعری تەقلیدی کلاسیکی کوردی و دەوڵەمەندکردنی.

## نموونەی شیعری نیهانی

- ١ -

لە غەزەلێکیدا نیهانی دەڵێ:

وا هاتە دەرێ گوڵ لە سەروپەردەیی نازی
ئەی خۆم بەفیدای سەروی قەدی و دیدەیی بازی
مەستانە و با سەڵتەنەت و عیزز و دڵارا
با لەنجەیی سەر پەنجە لەسەر ئەرزی درازی
بۆ قەتلی منی سوختە وا هاتۆتە جەولان
سا تووبی خودا بمکوژە شاهنشەهی غازی
ڕەحمی نییە بمرێ سەدی وەک من لە مەراقا
لای وایە کە مەخلووقە لە بۆ عەربەدەبازی
سەر بوو بەفیدای نیمە نیگای دیدەیی مەستی
هێشتاکو دڵم عوزری لە موژگانی دەخوازی
جانی دەدەمێ من لە بەهای ڕەددی سەلامی
نایێتە قسە بۆم بەلەکی لیرە و غازی
تابم نییە بینوارمێ مەگەر من بە(نیهانی)
جارێ لە کەناری نەوەکو ببمە موحازی

لەم شیعرەدا نیهانی هونەری لەوە نواندووە قافیەی شیعرەکەی لەسەر دەنگەکانی (...ازی) دروست کردووە. ئەوەی گرنگ بێ لێرەدا دەنگی (زێ)یە زۆر کەم لە قافیەی شیعری کلاسیکیدا بەکارهێنراوە. جگە لەمە شاعیر وێنەیێکی هونەری داهێنراو دروست دەکا کە دەڵێ: سەرم کرد بەقوربانی چاوی مەستی یار کەچی دڵم عوزر لە موژگانی دەخوازێ.

له شیعرێکی دیکەیدا شاعیر دەڵێ:

دیسان وا دڵ پەرێشان بوو چووە بازاڕی ڕیسوایی
مەتاعی خاسی ئیدراکی فرۆشت دای بەیەغمایی
ڕەفیقان و برای جانی لە ڕێی خوا سا عیلاجێ کەن
لە عەشقی شۆخی بێ ڕەحمی ئەوا لێم بوو بەشەیدایی
نەسیحەت نابیێ ئەسڵەن دەڵێ من باوکە کوشتەکەی ویم
دەڵێ سا لاچۆ لێم لادە یەخەم مەگرە بەبابایی
کە من گەنجینەیی عەشقم بەدەس کەوت شاهی سەر تەختم
چ باکم تۆیە ئەم گەنجە بدۆڕێنم بەخۆڕایی
هەزاران جانی شیرینم هەبێ نایێتە بەرچاوم
فیدای خاکی ڕەهی ئەو بێ و نیساری زولفی تایایی
بەقوربانی دوو چاوی نێرگسی و فەتتان و مەستی بم
ببم فیدیەی دوو لەعلی لێوی یاقووتی شەکەر خایی
لە دەعوای شۆڕی ئەو ماهە وەها چاکە (نیهانی) بی
هەزارانی هەیە دێوانەیی دوو زولفی یەڵدایی

هەندێ داهێنانی شارراوە لە دوو توێی ڕستەکانی ئەم شیعرە بەدی دەکرێ. شاعیر دڵ وەکو قاووغێکی دڵداری لە خۆی جیا دەکاتەوە، یا بەمانای فەلسەفی لە خۆی تەجرید دەکا. ئەوە دەگێڕێتەوە دڵ بەقسەی خاوەنەکەی ناکا، ئاراستەی کاری چاکی ناکا، ئیتر شاعیر بەبێ عەشق دەیگرێ، لەبەر ئەوە منەتی پێ نییە.

لە دوا دێری شیعرەکە سیفەتی یەڵدا بۆ زولفی یاری بەکار دێنێ. ئەوەی ئاساییە لەم شیعرەدا ئەوەیە یەڵدا ڕەمزی درێژترین شەوی ساڵە دەکەوێتە شەوی ٢١ی کانوونی یەکەم، لەبەر درێژی ئەو شەوە شاعیران بۆ سەردەمی عەشقبازی و ماچوموچ لەگەڵ یاری خۆشەویست بەکاری دێنن، کەچی ئەم شاعیرەشمان بۆ سیفەتی ڕەشی و درێژی بەکاری دێنێ، بەڵام زولفی یار بەو شەوە دەچووێنێ.

***

نیهانی شاعیر وێنەی جوان و تەعبیری داهێنراوی هونەرییە، لە مەبەسی وەسف و



دڵداری نەچۆتە دەرەوە. ئەگەر هەندێ بۆچوونی شاعیرانی پێش خۆی بووبێتە سەرچاوە بۆ ئیلهامی شیعری، بەرهەمی تازەی خۆی لە دوو دۆخدا بەرچاو دەکەوێ، یا ئەو مانایەی دەرەوە کە کاری تێ کردووە دەبێتە هۆی وێنەییێکی وەک ئەو دروست بکا، یا تەواوکەری ئەو دەبێ، یا لە داهێنانەکانیدا وێنە و مانای تازە دەردەهێنێ و دەبێ بەڕەمز بۆ شاعیرانی دیکە و خوێنەران.

# مەنفی

**١٩٢١ - ...**

## ژیانی مەنفی

مەنفی نازناوی مەلا ڕەسوول کوڕی مەلا مەحموودی بێتووشییە، باوکی لە بێتووشەوە هاتووە بۆ کۆیە و لەوێ نیشتەجێ بووە. ئینجا مەلا ڕەسوول لە کۆیە لە دایک بووە. باوکی لە مزگەوتی منارە مەلا بووە. ڕەسوولی کوڕی لای ئەو خوێندوویەتی، لە دوای مردنی باوکی جێنشینی ئەو بووە و حوجرەی خوێندنی داناوە و زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی فێری قوتابیان کردووە.

مەنفی زمانی فارسی زانیوە، لەبەر ئەوە لە سەردەمی داگیرکردنی کۆیە لە لایەن ئینگلیزەوە بووە بەتەرجومانی داگیرکەرە ئینگلیزەکان چونکە هەندێ لەو ئەفسەرە ئینگلیزانە ڕۆژهەلاتناس بوون زمانی فارسییان لە کوردی باشتر زانیوە.

مەنفی لە بنەماڵەی بێتووشییە، لەو خێزانەدا زانا و شاعیری گەورە هەڵکەوتوون، لەوانە مەلا عەبدوڵلای بێتووشی ناودار. شاعیری ئەم ناوە پێوەندی بەکاک مستەفای هیران (سافی) بووە، نێوانیان خۆش بووە، شیعری بەسەر سافیدا هەڵداوە.

لە ساڵی ١٩١٩ مەنفی کراوە بەبەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی لە کۆیە کە ناوی «ئوولا» واتە (یەکەم) بووە.

مەنفی لە ساڵی ١٩٢١ لە کۆیە کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە.

## شیعری مەنفی

شیعری مەنفی لە مەبەسە کلاسیکییەکانی شیعری کوردی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە نەچۆتە دەرەوە، زمانی شیعری ئاسان و ڕەوانە، کێشی عەرووزییە، یەکێتی قافیەی بەکارهێناوە، هەندێ لە مەبەسەکانی شیعری لاسایی دەور دەکاتەوە لە وەسف و دڵداری و داشۆرین. لە دیوانی شیعری کوردیدا جێ پەنجەی مەنفی دیارە و ئەو دیوانەی ڕەنگین و دەوڵەمەند کردووە.



## نموونەی شیعری مەنفی

- ١ -

لە شیعرێکیدا مەنفی دەڵێ:

قەمەر خەددی سەهی قەددی کەمەر موویی سەمەن بوویی
بەدەن سیمی دەهەن میمی جەفاکاری دڵ ئازاری
فەلەک خوویی مەلەک ڕوویی سیا چەشمی موژە سەهمی
بەلا جویی تەلخ گوبی مەهی بێ میهر و غەدداری

لەم پارچە شیعرەدا مەنفی ڕیتم و مۆسیقاییێکی تایبەتی بەناوەڕۆکی شیعرەکە بەخشیوە. هەر نیوە دێری کردووە بەچوار ڕستەی قافیەدار، جۆرە ئاوازێکی دروست کردووە لە ترپەی پێی ولاغی ڕەسەن و خوڕەی ئاوی گەلی دەکا کە سەرەوخوار دەبێتەوە. خوێنەر لەگەڵ مۆسیقای ڕەوانبێژی دەژی، خۆ ئەگەر سەرنجی ناوەڕۆکیش بدا کە وەسفی یارەکەیەتی، مانا و مۆسیقا هارمۆنییێک دروست دەکەن دەبێتە ئارامی گوێ و مێشک.

- ٢ -

لە شیعرێکی دیکەیدا مەنفی لە وەسفی یاردا بڕێک دیاردەی سروشت بەکار دێنێ بۆ بەراووردکردن لە نێوان هەندێ لە ئەندامی یار و دیاردەکانی سروشت:

لەبەر شەمعی جەمالی ڕووت دەسووتێم میسلی پەروانە
بەڵێ مەعلوومە پیشەی عاشقی هەر زار و گریانە
کەمەندی زولفی چین چینت لە ماچین عاشقان دێنێ
کە ئێمە تالیبی ماچین نەچین ماچینی ئیرانە
دەڵێن ڕۆژ و هیلال و ماهی چاردە قەد جەمع نابن
لە ڕوو و ئەبرۆ و جەبینی یار تەماشا چۆن نمایانە
تەمای بوو غونچە دەم لێدا لە گوڵزاری لەگەڵ زارا
سەبا نەیکردە نامەردی بەدەمییا داوە مەردانە
ئەگەر (مەنفی) کرا مەنفی نییە دەعوای لەگەڵ هیچ کەس
کە هەرچی بێ بەسەریا خۆشە چونکی ئەمری ڕەحمانە

لەم شیعرەدا مەنفی زولف و ڕوو و برۆ و نێوچەوان و دەم بەکار دێنێ بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕۆژ و مانگ و مانگی یەک شەوە و غونچە بەراووردیان بکا. ئەگەر بەڕووکەش تەماشای

ئەمە بکرێ باوەڕ ناکرێ شاعیری کۆن هەبێ بۆ ئەم وێنە و مانایانە نەچوو بێ، بەڵام ئەو داهێنانەی بۆ ئەم شاعیرە حسێب دەکرێ ئەوەیە جۆری بۆچوون و یاریکردن بەوشە جوانکاری دەبەخشێتە شیعرەکە.

- ٣ -

مەنفی لە شیعرێکیدا موناجات لەگەڵ یاری خۆشەویستی دەکا:

جەمیعی عاشقانی دڵ حەزینت
بەقوربانی دوو چاوی نێرگسینت
هەزارانی وەکو عەزرا و لەیلا
کەنیزانی غولامی کەمتەرینت
کە مەقسوودی دڵم ماچێکە قوربان
دەسا بیدە لە لەعلی شەککەرینت
ئەگەر مەیلت لە قەتلی عاشقانە
بەسە شمشێری ئەبرۆی نازەنینت
چییە جانا وەها بێ ڕەحمی ئەمرۆ
چ قەوماوە کەوا تێکچوو جەبینت
پەرێشان بوو دڵی عالەم بەکوللی
وەکو زولفت لەسەر ڕووی ئاتەشینت
کە (مەنفی) بەندەیی قوربانی تۆیە
بەماچێ دەستی بکرە دەست و دینت

شاعیر ئەم دلبەرەی خۆی بەگەورەتر دەزانێ لە هەموو دلبەرانی گێتی، بەتایبەتی عەزرا و لەیلا، لەبەر ئەوە دڵداری زۆرە. بێ گومان ئەم هەموو پێدا هەڵدانەی لە پێناوی ماچێکە دلبەر پێشکێشی شاعیری بکا، دیارە ئەو ماچەش دەست ناکەوێ.

- ٤ -

مەنفی خۆی بەدەروێشی کاک مستەفای هیران (سافی) داناوە، شیعری هەیە بۆ ستایشی ئەو دەروێشیزمەی لە کاک مستەفا بەرجەستەی کردووە، لە شیعرێکیاندا دەڵێ:

تاڵعم بێ دار بوو باز بەختم ئەوا نوستۆتەوە
کاغەزم ناردۆتە لای دڵدار و نەیخوێندۆتەوە



جوزئەیێ ڕەحمی موسوڵمانی لە دڵ پەیدا ببوو
بوو بەشەیتانی ڕەقیب و مانی لێ سەندۆتەوە
من کە خۆراکم نییە وا تێمەگەن بێ خواردنم
باری لێوم خواردووە خوێنی دڵم خواردۆتەوە
نووری دینی مستەفایە ڕەوشەنی کرد ڕووی زەمین
یا مەیی بێ میهر و مەهـ ڕووی ڕۆژی دەرخستۆتەوە
یووسفی میسری کە مەشهوورە بەحوسن و دلبەری
ئێستە هەم چەشمی پەیا بوو بۆچی خۆی شاردۆتەوە
(مەنفی)یا وا بەستەیی زولفی نیگاری خۆیەتی
یا نەخۆ دێوانەیە شێخ دەست و پێی بەستۆتەوە

مەنفی ئەم شیعرەی وەک نامەیێک یا پەیامێک بۆ کاک مستەفای هیرانی نووسیوە گلەیی لێ دەکا، چونکە وا دەردەکەوێ پێشتر مەنفی نامەی بۆ کاک مستەفا نووسیبێ و ئەو وەرامی نەدابێتەوە. بێ گومان ئەم نامەیە وەک موناجاتێکی دڵداری دەکەوێتە ڕوو، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە پێویستە بەهەوایێکی سۆفیزمیانە تەماشا بکرێ.

لە شیعرێکی دیکەیدا مەنفی جارێکی دیکە ستایشی کاک مستەفای هیران دەکا:

لە دووریت لالە ڕوو لالە زمانم
نەماوە تاقەتی نوتق و بەیانم
لە وەختی خەندە حەیرانم بەقوربان
لەبت یاقووتە یاقووتی ڕەوانم
غولامانت غولامانت دەهوونن
مەکە خۆت پەنجە ڕەنجە جیسم و جانم
لە سەرتاپا موقەییەد بووی بەکاکۆڵ
جەزات بێ بێ دەفعەیێ نەتبیست فیغانم
حەیاتم! چاوەڕێی ئاوی حەیاتم
لە لێوت دەفعەیێ تەڕ کە دەهانم
بەهار و پاییزم کردۆتە هەم دەم
لە ڕەنگی زەرد و ئەشکی ئەرغەوانم

لە بۆ بێزاری لێم ئەی نووری دیدە
هەر ئەم دوو ڕۆژەیە لێت میهمانم
وەرە عومرێکی تازەم پێ عەتاکە
بلێ عیسایی چارەم ئاسمانم
ئەوا ئیمانی پێ هێناوی (مەنفی)
بفەرموو مستەفای ئاخر زەمانم

ئەم شیعرە موناجاتێکە لە موریدەوە بۆ ڕێبەری خۆی. شاعیر برە شیعرەکەی خستۆتە بۆتەی سۆفیزمەوە. هەرچەندە شاعیر هەوڵیداوە ئەو خۆشەویستییەی بەرامبەر بەڕێبەری هەیەتی بیخاتە ناو عەشقی حەقیقییەوە، بەڵام دیسانەوە ڕزگاری لە ئەدگارەکانی عەشقی مەجازی نەبووە، لەبەر ئەوە شیعرەکەی دەچێتە ناو غەزەلی دلداریییەوە.

– ٥ –

مەنفی بەشداری لەو چوونە مەیدانە دەکا کە شێخ ڕەزا و شوکری فەزڵی بەشەڕە شیعر نابوویانەوە. شاعیری ئەم ماوەیەمان خۆی دەکا بەلایەنی شێخ ڕەزا و بەگژ شوکری فەزڵیدا دەچێ، لەم بابەتەوە دەڵێ:

شوکری خۆت دەیزانی تۆڵەی چاکە قەت ئاوا دەبێ
نانی کێری شێخ دەخۆی تا ڕووی زەمین ئاوا دەبێ

بەم جۆرە دوایی بەشیعرەکە دێنێ:

کێوی ئەلبورزی سورینت گەر بەری گورزم کەوێ
وای دەهاڕم سەد هەزار دەربەندی لێ پەیدا دەبێ
گەر رەئیسی شاعیران ڕوخسەت بداتن کافییە
کێری (مەنفی) قوون دڕێنی دوژمن و ئەعدا دەبێ

ئەم دێرانە وەک بەرهەمێکی جوان دەکەونە بەرچاو لە ڕووی هونەرییەوە. بەڵام پێویستە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لێیان بکۆڵرێتەوە. مەنفی بۆچ لای شێخ ڕەزای گرتووە و دژی شوکری فەزڵی وەستاوە؟ لێرەدا هەڵوێست هەر ئەوەیە بۆچ مەلا عەبدوڵڵای جەلی لە کۆیە لە کێشەکەی نێوان شێخ ڕەزا و کەیفی لایەنی شێخ ڕەزای گرتووە و بەئیهانە و لێدان کەیفی دەرکردووە و ناچار بووە کۆیە بەجێ بێڵێ و ڕوو بکاتە ئەستەمووڵ. هۆی ئەمە لە هەردوو باردا ئەوەیە شێخ ڕەزا بەناو و ناوەڕۆک کوڕی بنەماڵەیێکی شێخی قادری



بەناوبانگ بووە، مەقامێکی بەرزی بووە لەبەر خۆشی نەبووبێ لەبەر بنەماڵەی بووە. یەکێکی وەکو مەلا عەبدوڵڵای جەلی و مەلا ڕەسوولی مەنفی کە لایەنی شێخ ڕەزایان گرتووە لە دژی کەڵاش خوارێکی وەکو کەیفی و کەسێکی ئاسایی وەکو شوکری فەزڵی کارێکی ریاییان کردووە، نەدەبوو بیکەن، ئەگینا ئەگەر مەسەلە شاعیری بووبێ کەیفی و شوکری فەزڵی لەگەڵ ئەوەی شیعریان کەمە بەڵام لە شاعیرە مەقام بەرزەکان بوون.

***

مەنفی لەگەڵ کەمی شیعری جێگەی دیاری هەیە لە ناوەڕۆکی پڕ لە مانا و وشەی مۆسیقی و ئاسان و قافیەی ڕەوان. زۆربەی شیعری دەچێتە ناو دیوانی هەڵبژاردەی شیعری کوردییەوە.

## بەشی سێیەم

# سەید یەعقووب

**١٨٠٢ - ١٨٧٥**

### ژیانی

سەید یەعقووب کوڕی سەید وەیسی لە ساڵی ١٨٠٢ لە گوندی قەمەشەی ناوچەی ماهیدەشتی کرماشان لە دایک بووە. بەبنەماڵە دەچنەوە سەر سەیدانی سامەرەیی و لە قەمەشە دەژین. کوردی ئەو ناوچەیە و بنەماڵەی شاعیر لەسەر ئایینزای شیعەی دوازدە ئیمامین و لە هۆزی کەلهوڕن. خوێندنی لەسەر دەستووری ئایینی کۆن بووە. لە سەرەتای ژیانیدا هەوڵیداوە ببێ بەمیرزا، واتە خوێندەواری ئەو سەردەمە. بۆ ئەم مەبەسە سەری لە کرماشان داوە، ڕێی کەوتۆتە کرند و بێستوون، گەشتی تاران و قوم و شیرازی هەیە.

دەنگوباسی خوێندەواری و شیعری سەید یەعقووب گەیشتۆتە دیوەخانی ئیمام قولی میرزا عیمادولدەولەی کوڕی دەوڵەت شا. ئاشنایەتی لەگەڵ ئەواندا بووە، بەهۆی ئەو خانەوادەیەوە گەیشتۆتە مامە محەمەد حەسەن خانی فەرمانڕەوای کەلهوڕ وەک نووسەری (سکرتێری) دیوەخان لە ساڵی ١٨٣١ لەوێ دامەزراوە، تا دوایی ژیانی لەو ماڵە گەورەیە ماوەتەوە.

سەید یەعقووب ڕۆشنبیری چاکی سەردەمی خۆی بووە، بەختەخۆشی ناوبانگی دەرکردووە، لە زانستی مۆسیقا و بەکارهێنانی ئامێری تەنبوور هاوتای کەم بووە، شارەزایی زۆری بووە لە ئاوازی مەقامەکان بەتایبەتی ترپەی هۆرە. گەشتوگوزار و سەیران و ڕاووشکاری پێ خۆش بووە. لە سوارچاکیدا ناوی دەرکردووە. لە وڵاتانی لوڕ و کەلهوڕ و بەختیاری ناسراو بووە. دەنگ هەیە گۆیا ئاشنایەتی لەگەڵ یارسانان (ئەهلی حەق) پەیدا کردووە، لەو سەردەمانەی کە سەری لە کرند داوە.

هەندێ لەسەر ئەو باوەڕەن چووبێتە سەر ئایینی یارسان. لە شیعریدا شوێنەواری ئەم ئایینە بەرچاو ناکەوێ. وا دەگێڕنەوە سەید یەعقووب هەندێ جار کە تووشی حاڵی عیشق و جەزبی سۆفیزم دەبوو بەسەر وڵاغەوە غارغارێن و جلیتبازی دەکرد و هۆرەی دەچڕی.

نازناوی شیعری سەید یەعقووب «سەییید»ە، هەندێ جاریش «سەی یاقۆ»ی بەکارهێناوە، لەبەر ئەوە لە ژیانی شاعیریدا بە«سەی یاقۆ»ش ناسراوە، لە ناو خەڵکی



بەسەید یەعقووبی ماهیدەشتی ناوبانگی دەرکردووە. شاعیر لە ساڵی ١٨٨١ کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەی براوەتەوە ئاوایی قەمەشە و لەوێ نێژراوە.

### شیعری

سەید یەعقووب لە وڵاتی لوڕ و کەلهوڕ و گۆرانزەمین ناوی هەبووە، شیعری لە ناو دڵی خەڵکی جێگەی خۆی دۆزیوەتەوە. ماوەیێکی زۆر لە دەسنووسدا پارێزراوە، درەنگ بەچاپ گەیشتووە. محەمەد عەلی سوڵتانی کارێکی چاکی کردووە لە ساڵی ١٩٨٤ لە ئێران بۆ جاری یەکەم «دیوانی سەید یەعقووبی ماهیدەشتی» چاپ کردووە، دووبارە لە ساڵی ١٩٩٨ لە تاران چاپی کردۆتەوە.

سەید یەعقووب کەسێک بووە نزیک لە کۆمەڵانی خەڵک، بەزۆری لە شاعیرانی سەردەمی خۆی، بەرهەمیانی خوێندۆتەوە، وەکو ئاقەی کوڕی مەلەک قاسم خان و ئەڵماس خانی کەلهوڕ، جگە لەوە لە کۆنەکان شیعری خانای قوبادی و مەلا وەلەد خانی بەدڵ بووە و بەچاوێکی بەرز تەماشای «شیرین و فەرهاد» و «لەیلا و مەجنوون»ی کردووە.

سەید یەعقووب ئاگاداری دیالێکتەکانی زمانی کوردی بووە: گۆرانی (هەورامی)، سۆرانی، لەکی، کرمانجی. شاعیرانی ئەم ناوچانەی ناسیوە، بەتایبەتی نالی خۆشویستووە، بەشاعیرێکی گەورەی داناوە و شانازی پێوە کردووە و سەرکەوتووانە لاسایی کردۆتەوە.

شیعری سەید یەعقووب لە ڕووی ڕوخسارەوە دەکرێ بەدوو بەشەوە:

١- شیعری خۆماڵی، ئەوەی لەسەر کێشی سیلابی دانراوە (دە کەرتی و وەستان لە ناوەڕاست) و قافیەی مەسنەوییە. ئەم شیعرانەی لەسەر ئاوازی «هۆرە»یە. ئەمە ئاوازێکی ڕەسەنی دێرینە و لە ناو خەڵکی کورد باو بووە و سەید یەعقووبیان بەمامۆستای ئەم جۆرە هونەرە داناوە.

٢- شیعری تێکەڵاو، ئەمە لە ئەنجامی شارەزایی لە شیعری کلاسیکی کوردستانی باشوور و لە ژێر کاریگەری و لاساییکردنەوەی نالی سەید یەعقووب ئەم جۆرە شیعرەی داهێناوە. هەوڵیداوە زمانێکی دیکەی شیعر دروست بکا لە نێوان دیالێکتی گۆرانی و کرمانجی باشوور. بێ گومان ئەم هەوڵەی سەری نەگرتووە چونکە بەگشتی لە دژی تیۆری پەیدابوون و دروستبوون و پەرەسەندنی زمانە. ئەو هەوڵەی شاعیر وەکو سامانێک مایەوە. ئەم مەشقەی شاعیر لەگەڵ نالی بووە هۆی ئەوەی کۆمەڵێک شیعری لیریکی

لەسەر دەستووری شیعری کلاسیکی کوردستانی باشوور، واتە شیعری بەحرەکانی عەرووز و یەکێتی قافیە دروست بکا. ئەمەیان تازەکردنەوەییێکە لە تێکەڵکردنی دوو دیالێکت یا زیاتر لە بەرهەمی شیعری کوردیدا. ئەم دیاردەیە بەدەگمەن لای شاعیری دیکەش بەرچاو دەکەوێ.

## نموونەی شیعر

### شیعری خۆماڵی

بەشی زۆری دیوانی سەید یەعقووب شیعری خۆماڵییە لەو بابەتانەیە کە سەر بەشیعری گۆرانزەمینن لە ڕووی ڕوخسارەوە، تەنیا ئەوە نەبێ ئەوەی پێوەندی بەزمانەوە هەیە تێیدا هەست بەهەوای دیالێکتە بچووکەکانی لوڕی و کەلهوڕی و لەکی دەکرێ لە ڕووی دروستکردنی ڕستە و بەکارهێنانی فەرهەنگییەوە.

– ١ –

لە لیریکێکیدا سەید یەعقووب دەڵێ:

قەمەر عوزاران
شیرین شۆخ و شەنگ قەمەر عوزاران
زولفش ئەسوەدەن دەیجوور تارەن
گرژەن چین چینەن حەلقە زوننارەن
لوولەن هەلوولەن زنجیرەن مارەن
دشوارەن پریش دڵ گرفتارەن
حاجیب خەم چون تاق میحراب حاجات
بری کەی سۆفی نە ڕای موناجات
گادینەی هیلال نە رووی سەماوات
یا قەوس قوزەح هەزار عەلامات
کەمانەش پەیکان چەمش تەییارەن
دشوارەن پریش دڵ گرفتارەن
عەین عەبن غەزال چریدە تەتار
پەی من موقیمن پەی تەرەف خومار



ئەسوەد و ئەسفیل هەم لەیل و نەهار
دایم چون سەییاد ئامادەشکار
نیم نیگای نازش دایم نە کارەن
دشوارەن پریش دڵ گرفتارەن

سەید یەعقووب ئەم لیریکە درێژەی بۆ وەسفی ئەندامی لەشی دلبەر تەرخان کردووە، هەندێ ڕەمزی لە سروشت بەتایبەتی لە بەهار و گوڵ و گوڵزار وەرگرتووە بەمەبەسی ئارایشی وێنە شیعرییەکانی لە بابەت ڕەوانبێژییەوە. لە ڕووی ڕوخساریشەوە هەندێ نوێگەری هەیە، شیعرەکەی لەسەر بنچینەی کۆپلە (بەند) هۆنیوەتەوە. هەمووی بریتییە لە دە بەند، هەر بەندی لە شەش نیوە دێر شیعر پێک هاتووە، نیوە دێری شەشەم لە هەموو بەندەکان دووبارە و سێ بارە کراوەتەوە.

– ٢ –

لە لیریکێکی دیکەیدا لە وەسفی دلبەر دیسانەوە شاعیر دەڵێ:

زەنج زەر فینجان چینی لاجەورد
لەبریز جە شەربەت شیفا گران دەرد
جید مینای بلوور مەملوو پڕ لە مەی
مەی بەخش مەجلیس کیانان کەی
سینەش زەروەرەق زەمین تەلایی
مەم قوبەی قەندیل ئەوج سەمایی
نافەش مەر فینجان مەجلس شاهی
کەیلەن لە مەقدوون لوقمان دەوایی
هەر لە چای زەنخ تا حەوالی ناف
نەزم کەردەن دانەی زومروتی شەففاف
روکبە و رجلە و کەف پەنجەش حەنایی
فەرهاد شەهید کەرد خوسرەو فەنایی
پایی تەلەسم گەنج بێ قەرین
بەرابەر وەگەنج شاهان دەرین
روکبە و رجلە و کەف کە مەرگا و یەدەین
قەتن لە ئینسان مەر لە حوورولعەین

سەید یەعقووب لە لایێک هۆگری وەسفی مەتریالی حیسسییە، هەوڵ دەدا وێنەی ئەندامە جوانەکانی دلبەر لە سروشت بدۆزێتەوە، وەک ئەوەی مەمک بەلوتکەی قەندیل دەچوێنێ، لە لاییێکی دیکەوە هونەروەرانە خۆی وێنەی تازە دروست دەکا وەکو ئەوەی گەردەن دەکا بەجامی پڕ لە مەی.

- ٣ -

بەناوی «زولەیخا»ی بووکی شیعری دڵدارییەوە سەید یەعقووب «شەشین»ێکی هەیە لە هەشت بەند پێک هاتووە، لە ڕووی قافیەوە بەم جۆرەیە (ا ا ا ا ب ب)، نیوە دێری شەشەم لە هەموو بەندەکاندا دووبارە دەبێتەوە. لەم ماوەیەدا هەندێ لە بەندەکانی ئەو شیعرە دەخرێنە ڕوو.

زولەیخام چینەش
چین چین وە یا چین لە بان چینەش
هەی هەی جوو حەیان خەیاتەی چینەش
بەه بەه ژەو شوعاع شەوق جە بینەش
ئەحسەن جوو باڵای نەی شەککەرینەش
ئافەرین جوو سونع حوسن ئافەرینەش

***

دەخیل جوو موژگان جەرگ دڵدووزەش
دا وە بەرق سیمای سەحەر ئەفرووزەش
وەو تورڕەی ماران زەحاک تووزەش
وەو شەعشەعەی فام شەوانە و ڕووزەش
چمان جە نوقرەی خامەن سەرینەش
ئافەرین جوو سونع حوسن ئافەرینەش

***

وە ئەو بەرز باڵاش خەلایق جە دوور
ماچان بەدریوون ڕژیەدەن جە نوور
وە ئەو ساق سیمین سەر پەنجەی بلوور
مەر تاووس نە مولک ئەیوانی جای نوور



«سەی یاقۆ» پەی ئوو نەمەندەن دینەش
ئافەرین جوو سونع حوسن ئافەرینەش

وەسفی شاعیر لەم لیریکەدا ئاساییە. هەوڵیداوە سەرنجی خوێنەر بۆ ڕەوانی مۆسیقا و ترپەی ئاواز ڕابکێشێ کە جۆرە هارمۆنییێکی داوەتە شیعرەکە، لە زاراوەی ڕەوانبێژی کۆن «ئاوازی وشە»ی پێ دەڵێن، نابێ ئەوەش لە یاد بچێتەوە بەگشتی شیعری سەید یەعقووب بۆ گۆرانی چڕین و ئاوازەکانی هۆرە و قەتار و ئەڵڵا وەیسی دانراون.

- ٤ -

وەکو هەموو شاعیرانی دیکە سەید یەعقووب خۆی بەسۆفی ڕاست دادەنێ. چەندوچوونی هەیە لەگەڵ زاهید و نوێنەرانی شەریعەت، نوێژ و ڕۆژوو بۆ ئەوان، ساز و سەنتوور و زولفی گوڵاوی جوانان بۆ خۆی. لە بابەت کۆڕی بەزمی عاشقانەوە دەڵێ:

خانە بەگ وەو سەوت وەو قەتارەوە
عەنبەر وەو ئاواز سەدای تارەوە
ئەگەر بوینی بشنەوی وەگۆش
حەقپەرستی وێت مەکەی فەرامۆش
تۆ هەر های لەفیر ڕۆژە و نمازان
منیش هام لەفیر کەمەن درازان
تۆ هەر های لەویر میحراب و مینبەر
من هەر هام لەویر زولف و بۆ عەنبەر
ڕای ڕوبا و ئەنجیر گرتنی لە پێش
باوە تۆ گورگی های لە جەڵدەمێش
هەریەک نامەمان بگەریم وەدەس
نیکی و بەدیمان ئەوت موشەخخەس
ئەوسا لەو دنیا خودا شاهیدەن
حەق وە «سەی یاقۆ» یا وە زاهیدەن

لەم شیعرەدا سەید یەعقووب یادی دوو هونەروەری کوردی کەلهوڕ دەکاتەوە، خانە بەگ و عەنبەر، ئەمانە دەنگ خۆش و مۆسیقاژەنی میللی بوون بەتایبەتی ئامێری تار. نویشکی مەبەسی سەید یەعقووب ئەو زۆرانبازییەیە لە نێوان شەریعەتی ئیسلام و تەریقەتی سۆفیزم، بێ گومان دەبێ هەمیشە حەق بەلای شاعیرەوە بێ.

## شیعری عەرووزی

سەید یەعقووب گیرۆدەی شیعری نالی بووە، ماوەییێکی زۆر خۆی پێوە خەریک کردووە، چێژی لێ وەرگرتووە و لەگەڵ خەیاڵیدا گونجاوە، لە ئەنجامی ئەمە کۆمەڵێک لیریکی نووسیوەتەوە لە کێشی عەرووزی و یەکێتی قافیەی شیعری باشووری کوردستان دەکا. لەو جۆرە شیعرانەدا زمان و لێکسیکۆنی دیالێکتی گۆرانی و وردە دیالێکتەکانی دیکە بەسەر ئەوەی کرمانجی خوارووەدا (سلێمانی) زاڵە. ئەم کارە بەجۆرە داهێنانێک دادەندرێ لە ئەدەبدا. لەم ماوەیەدا بەشێک لە نموونەی ئەم شیعرانە بڵاو دەکرێنەوە.

- ١ -

دلبەرا جەور و جەفا کەی خوفت و ئەژ باری نییە
یا خەیالت دا سەدێ گۆنایی گولناری نییە
تیری موژگان دەی لە جەرگ و زولفی موشکین دەی وە باد
بۆیی میشک و زەخمی پەیکان تەرزی دڵداری نییە
دلبەر ئەر فەهمت زیادەن بۆچ دەکەی ئازاری خەڵق
شێوەیی ساحیب کەمالان مەردوم ئازاری نییە
قیبلەیی من ڕۆژ و شەو ئەبرۆیی یاری با وەفاس
زاهیدی تەزویر کر چون تاقی گوڵکاری نییە
دەرکەفی (سەیید) لە چینی زولفی عەنبەرباری تۆ
هەستی تاتاری لە فیکرە میشکی تاتاری نییە

- ٢ -

دڵم پا بەستی زولفی یارن ئیمشەو
لە بەختی من درێژ و تارن ئیمشەو
دڵی دێرم عەزیزا ماچە بولبول
ژ سەودایی روخی گوڵ خارن ئیمشەو
نە یارم هەمنشین نە دۆستی هەمدەم
لە تەنیا غەمم غەمخواردن ئیمشەو
ژ بەس دەردم گرانن قابیزی ڕووح
ژ قەبزی ڕووحی من بێزارن ئیمشەو



دڵی زارم ژ هەجری ڕوویی یارم
سپەندی بوون کە بم سەرنارن ئیمشەو
سەبا لەم حالی زارم ئاگەهی تۆ
ئەگەر دڵداری من بێدارن ئیمشەو
بەواچە مەرهەمی زامان «سەیید»
لە بۆیی نافەیی تاتارن ئیمشەو

- ٣ -

هەرکە فەسڵی نەوبەهاران تەرکی جامی مەی دەکا
نەوبەهاری عومری شیرینەش وە فەسڵی دەی دەکا
بادەنۆشی وا زەریفە ئەر گەدایی لێی بخوا
فەخر بەر شاهی جەمشید و قوبادی کەی دەکا
خۆش بەحاڵی ئەو ڕەشە مەستە کە عومری سەر بەسەر
سەرفی مەعشووق و مەیی و چەنگ و ڕەباب و نەی دەکا
دووڕی پەندت ناسیمانە چوو بەگووشی عاریفان
خاروخەس کەی جێ لە بەحری لوججەیی بێ پەی دەکا
زاهیدا هەر کەس کە لە جامی مەحەببەت مەست بێ
گووش بۆ زوهدی ڕیایی وەک تو ناسیح کەی دەکا
میرم هەر عیشکی لەم ئیمرۆ مویەسسەر بوو بکا
تا وە فەردا کێ دەزانێ چەرخی گەردوون چی دەکا
هامسەران خالیق دەزانێ تامی مەی (سەیید) نەچێشت
ئەژ ڕە زهن و زەکا ڕاهی نەڕەفتە تەی دەکا

- ٤ -

زولفی موشکین دلبەرا کەم حەلقەکە بێ جا دەوی
هەر درازی چین دەوی چون عومری من کۆتا دەوی
گەر بوا بادی سەحەر بۆیی نە زولفت تا مراز
بێ مەسیما سەد هەزار عەزمی ڕەمیم ئیحیا دەکا

زولف و چاو و خاڵ و خەت هەریەک لە یەک لا دڵ دەون
یەک نەفەر کەی هەم نە رووی چوار بێ پەروا دەوی
ناوکی موژگانی تۆ دلبەر لە بەس جەرگم بڕی
سوبح و شام ئەسرینی چاوم لە غەمت دەریا دەوی
هەرکە حاجی خان سیفەت رووکم نەکا لە عیشقی تۆ
خەرمەنی عیشقەش مەسۆز و تابی دلبەر وا دەوی
گووش دەر سەلمانیا چون تورگ لەیلا ئەدی
لالە گوون لم خوونی مەجنوون دامەنی سەحرا دەوی
زاهیدان مەنعم مەکەن (سەیید) و دلبەر دل مەدی
وی نزانن دڵ گرفتاری روخی زیبا دەوی

لەم شیعرانەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە سەید یەعقووب مەشقێکی زۆری کردووە تا گەیشتۆتە پلەیێک بتوانێ چێژ لە شیعری عەرووزی وەربگرێ و ئەو توانایەی لا دروست ببێ بتوانێ لاسایی بکاتەوە، بەمەرجێک سەرکەوتوو بێ. لەو شیعرانەدا بایەخێکی زۆری بەپاش قافیە داوە کە مەرجێکی گرنگە لە یەکێتی قافیەی شیعری کلاسیکی کوردستانی باشوور، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە لە بنج و بناوانی دروستبوونی ئەو جۆرە شیعرە گەیشتووە.

## سەید یەعقووب لاسایی نالی دەکاتەوە

چەند لیریکێک لە دیوانی سەید یەعقووب بەرچاو دەکەون مۆرکی نالییان پێوە دیارە، بڵاوکەرەوەی دیوان ئاماژەی بەو ڕاستییە کردووە.

- ١ -

نالی لە شیعرێکیدا دەڵێ:

گوڵبونی قەددت لە قوببەی سینە غونچەی کردووە
غونچە بەم شیرینییە قەت نەیشەکەر نەی کردووە

سەید یەعقووب دەڵێ:

هەرکەسێ لەو لەبیدە تامی جورعەیی مەی کردووە
خزر ئاسا خۆی لە مردن تا ئەبەد حەی کردووە
قودرەتی حەق بێن تەماشا کەن کە لەو یەک قەترە ئاو
نار و نارنگیی و لیمۆ لەو شەکەر نەی کردووە



سەروو شمشاد و سنۆبەر کەی شەمامە بەرئەدا
ناری موشکینە گوڵی داوە هەمووی قەی کردووە
نار و نارنگیی و نێرگس لەعل و گوڵ مەرجان ژەنی
فیکری ئەم یەک نەخلە ئەی گوڵ میوەبەر کەی کردووە
خەلقی بۆ یەک بۆسە نیم گیان ئەویەکی یەک گیان ئەدا
بێ بەقا ئەم تەحرە بۆی ئەو نیمە گیان تەی کردووە
مەنعی من بۆچی دەکەن ئەی زاهیدانی بێ خەوەر
غەپدە دڵ دلبەر دەکا دڵ مەیلی ئۆخخەی کردووە

- ٢ -

نالی لە شیعرێکیدا دەڵێ:

زولفت بەقەدتدا کە پەرێشان و بڵاوە
ئەمڕۆ لە منی شیفتە ئاڵۆز و بەداوە

سەید یەعقووب دەڵێ:

شۆری بەسەرم کەوتیە لەم مەستیی چاوە
لەم جێگە نەنیشم مەگەر ئەو جێگە شەراوە
ئەم زولف و روخی دلبەرە یا لەیل و نەهارە
یا هەورە ڕەشی پەردەکەشی بانی هەتاوە
ڕوخساری تۆ وەک مانگ دوو زولفت وەکو عەقرەو
هەرچەن کە قەمەر عەقرەوە ڕازیم بەقەزاوە
(سۆزی دڵمە باعیسی تاو و گوڵی گریان)
مەعلوومە کە ئاگر سەبەبی جۆششی ئاوە)
ماچان کە غەزالان چەڕنی شۆرە زەمینە
پەس ئاهوویی من چیشەکە لەم جێگە ڕماوە
ئەی دڵ گوزەری کەوە قولنگ تاشییی فەرهاد
بێن نالەکەی ئەیژنەوی لەو دڵی کاوە
زاهید وە خودا غەیری خەم و ئەبرۆیی دڵدار
مەیلم نە وەمزگەفت و نە دەیرونە کیتاوە

زولفت وە ڕوخت وەهـ چ پەرێشان وولاوە
سەبرە و بەدڵی شیفتە یەک بارە ڕژاوە
چاوانی نیگارم وەسپاهی موژەما چوون
ئەی لەشکری خوون ڕێژ ئەمە وەقتی چپاوە
دلبەر لە غەمت (سەیید)ی پێچارەی سەرشەو
خوون ڕێژییە لەم چاوە حەتا سوبحی دەماوە

- ٣ -

لە غەزەلی پێشووی نالی «زولفت بەقەدتدا...» دێرێک هاتووە:

هەرچەندە کە ڕووتم بەخودا مایلی ڕووتم
بێ بەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە

ئەم دێرە شیعرەی نالی سەرنجی سەید یەعقووبی ڕاکێشاوە و غەزەلی داهاتوو ڕەنگدانەوەی ئەو دێرە شیعرەیە:

دلبەر تۆ نەپرسی کە من ئەوقەر لە چ ماتم
حەیرانی خەم و ئەبرۆ و زولفانی سیاتم
ئەوزاعی کەمی دلبەرە عەیبی نییە بۆ من
هەرچەندە کە لاتم وە خودا مایلی لاتم
ڕۆژێ کە وەکوێ تورسیمی حالی من بی
چون حاجی میشکی نەمیی و ڕاهی نەجاتم
قوربانی حەیاتم تو کە ناتی لە حەیاتم
سەرکردە وەفاتم گوزەری کر لە وەفاتم
زەهرا بدەری نۆش بکەم دۆستی بلاتش
وازانمە خزری بدەری ئابی حەیاتم
من (سەیید)ی مسکینم و تۆ مونعیمی حوسنی
یەک بۆسە بدەر من لە گەدایانی سەراتم

نێوەندە ئەدەبییەکانی کوردستانی گەورە، هەریەکە ئەدگاری تایبەتی خۆی هەیە. لە مەرجە گرنگەکان لە یەکترییەوە نزیکبوون، لە بچووکەکان لە یەکترییەوە دووربوون، هەروەها پێوەندی لە نێوان شاعیرانی ئەم نێوەندانە کەم بووە، یەکێ لەوانە ئەوەیە سەید



یەعقووبی شاعیری گۆرانزەمین بایەخی بەبەرهەمی ئەدەبی کوردستانی باشوور داوە و نالی ناسیوە و جۆرە شیعرێکی دروست کردووە لەگەڵ ئەوەی نەبووە بەنەریت و مۆدێل هەر چۆنێ بێ نوێگەری تێدایە بۆ سەردەمی خۆی و دیوانی شیعری کوردی ڕەنگین کردووە.

***

سەید یەعقووبی ماهیدەشتی (سەی یاقۆ) یەکێکە لە شاعیرە دیارەکانی ناوچەی کرماشان. بەرهەمی شاعیر نموونەی شیعرێکی بەرزی زمانی کوردییە، زادەی تێکەڵاوی دیالێکتە بچووکەکانی زمانی کوردی ئەو ناوچانەیە بەدیالێکتی گۆرانی و ئینجا موتروبەکردنی ئەمە بەدیالێکتی کرمانجی باشوور.

سەید یەعقووب شیعری لەسەر کێشی سیلابی میللی خۆماڵی داناوە. لە ژێر کاریگەری شیعری کوردستانی باشوور بەتایبەتی بەرهەمی نالی شیعری لەسەر کێشی عەرووز و یەکێتی قافیە داناوە. بەشێک لەم جۆرە شیعرەی کەوتۆتە ژێر کاریگەری ڕاستەوخۆی هەندێ لە غەزەلەکانی نالی. بەشێکی دیکەش بەگشتی ڕەنگدانەوەی قوتابخانەی شیعری کوردستانی باشوورە لە سەدەی نۆزدەمدا.

سەفەر ئەندەر وەتەن چ کەڵک دەگرێ
سەیری ناکەی شەمەندەفەر دەفڕێ
بەقسەی سادە برسی تێر نابێ
عەمەلە عیززی دین و دنیا بێ
ئاسنی سارد بەفوو نەرم نابێ
بەترانیش حەمام گەرم نابێ
تەلغرافیش تەلێکە بێ مایە
موخبیری ڕوویی کوللی دنیایە

حاجی باس لە ناوەڕۆکی بەرهەمی زانستییەکان دەکا لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا، ئەمانە قاڵبی خۆیان گرتبوو، گۆڕان و تازەکردنەوە بەلایانا نەدەچوون، لای ئێمە ماوەی ئەوە نییە بیر لە تەلگراف و شەمەندەفەر بکرێتەوە. لە پیشەسازی تازەدا حاجی باس لە شەمەندەفەر دەکا. ئەوە ڕاستە لە سەردەمی ژیانی حاجی لە ئەوروپا شەمەندەفەر هەبوو، حاجی لە وڵاتی عوسمانی هەواڵی بیستبوو و ڕەنگە چاویشی پێ کەوتبێ. کەچی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم تا دوای جەنگی یەکەمی گێتی و پەیدابوونی شەمەندەفەر لە ناوچەکانی ئێمە خوێندەوارانمان نەیاندەزانی لە سەردەمی حاجی لە ئەوروپا شەمەندەفەر هەبوو، لەبەر ئەوە دەیانوت حاجی کەراماتی هەبوو پێش ئەوەی ئەم داهێنراوە پەیدا ببێ پێشبینی کردووە لە دوارۆژدا شتێکی وا دروست دەکرێ، دیارە ئەوانەی لای ئێمە ئاگاداری ئەوە نەبوون لە سەدەی نۆزدەمدا شەمەندەفەر لە ئەوروپا پەیدا بووە.

حاجی لەسەر شیعرەکەی بەردەوامە و دەڵێ:

عولەمامان بەقەولی بێ سەر و پا
پاکی خنکا لە بەحری وشکی هەوا
سنعەتێک فێر نەبوون لە پاش تەحسیل
سەیری چۆن بۆ مەناهی بوونە دەلیل
یەک بەیەک بوونە خائینی دەوڵەت
خائینی مولک و دوژمنی میللەت
تا تەعیناتی کۆر و لاڵ مابوو
لە گەلێ دێیەکان مەلای چا بوو



ئەو دووانە بەڕەحمەتی خوا چوون
شارەکان بێ مەلا و مودەرریس بوون

حاجی دەڵێ زاناکانمان خەریکی قسەی بێ سەر و پا بوون، خۆیان فێری هیچ سەنعەتێک نەکرد، گەورەکان تاوانبار و دوژمنی دەوڵەت بوو، کەچی حاجی «کوێر» و «لاڵ»ێک لە ناو ئەمانەدا جیا دەکاتەوە، مەبەسی لە «کوێر» پاشا کۆرەی ڕواندزە، لە «لاڵ»یش عەبدولڕەحمان پاشای بابانە گۆیا ئەمانە لە میرنشینەکەی خۆیاندا بایەخیان بەمزگەوت و خوێندنی حوجرە داوە و بەم هۆیەوە مەلای چاک لە ناوەوە بوون.

شاعیر بەم دێرانە دوایی بەشیعرەکەی دێنێ:

عەجەبا بۆچی ئەهلی مولکی عیراق
ئیتتیفاقی بەدەل دەکەن بەنیفاق
بۆ ئەمیرانی غەیرە دەبنە گزیر
نەک لە خۆیان یەکێکی بێتە ئەمیر
ئێستەکەش فرسەتە گەلی یاران
کەپەنەک بۆ چییە لە پاش باران

حاجی سەیری پێ دێ کە خەڵکی عیراق لەباتی ئیتتیفاق نیفاقیان هەیە، دەبێ ئەمە لەبەر ئەوە نەبێ «عیراق» و «نیفاق» و «ئیتتیفاق» قافیەیان یەکە! ئەمانە هەمیشە پیاوی بێگانانن. ئێستاش هەلێکی باشە ئەی کورد، هەڵسن و لە دەست خۆتانی مەدەن.

## پیاو خراپانی ناو کۆمەڵ

- ١ -

لە شیعرێکیدا حاجی دەڵێ:

حاکم و میرەکانی کوردستان
هەر لە بۆتانەوە هەتا بابان
یەک بەیەک حافیزی شەریعەت بوون
سەییدی قەوم و شێخی میللەت بوون
سەیید و شێخەکان لە ترسی ئەوان
مونزەوی بوون و زاکیری ڕەحمان

هەرکە فەوتان ڕیای ئەوان دەرکەوت
سەیری چۆن بوونە پووش‌و ئاگر و نەوت
یەکێ لەملاوە ڕوو دەکاتە عەجەم
دوو لەولاوە دەبنە دوژمنی هەم
دوو هەزار ژن فەساد کرا لەملا
بوونە قاتیل ئەوانی تر لەولا
یەک بەیەک بوونە نائیبی هەمەوەند
ساحیبی مارتین و ماری گەزەند

لەم شیعرەدا حاجی دواکەوتوویی میللەت لە هەموو ڕووییێکەوە، هەروەها بەجێمانی کورد لە کاروانی مەدەنیەتی گەلانەوە لە کردەوەی شێخی تەریقەتدا دەبینێ. ئینجا شاعیر دەڵێ فەرمانڕەوایانی کورد لە بۆتانەوە تا بابان کاری باشیان دەکرد. تا ئەوان بەهێزبوون شێخەکان دەوریان نەبوو، کە فەرمانڕەوایان بێ هێز دەبوون شێخەکان ئاژاوەیان دەنایەوە. یەکێ دەبوو بەپیاوی عەجەم، دووان لەولاوە دەبوون بەدوژمنی یەکتری. دوو هەزار ژنیان خراپ کرد، هەزارانی تریان بەکوشت دا.

ئەوجا شیعرەکەی بەم دێرانە کۆتایی پێ دێنێ:

میللەتیش هێند کەرن وەکو جاران
دەستیان ماچ دەکەن دەڵێن قوربان
گەر لە سەحرا مەلا نەمردایە
گورگەشین با کەری بخواردایە
شێری دڕندە وەک لە بێشە نەما
گورگ و مام ڕێوی دێنە ڕەقس و سەما
من لە غەمخواری ئەم قسانە دەکەم
وەرنە پەشمە لە لام هەموو عالەم
ئەم قسەی ئێستە عەیبی لێ دەگرن
ئەو دەمەش دێ کە ئێوە بۆی دەمرن
ئەم بەئەو ئەو بەئەم دەڵێ کاکە
سەیری قانوونی حاجی چەند چاکە



هەر چلۆنێ ئیشارەتی فەرموو
وەک کەرامەت هەمووی وەها دەرچوو

حاجی سەیری بەو میللەتەی خۆی دێ، لەباتی ئەوەی شێخەکان تاوانبار بکا دەستیان ماچ دەکا. ئاژاوەی ناو کۆمەڵ شیرازەی ژیانی ئاسایی تێکداوە. ئەگەر شێر نەمێنێ گورگ و مام ڕێوی دەست بەسەما دەکەن. لە پاشانا حاجی وەک دووبینێک و زانایێکی ستراتیجی کۆمەڵایەتی باس لە ئامۆژگارییەکانی خۆی دەکا و دەڵێ خەڵکی نرخی نازانن، بەڵام ڕۆژێک دێ پەسەندی دەکەن. بەیەکتری دەڵێن قانوونی حاجی زۆر باش بوو، ئەو کابرایە کەرامەتی هەبوو، ئەگەر ئێستا زیندوو بێتەوە، بەبزەیێکی قەشمەری ئامێز بەخەڵکی دەڵێ: نەموت!! من ئێوەم ناسیبوو بۆیە ئەو قسانەم دەکرد. دەبینن تا ئێستاش ئەوەی دەتانەوێ دەستتان نەکەوتووە.

- ٢ -

لە شیعرێکی دیکەیدا حاجی دەڵێ:

تا ڕێک نەکەون قەبیلی ئەکراد
هەر وا دەبنە خەرابە ئاباد
ئەنواعی میلەل لە گەورە تا چووک
خەمڵیوە مەمالیکی وەکو بووک
یەک بەرگن و یەک زوبان و یەک ڕەنگ
بێ غەیبەت‌و عەیب و عار و بێ دەنگ
دنیا بەتران دەخۆن و دەیدەن
هەر چۆنێ مەرامیانە دەیکەن
هەر کوردن ئەگەرچی باکی مەردن
پامالی زەمانە میسلی گەردن
هەر مانەوە بێ نەوا وو مەزڵووم
وەک بوومی خەرابە زار مەشئووم

لەم شیعرەدا حاجی باس لە دواکەوتوویی و پەژمردەیی کورد دەکا. بێ نەوا و دەستبەسەر ماونەتەوە و وەکو کوندەبووی بەدفەڕی خەرابەیان لێ هاتووە. حاجی بەم جۆرە لەسەر شیعرەکەی دەڕوا و دوایی پێ دێنێ:

گەر باعیسی ئەم دەپرسی کامە
شەرتێکە کە بۆ هەموو تەمامە
ئەو شەرتە بەکوللی ئیتتیفاقە
گەر مەرعش و وانە گەر عیراقە
قەسرێکە بەساغی ئەو نیفاقە
گەر وا نەبێ بابی هەر بەتاقە
سەد شێخ و مەلا و ئەمیر و خانی
بۆ لەزەتی عەیش و زیندەگانی
لەولاوە ئەوان بەحیلەبازی
لەملاوە ئەمان بەتەقلەبازی
قوریان بەهەموو ولاتەوەدا
تا مولک و ڕەعییە پاکی فەوتا
یەکیان ئەوی تۆ دەکەی نەیان کرد
غەمیان نەبوو کورد ئەگەر هەمووی مرد

ئەستووری بیروباوەڕی حاجی لە سەرکەوتنی مەسەلەی نەتەوایەتی کورد کە دروستکردنی دەوڵەتی تایبەتی خۆیەتی یەکێتی و یەکگرتنە، تەنیا یەکگرتن، ئەمەیان نەبێ ئەویان نابێ.

### یادی نیشتمان و هیوای حاجی

شیعری «لە ڕۆما کەوتە بەرچاوم»ی حاجی ئەگەر مامەڵەی چیرۆکی شانۆیی لەگەڵدا بکرێ دەشێ ببێ بەسێ پەردە یا دیمەن. دیمەنی یەکەم حاجی لە ئەستەمووڵ چاوی بەکابرایێکی کورد دەکەوێ:

لە ڕۆما کەوتە بەرچاوم کەسێکی هائیم و حەیران
بەهەیئەت تێی گەییم کوردە بەشێوەی ئەهلی کوردستان
کە چوومە خزمەتی پرسیم برادەر خەڵکی کام جێگای
لە کام لا هاتووی گریا گوتی بابان گوتم بابان
دڵم داوە گوتم باوکە هەموومان بێ کەسین لێرە
چ قەوماوە گەلێ حەیفە مەگریێ هەر وەکو باران



گوتی بۆ غوربەت و ڕووتی نییە ئەفغان و هاوارم
لە داغی حاکمی خۆمە لە شان و شەوکەتی تورکان
گەلێکم بیستووە پەستی و بڵندی دەوڵەتان ئەمما
جیهان نەیدیوە پەستی وا میسالی حاڵی کوردستان

هەڵوێستێکی پڕ لە سۆزی ڕۆمانتیکییانەیە. حاجی لە ئەستەمووڵ چاوی بەکەسێک دەکەوێ ئەدگاری ئەوە دەگەیەنێ لە کوردستانەوە هاتووە و کوردی ئەوێیە. لێی نزیک دەبێتەوە، بەسۆزەوە دەپرسێ خەڵکی کام جێی کوردستانە. کابرا بەدەم فرمێسکی گەرمەوە، دەڵێ بابان. حاجی دڵی هاوڕێی دەداتەوە، ئەویش هۆی شین و شەپۆڕی بۆ حاجی ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ بۆ خۆی نییە بۆ مەینەتی کوردانە. ئەوە ئاشکرایە لەو ڕۆژگارەدا پشتی کورد لە ئەرز درابوو و لووتی تورکی عوسمانی پێ بڵند بووبوو، چونکە لەمێژ نەبوو سوپای عوسمانی میرنشینی بابانیان ڕووخاندبوو، دیارە هەر لەبەر ئەوەش بووە حاجی قارەمانی ئەم گێڕانەوەیەی کردووە بەخەڵکی سلێمانی.

دیمەنی دووەم حاجی بەشان و باهوو و ڕابردووی پڕ لە شانازی کورد هەڵدەڵێ:

لە وەقتی خۆی هەموو شا بوون سەراپا بێ غەم و شا بوون
لە جوودا حاتەمی تائی لە شەڕدا ڕۆستەمی مەیدان
لە پێشا خاکی مەلانەی پڵنگ و شێری ئازا بوو
ئەمێستا مار و مێروو و گورگ و ڕێوی لێی دەکەن سەیران
لە کوێ ما نەعرەتەی تەقڵە و جلیت و ڕم و ڕمبازی
لە کوێ ما دەنگی زوڕنا و دەهۆڵ و شایی و سەیران
لە هاڕەی شەش پەڕ و نەڕڕەی سوار و بەرقی شەشخانە
لە تەققەی ناڵ و شەققەی سم لە ڕەققەی تۆز و قەڵغان
دەهاتە جونبوش و لەرزین لە ماهی بگرە تا ماهی
لە سەحرا چەندە وەحشی بوون لە ترسان چوونە سەر کێوان
لە ڕێزی زەبر و زەنگی وان کەسێکی تر نەبوو هەرگیز
بە شێر و حیشمەتی کوردە کە ماوە دەوڵەتی ئێران
سەرا و ئەیوانیان ئێستا کەلاوەی کوندەبوو و جوغدە
ئەگەر مەیدان و دیوانە سەراپا بوویتە جێی دۆمان

حاجی دەڵێ لە کاتی خۆیدا کورد هەموویان شا بوون، بەشادی دەژیان. وڵات لانەی پڵنگ و شێران بوو، لە لایەک یاری و گەمە و ڕابواردن، لە لایەک دەهۆڵ و زوڕنا و شایی و سەیران. قارەمانانی جەنگ گەردوونیان هێنابووە جۆش و خرۆش. لە دواییدا ئەم هەموو خۆشییە لە دەست چوو. ئێستا کوردستان جێی مار و مێروو و گورگ و ڕێوییە. سەرا و باڵەخانەکانیان کەلاوەی کوندەبوو و کۆلیتی دۆم و خەڕاتانە.

دیمەنی سێیەم حاجی بەم جۆرە دوا گفتوگۆ لەگەڵ هاوڕێ کوردستانییە هاوخوێنەکەی دەکا:

لە پاشی ئەو هەموو گریان و ناڵە و زارییە پێم گوت
عەزیزم غەم مەخۆ هێندە لە سایەی ڕەحمەتی ڕەحمان
ئەمیرێک ماوە پاشایە گوتی کێیە گوتم شێرە
گوتی لێرە گوتم لێرە هەتا تاران و هیندستان
بەخۆی شێرە وەکو ناوی لە شەڕدا دوژمن ئەندازە
تەمایان هەر بەئەو ماوە جەمیعی خاکی کوردستان
هەرچی جێگەی ئومێدمانە و ئەوی دڵ خۆش دەکا ئەمڕۆ
کەسی دی لەو بەدەر نابێتە غەمخۆری گەلی کوردان

لە دوای ئەم هەموو ناڵە و گریانە حاجی بەهاوڕێکەی دەڵێ، غەم مەخۆ، هیوا و ئامانج نەمردوون. ئەمیرێک لێرە ماوە ئەوەندە گەورەیە لێرەوە تا تاران و هیندستانە. بەخۆی شێرە و ناویشی شێرە، جێی ئومێدە، تۆڵەمان بۆ دەکاتەوە و ئازادیمان بۆ وەردەگرێتەوە. بەئاشکرا دیارە ئەو کەسەی وەکو شێر ئازا بێ و ناویشی شێر بێ، دەبێ یەزدان شێر بێ. ئەم کەسایەتییە ناوی عیزەدین شێری جزیرییە، بەناوی عیزەدین شێر پاشا ناسراوە و برازای بەدرخان پاشایە. دەمێنێتەوە سەر ئەوەی ئایا بەڕاستی مەبەسی حاجی لەو میرە یەزدان شێرە، ئەمەیان قسەی لەسەرە. برێک لە مێژوونووسان و هەندێ لە بەدرخانییەکان بەتاوانباری دادەنێن، گۆیا لە کاتی خۆیدا دەستی لەگەڵ عوسمانییان تێکەڵ کردووە بەمەبەسی ئەوەی بیکەن بەفەرمانڕەوایێک لە دژی هەڵسانەکانی کوردی ئەو سەردەمە بەتایبەتی بەدرخانییەکان.

ئەم بەسەرهاتە ڕاست بێ یا ڕاست نەبێ گرنگ نییە بۆ مێژووی ئەدەب. بێ گومان ئەمە مەسەلەیێکە دەچێتە ناو مێژووی گشتییەوە. جا ئەگەر حاجی مەبەسی یەزدان شێر بێ



دیارە بیروڕای لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە یەزدان شێر بەقارەمان دادەنێن نەک تاوانبار.

ئەم هەموو ڕەشبینییەی حاجی بەرامبەر بەمەسەلەی نەتەوایەتی کورد لێی بووە بەگرێ کوێرەی سایکۆلۆجی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆڵی نەداوە و کۆڵ نادا و نایەوێ یاری بەئیدیۆلۆجییەتی خۆی بکا و خوا نەخواستە بیر لەوە بکاتەوە کە کورد ناگا بەئامانجی.

***

حاجی لە مێژووی ڕۆشنبیری نەتەوەی کورد بەگشتی و مێژووی ئەدەبی کوردی بەتایبەتی پێویستە ناوی تەنیا بە«حاجی» ببرێ. مەزنی ئەم کابرایە تەجریدی دەکا لە هەموو ناوێک: قادر، گۆڕ قەرەج، کۆیە، ئەستەموڵ، ئەحمەدی باوکی و فاتێی دایکی و گەلێ کەس و شتی دیکەش. حاجی بووە بەڕۆڵەی کورد و خاکی کوردستان. وەک شاعیرێکی کلاسیکی هەموو ئەدگارەکانی شیعری قوتابخانەی باشووری کوردستانی نالی پاراستووە و پەرە پێ داوە. لە ناو جوانکاری ئەو قوتابخانەیە دوو شۆڕشی ناوەتەوە، یەکەمیان لە ناو شیعرە کلاسیکییەکە خۆی نوێگەرییێکی تازەی بەرپا کردووە لەگەڵ ڕۆژگارانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا بگونجێ کە شاعیرانی نەوەی دووەمی قوتابخانەی نالی لە ژیاندا بوون. دووەمیان ئەو شۆڕشە گەورەیە بوو لە ناوەڕۆکی شیعر لە دڵداری گۆڕییەوە بۆ سیاسەت و تەنگوچەڵەمەی ڕۆژانەی خەڵک و کێشەی ناو کۆمەڵ و مەسەلەی نەتەوایەتی کورد. بۆ ئەم مەبەسە قاڵبی کۆنی کێشی عەرووزی و یەکێتی قافیەی بەکارهێنا، بۆ دانانی بەردی بناغەی نوێکردنەوەی شیعری جووت قافیە (مەسنەوی) خستە کار. ئەم گوێزانەوەیە خۆی لە خۆیدا زیاتر ئازادی دایە شیعری کوردی.

وەک شاعیر حاجی دەبێ بەدوو کەسایەتیی جیاواز، یەکێکیان شاعیرە کلاسیکییە هەرە بەرزەکەیە، دووەمیان شاعیرە میللی و شەعبییەکەیە. لێرەدا لەبەر ئەوەی کەرەستە و ناوەڕۆکی شیعرە میللییەکانی لەگەڵ بینای شیعر ناگونجێن و زیاتر لەگەڵ پەخشان ڕێک دەکەون ناچار بووە بەم شێوازە بنووسێ و کەموکوڕی هونەری لە ناو شیعریدا هەبێ. بێ گومان خۆشی هەستی بەمە کردووە، کەچی وەکو خۆی دەڵێ مەبەسی ئەوە نییە ئەم شیعرانە لە ڕووی هونەرییەوە بەرز بن لای خەڵکی بەڵکو مەبەسی ئەوەیە لە ناوەڕۆکی بگەن و فێری بیرکردنەوە ببن، ئەمە پێوەندی بەچێژی شیعرایەتییەوە نییە.

حاجی کەسێکی شاعیر و زانا و سیاسی و ڕۆشنبیر و نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕی دڵسۆزی کورد بوو. دژی کۆلکە مەلا و شێخ و مێخی جامباز و سەرکردە و فەرمانڕەوای

دڵ ڕەق و پیـاو خـراپ بوو. حـاجی سـەری خـۆی هەڵـگرت و ڕووی کـردە ئەسـتـەمـووڵ و بڕیاریدا تا جەردە و ڕێگر و پیـاوکوژ و پارەپەرست بمێنن ئەو نەگەڕێتەوە. لە ئاوارەیی لە ئەستەمووڵ سەری نایەوە و نازانرێ لە کوێ نێژراوە، گۆڕی دیار نییە.

ئەگەر کورد بگاتە ئەو ئازادییـەی حـاجی خەباتی بۆ دەکرد ئەو کاتە دەکـرێ مـشـتـێک خۆڵی گۆڕستانەکانی ئەستەمووڵ بهێنرێتە کوردستان و خاکی کوردەواری بەخۆڵی ئێسک و پریسکی حاجی شاد ببێتەوە.

## بەشی هەشتەم

# فەقێ قادر

**١٨٣٠ - ١٨٩٠**

### ژیانی فەقێ

فەقێ ناوی قادر یا (عەبدولقادر) کوڕی ڕەسووڵ کوڕی جوامێر لە تایەفەی بەگزادە و تیرەی چەلەبی عەشرەتی هەمەوەندە. لە ساڵی ١٨٣٠ لە بازیان لە دایک بووە. هەواڵ هەیە ئەوە دەگەیەنێ لە گوندی قودرەتە لە دایک بووە.

سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت بووە، تا ئەو سەردەمە لە وڵاتی کوردەواری مزگەوت مەڵبەندی یەکەمی خوێندەواری بوو. وەک دەردەکەوێ فەقێ قادر قۆناغەکانی خوێندنی حوجرەی تەواو نەکردووە، ڕەنگە گەیشتبێتە قۆناغی موستەعیدی یا سوختەیی و دەستی لە خوێندن هەڵگرتبێ، لەوانەیە هەر ئەو وازهێنانەش بووبێتە هۆی ئەوەی لەقەبی «فەقێ» بۆ خۆی بهێڵێتەوە و وەک نازناو لە شیعریدا بەکاری بێنێ. جگە لەوە هەندێ جاریش وشەی «دەروێش»ی کردووە بەنازناو، ئەمەیان بەناوی ڕێزگرتن لە کاکەحمەدی شێخ بووە، چونکە ئەم زاتەی زۆر خۆشویستووە و خۆی بەمورید و دەروێشی ئەو داناوە لە تەریقەتی قادریدا.

فەقێ قادر لە سەرۆکەکانی عەشرەتی هەمەوەند بووە، ماوەیێک پلەی قایمەقامیەتی قەزای چەمچەماڵ و ناوچەی بازیانی پێ سپێررا بوو لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولعەزیزی عوسمانی (١٨٣٠ - ١٨٧٦).

ژیانی فەقێ قادر وەک سەرۆک خێڵێک ڕەنگدانەوەی ژیانی عەشرەتی خۆی بووە لە ڕۆژگارانی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی تۆتالیتاری ئۆتۆکراتی عوسمانی. جێگەی جوگرافی ئەم عەشرەتە یەگجار گرنگ بووە لە ستراتیجییەتی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی سوپایی، بێ گومان هەموو دەسەڵاتێکی ئەم ناوچەیە بەدەست عەشرەتی هەمەوەندەوە بووە. لە بابەت گرنگی ئەم ناوچەیەوە زانای گەورەمان تۆفیق وەهبی دەڵێ دەربەندی بازیان یەکەمین دەروازەیە لە گەرمیان و شاخی حەمرینەوە بۆ ناوچەکانی نێوەندی باشووری کوردستان. لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی عوسمانی هیچ جۆرە خزمەتێکی بۆ ناوچەی چەمچەماڵ



نەدەکرد و سەرەڕای ئەمە خەڵکەکەی دەڕووتاندەوە. عەشرەتی هەمەوەند ئازا و بزێو بوون، بەرهەڵستی زۆرداری دەوڵەتیان دەکرد. شەڕوشۆڕ بەبێ بڕانەوە لە ناوەوە بووە لە نێوان خەڵکی عەشرەتی هەمەوەند و دەسەڵاتی عوسمانی، ئەمە جگە لەو شەڕوشۆڕە هەمیشەییە وێرانکەر و بێ ئامانەی لە نێوان دەرەبەگەکانی ناوچەکە بووە و دەسەڵاتی عوسمانی کردوویەتی بەداردەست بۆ ئاژاوە نانەوە لە ناو کورداندا.

ئەم وەزعە وای کردووە چارەنووسی سەرۆکەکانی عەشرەت لەگەڵ هی خەڵکەکە یەک بگرنەوە و ببن بەیەک ئامانج. بەم جۆرە فەقێ قادر تووشی ئازار و ئەشکەنجە و کۆت و پێوەندی بەندیخانە بووە. لە ماوەی ساڵانی ١٨٨٥ - ١٨٨٧ ژیانی دیلی لە بەندیخانەکانی کەرکووک و مووسڵ و بەغدا بردۆتە سەر. ماوەی حەبسی و دەستبەسەری فەقێ قادر هەمووی بەسەریەکەوە نەبووە، هەندێ جار ئازاد کراوە و دووبارە گیراوەتەوە، لە جاری دیکەدا هەمەوەندان بەسەر بەندیخانەیان داداوە و فەقێیان ئازاد کردووە.

لەو ماوانەدا خۆی ون کردووە لە هەندێ شوێنەکانی کوردستانی ئێران دوور لە دەسەڵاتی عوسمانی، لە ناوچەکانی ماهیدەشت و زەهاو خۆی پەنا داوە. لەمەوە ئەوە دەردەکەوێ شەش حەوت ساڵێکی تەمەنی لە بەندیخانە بردبێتە سەر، زۆرترینی ئەم ماوەیە لە بەندیخانەی کەرکووک بووە.

لە ساڵی ١٨٨٧ فەقێ قادر لەگەڵ بەشێک لە بەگزادەی هەمەوەند و خەڵکی عەشرەتەکە دەسەڵاتی عوسمانی دووری خستوونەتەوە و ئاوارەی کردوون بۆ شاری بنغازی لە وڵاتی لیبیا، وا باوە گۆیا فەقێ قادر لە ساڵی ١٨٩٠ لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

### شیعری فەقێ

فەقێ قادر قۆناغەکانی خوێندنی سەردەمی خۆی تەواو نەکردووە، ئەوەی دیکە خۆ فێرکردە بووە. بەهوشیاری و زیرەکی توانیویەتی شارەزای دەوروبەری خۆی و گێتی دەرەوە بێ و زانیارییێکی باشی هەبێ لە بابەت مێژوو و بەسەرهاتی میللەتان و کاروباری مەدەنیەتی مرۆڤایەتی.

شیعری فەقێ قادر لە ڕووی ڕوخسارەوە بەزمانێکی ساکاری ئاسایی وتراوە، زمانێکە لە بنجدا دیالێکتی گۆرانییە. بەڵام بەدیالێکتی کرمانجی باکوور موتوربە کراوە و ئەدگاری ئەوی پێوە دیارە. لە ڕووی کێشەوە هەمووی لەسەر کێشی دە سیلابی و وەستانی لە ناوەڕاست دایە. لە بابەت قافیەوە، جووت قافیەیە (مەسنەوی) وەکو شیعری هەموو

شاعیرانی گۆرانزەمین. وشەی عەرەبی زۆر بەکارهێناوە، لەبەر ئەوەی زۆرینەی بابەتەکانی دەچنە ناو شیعری ئایینییەوە.

شیعری فەقێ قادر دەکرێ بەدوو بەشەوە:

**١- شیعرە درێژەکان (دەکرێ بەیتیان پێ بوترێ)**

ئەم بەشە شیعرەی هەمووی شیعری ئایینییە، لە شێوەی موناجات و کورتە حیکایەتی میللی و پەند و ئامۆژگاری ئایینی دەکەونە بەرچاو. فەقێ قادر هەر یەکێک لەو شیعرە درێژانەی بەکتێب یا (کیتاب) ناوزەد کردووە. بەشی هەرە زۆری ئەم کتێبانەی لە بەندیخانەکانی کەرکووک و مووسڵ و بەغدا نووسیوەتەوە، لە پاشانا محەمەد ڕەحیمی سماقلوویی بۆی پاکنووس کردووە.

کتێبە شیعرییە گرنگەکانی فەقێ قادر ئەمانەن:

١- کیتابی دروودنامە، ناوەڕۆکی ئایینییە، لەسەر شێوەی موناجاتە، لە ساڵی ١٨٧٨ نووسیویەتییەوە.

٢- کیتابی میعراجنامە، لە ساڵی ١٨٧٨ نووسیویەتییەوە.

٣- کیتابی فەزیلەتی بەنی ئادەم، لە ساڵی ١٨٨٢ نووسیویەتییەوە.

٤- کیتابی مەقالاتی ئەشعەری و جەبری و ڕەددی قەولی جەبرییان، لە ساڵی ١٨٨٣ نووسیویەتییەوە.

٥- کیتابی عەقیدەی ئیسلام، لە ساڵی ١٨٨٤ نووسیویەتییەوە.

ئەم بەرهەمانەی فەقێ قادر لە شیعری کوردیدا جێگەی دیاری خۆیان هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی ناوەڕۆکی ئەم شیعرە درێژانە لە لای شاعیرانی دیکەی کوردیش دەبینرێن بۆیە شیعرە کورتەکان (لیریکەکان) جێگەی تایبەتییان لە ئەدەبی کوردیدا هەیە.

**٢- شیعرە کورتەکان (لیریکەکان)**

شیعرە کورتەکانی فەقێ قادر نموونەی جوانی شیعری شاعیرانی گۆرانزەمینن لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە. لە ناو ئەو شیعرانەدا بابەتەکانی کلاسیکی بەرچاو دەکەون، لەمانە شیعری ئایینی (موناجات) و دڵداری و وەسف و بەهارنامە و ستایش و (بەتایبەتی ستایشی شێخ عەبدولقادری گەیلانی) و ئازاری بەندیخانە و ماتەمنامە و هی دیکە.



**نموونەی شیعری فەقێ**

- ١ -

بەناوی «بەهارنامە» لە لیریکێکیدا شاعیر دەڵێ:

ئازیز نەوبەهار
ئیحیا بی نەفەیز ئازیز نەوبەهار
مەنقووش بی فرووش زەمین نە سەد تار
زاتش جە سیفات نەورۆز بی ئیزهار
نیلی دا سەفحەی چەتر ئەخزەری
زیوەر کەرد زەمین شەمس خاوەری
بێ تەعلیم و ڕەنج بێ موزد و میننەت
عەرز و ست بەئەرز کەریم قودرەت
گولان نە هەوای هاموون وەردەن مەوج
زی ڕووح نەزینەت زەمین بەستەن فەوج
ناڵەی قومری یان نەغمەی عەندەلیب
سۆز عاشقان بێ ڕاز و شەکیب
ساقی یان سەرمەست بادەی خومارەن
مەستان نە عورووج وەسڵ دیدارەن
ڕشتەی فیکرشان چون تەلگرافەن
ڕای یەک لەحزەشان نە قاف تا قافەن
نیازم ئیدەن بەی خومارەوە
بەی ئاهەنگ بەزم نەوبەهارەوە
ئیحیا کەی نەورۆز زەمیر وەی تارە
ئازاد بام جە قەید کرمی ئەممارە
(فەقێ) حەسرەتمەند بێ قووەت ڕووح
ڕای حەقیق وەنەش چون مەبۆ مەفتووح

لەم شیعرەدا فەقێ قادر وەسفی بەهار دەکا، نەورۆز کراوە بەڕەمزی بەهار، واتە

سەردەمی خۆشی ئەو کەژە لەو ڕۆژانەدا دەکەوێتە ڕوو، کە نەورۆزی پێ دەڵێن. گوڵ لە دەشت و دەر و ئاوازی قومری و بولبول و سۆزی دڵداران ساقی و سەرخۆشانی عەشق میهرەجانی سروشت دەگێڕن. پیاو بۆی هەیە بەخەیاڵ بیر لەوە بکاتەوە فەقێ قادرە و لە ڕۆژانی نەورۆزدا لە دەروازەی دەربەندی بازیان وەستاوە و تەماشای ئەملا و ئەولای دیوی چەمچەماڵ دەکا و ئینجا دەنوارێتە ئەملا و ئەولای دیوی سلێمانی و گوڵ و گوڵاڵەی دەوروبەری «بەردە قارەمان» عەرش و قورشیان سەرخۆش کردووە. دیارە ئەو کاتە بەردەکە هەر لەوێ بووە، بەڵام هێشتا ناوی «قارەمان»ی لێ نەنرا بوو. شاعیر ئەم شیعرەی بەخەیاڵی ڕابردوو هۆنیوەتەوە ئەگینا شیعرەکە لە ساڵی ١٨٨٥ لە بەندیخانەی کەرکووک نووسراوەتەوە.

– ٢ –

لە بارەی جەژنی قوربانەوە فەقێ لە بەندیخانەی مووسڵ لە ساڵی ١٨٨٧دا دەڵێ:

عید قوربانەن نەداریم قوربان
قوربانی بە غەیر یەک ڕووح ڕەوان
ئەر قوبووڵتەن مەگیر بەهانە
چون یاران نیسار وێم کەم ڕەوانە
سەوابەن خەیلێ ئەر کەری قیساس
بەڵ جە کوورەی نار فیرەت بام خەلاس
تا کەی دڵ بەخار میحنەتان ئێشۆ
قامەت تا کەی بار خەجڵەتان کێشۆ
شەناوەری بەحر هیجرانان تا کەی
دیدەی ئینتیزار نیگەران تا کەی
هەرکەسێ نەقەیدو مەقسەدگای وێشەن
هەر کەس نە ئەفکار بەزمگای عێشەن
هەر کەس نە ئەقسای خوڕەم خەندانەن
غەیر جە من دڵ گەرم دیدەش گریانەن
قوربان (فەقێ) دڵ تەفریقەن خەیلێ
یا قوربانیش کەر یا پێش دەر مەیلێ



بێ گومان لە جەژنی قورباندا پێویستە قوربانی بکرێ. بابایێکی وەکو فەقێ قادر کەی قوربانی پێ دەکرێ، مەگەر گیانی خۆی بکا بەقوربانی. کەسێکی هەستیاری وەکو ئەو ناوەوەی دەروونی لە چی جۆرە مۆنۆلۆجێکدا بووە لەگەڵ خۆی لە ڕۆژی ئەو جەژنەیەدا! چی دەپرسێ و چۆن وەرام دەداتەوە و دەگاتە چی ئەنجامێک! هەندێ لەو ترپە پڕ لە سۆزانەی لە دڵی شاعیرەوە هەڵدەقوڵێن وێنەکانیان لەم پارچە شیعرەدا ڕەنگیان داوەتەوە.

– ٣ –

لە لیریکێکیدا فەقێ قادر داوای شەراب دەکا لە مەیگێڕ:

ساقی سا دەی مەی باوەر پەیاپەی
سەحرای دڵ تا کەی بێ مەی بۆ چون بەی
موتریبان سەف سەف کەف بدەن نە دەف
بەشق شای نەجەف دڵ کەن بەهەدەف
گەرم کەن ئاهەنگ بەرز کەن سەدای زەنگ
دەنگ زەنگ بەرز کەن فرسەنگ بەفرسەنگ
نە شۆر نەشئەی شورب شەرابی
نە گرمەی تەمبوور تار روبابی
بخرۆشۆ دەماغ بجۆشۆ زەمیر
هۆش مەدهۆش دەنگ جە نونق و تەقریر
بەڵ جە سایەی شۆر بەزم ئارای ئازیز
زەنگ دڵ وەزاخ بادە بۆ تەمیز
بەتەئسیر نەزم بەستەی عیراقی
ئازاد بام جە نار کوورەی فیراقی
شیر بەچەی دڵ وەسڵ مەتلووبەن
جە لای ڕووح سرووش حەیی مەحبووبەن
(فەقێ) دڵ نە شەوق بادە باقییەن
مونتەزیر بەلوتف غەمزەی ساقییەن

لەم شیعرەدا فەقێ قادر پەردەی شانۆ دەگۆڕێ، دەیکا بەدیمەنی کۆڕی عاشقان لە گۆشەی مەیخانەدا. مەیگێڕ گەورەیە و پیری موغانی کۆبوونەوەیە. یاران و دەنگبێژان بەعەشقی

ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالیب ئاهەنگ گەرم دەکەن و بەئاوازی مۆسیقا و خوڕەی مەی و نەغمە و بەستەی مەقامی عیراقی مەی دەنۆشن. لەوانەیە فەقێ قادر کەم هەنگامی خۆشی وای دیبێ و دڵ و دەروونی تاوێک لە ئازار دوور کەوتبێتەوە.

- ٤ -

فەقێ قادر شیعرێکی هەیە بەناوی «جەنگنامەی زستان و بەهار» لە بەندیخانەی کەرکووک نووسیویەتییەوە.

سەرەتا بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

شای زمستانەن
کەوکەبەی نەبەرد شای زمستانەن
جولووس جورعەی جام جیهانەن
ڕەزم و مەعرەکەی باد و تۆفانەن
سوڵتان پاییز نە تەخت بی مەعزوول
نەمەند جە ئافاق تۆز و گەردەلوول

شاعیر باس لەوە دەکا کەژی زستان دەستی پێ کردووە، تۆز و گەردەلوول لەگەڵ پاییز ئاوابوون و شوێنەواریان نەماوە و ئێستا جەنگی تۆفان و ڕەشەبایە. ئینجا دەکەوێتە باسی زستانی سەخت:

سەردیی هەناسەی باد سەر کۆهان
تەئسیر دا نە خەت توڕڕەی کاکەشان
جە شەرارەی بەرف کوورەی زەمهەریر
نەمەند جە ناڵەی عاشقان تەئسیر
شاهان بێ ڕەونەق تاجر نەستەم
موفلیسان مەقهوور مونعیمان ماتەم

ساردی هەناسەی بای سەر کێوان گەیشتۆتە کاکێشانی فەلەک. سەهۆڵبەندانی بەفر زەمهەریرێکە ناڵەی عاشقانی بڕیوە. شاهان بێ هەوەسن، بازرگانان لە گۆڕەپانی زوڵم و زۆری دان، بێ پارە غەمگینن، دەوڵەمەند بێ هۆشن.

ئینجا باس لە زستان دەکا لە هەندێ وڵات و ناوچەکانی گۆی زەوی:



چون بی خەبەردار خێزا زمستان
هەرسەک و بولغار قرم و کوردستان
قارس و بایەزید بەند ئەنادۆڵ
مەحکەم کەر سەنگەر بەسەلج و سەهۆڵ
ئاکرێ شۆربەڕێژ ئاکۆ شەختەبەند
قەندیلو گودروون کەرد بەقەلعەی قەند
شاهۆ قایم کەرد هەورامان مەحکەم
دەماوەند چەنی بلووج کەرد وە تەم
قایم کەرد گەردەن کۆهـ کەشکەمیر
دا وە بێستوون زەڕ زەمهەریر

فەقێ قادر ناوی کۆمەڵێک وڵات و ناوچە و شاخ دەبا، ئەو جێگانە ڕەمزی زستانی سەخت و ساردن، هەریەکەیان ئەدگاری تایبەتی خۆی هەیە لە سەرما و بەفر و باران و سەهۆڵبەندان. ئەم ناوانە لە شیعرەکەدا هاتوون: هەرسەک، بولغار، قرم، کوردستان، قارس، بایەزید، ئەنادۆڵ، ئاکرێ، ئاکۆ، قەندیل، پیرەمەگروون، شاهۆ، هەورامان، دەماوەند، بلووجستان، کەشکەمیر، بێستوون.

ئینجا فەقێ قادر دێتە سەر باسی بەهار و دەڵێ:

نە هەر لا گوڵان خەیمە وە پا کەرد
زەمین لا جیوەرد حەسنا و حەمرا کەرد
جە عەتر سۆسەن نێرگس و نەسرین
هەوا موعەتتەدیل هاموون عەنبەرین
ئەبلەق کەرد نەبات بەنەفشەی چەمەن
لالەی شەقایق گوڵ یاسەمەن
نە ئوردی بەهیشت خەیمە کەرد وە پا
بەزر میسک و عوود زەعفەران پاشا
شاخەی شەتاوان سەردان نە هەر جا
سەر زەمین ڕەنگین هەوا ڕووح ئەفزا
نەورۆزی شەست پەڕ ئەوراد نەیسان
سەف سەفو فەوج فەوج وە سەفحەی جیهان

لەم دێرانەدا فەقێ قادر دەکەوێتە وەسفی گوڵ و گوڵاڵە و بەزم و ڕەزمی بەهار و نەورۆز، ئەوجا بەم دێرانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

پەی کەسێ وەشەن سەیرانگای ڕەبیع
زیوەر بۆ قەڵبش نە زەوق تەبیع
ئەسباب بەزمش هەردەم نە کار بۆ
شەو خەیمە نۆشین ڕۆ نە شکار بۆ
ساحێب تاج و تەخت فەڕ و ئیقبال بۆ
هەمرازش مەحبووب دوو هەفتە ساڵ بۆ
نەک چون من نە بەند تورک بەد نەژاد
نە تەشویشەی دڵ هەردەم نە فەریاد
(فەقێ) دڵ دەوران دنیا عەیانەن
گا نەوع بەهار گا زمستانەن

لەم دێرانەدا فەقێ قادر ئەوە ڕوون دەکاتەوە بەهار بۆ ئەو کەسەیە دڵشاد و گوشاد بێ، شەو و ڕۆژ لە خۆشیدا بێ، خاوەن ماڵ و سامان بێ، وەک من ژێردەست و کۆیلەی تورکی بەد نەژاد نەبێ. ئیتر لەگەڵ خۆی دەدوێ و باسی شتێک دەکا لای هەموو کەسێک ئاشکرایە. دەمێک زستانە و دەمێک بەهارە، دەمێک خۆشییە و دەمێک ناخۆشی. ژیانی ئادەمزاد بەم جۆرە بەڕێوە دەچێ.

***

فەقێ قادری هەمەوەند نموونەی شاعیرێکی کوردە لە دوو مەیداندا مێژووی ئەدەبی کوردی ڕەنگین کردووە.

یەکەمیان ئەدەبی ئایینی بەتایبەتی موناجات و میعراجنامە کە دەچێتە ناو چیرۆکی ئایینی ئەفسانەئامێز و ڕۆمانتیک شێوازەوە. میعراجنامە لە ناو نەتەوە موسڵمانەکانی سەر ڕووی زەوی و هەندێ بەرهەمی شیعری ئایینی لە ناو میللەتە مەسیحییەکانی ئەوروپا کە لە میعراجنامە دەکەن، بەڕاستی ئەدەبی نەتەوەکانی گێتییان دەوڵەمەند کردووە، ئەم جۆرە بەرهەمەی وەکو میعراجنامەکەی فەقێ قادر لاپەڕەیێکی زێڕینە لە ئەدەبی کوردیدا.

دووەم کاری ئەدەبی فەقێ قادر شیعرە لیریکییەکانیەتی. لەم لایەنەوە شاعیر لە دۆخی



خاسیەتەکانی شیعری شاعیرانی گۆرانزەمین نەچۆتە دەرەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەمێکی خستۆتە ناو ئەدەبی کوردییەوە بۆن و بەرامەی خۆی هەیە. پێویستە ئاگاداری ئەوەش بین فەقێ قادر کەسێکە ئازاری چەشتووە و لە بەندیخانە ژیاوە و ئاوارەی هەندەران کراوە، لە باکووری ئەفەریقا سەری ناوەتەوە. ئەم هەموو مەینەتییە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووبێ کە شاعیر بووە، لەبەر ئەوە بووە کە کورد بووە.

## بەشی نۆیەم

# مەحوی

**١٨٣١ - ١٩٠٦**

## مەحوی و شیعر

### ژیانی

لە بەینی نوور و زوڵمەت ئاموشۆ سەر ناگرێ مەحوی
نیگارم بۆیە پێمی وت لە من هاتن لە تۆ ڕۆیین

ناوی محەمەد کوڕی شێخ عوسمانی باڵخییە. ئەم گوندە کەوتۆتە ناوچەی ماوەتی سەر بە وڵاتی سلێمانی. لە ساڵی ١٨٣١ لە شاری سلێمانی لە دایکبووە. لە سەرەتای ژیانی ئەدەبیدا ناوی «مەحوی» وەک نازناو لە شیعریدا بەکاری هێناوە. ئەم شاعیرە لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا بەناوی «مەشوی»ش ناسراوە.

خوێندنی بەرایی لە لای باوکی بردۆتە سەر. لە دواییدا بووە بەقوتابی مەلا گەورەکانی ئەو سەردەمە لە شارانی سنە و سابڵاغ (مەهاباد). بەپێی دەستووری خوێندن لەو ڕۆژگارانەدا فەقێ ناوە ناوە لە جێی زێندەگانی خۆی دوور دەکەوتەوە لە پێناوی تەواوکردنی خوێندن لە جێگەیێکی دیاریکراودا. لە دوای ئەوە دەگەڕایەوە شوێنی خۆی، ئەوجا جێگەیێکی دیکەی دیاری دەکرد. بەم جۆرە فەقێ محەمەد کە لە کوردستانی ئێران دەگەڕێتەوە سلێمانی ئەم جارەیان ڕوو دەکاتە بەغدا و دەبێ بەقوتابی محەمەد فەیزی زەهاوی، خوێندنی زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی لە لای زەهاوی تەواو دەکا هەر لە لای ئەویش لە ساڵی ١٨٥٩ ئیجازەی دوازدە عیلمی وەردەگرێ.

بۆ ماوەیێک لە بەغدا دەمێنێتەوە و دەکرێ بەئیمامی مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم (ئەبوحەنیفە) لە بەغدا، تا ساڵی ١٨٦٢ پشتی لە بەغدا کردووە و ڕووی بەرەو سلێمانی و گەڕاوەتەوە نیشتمان. لە سلێمانی بووە بەئەندامی دادگا، تا ساڵی ١٨٦٨ مووچەخۆری میری عوسمانی بووە، لەو ساڵەدا کە باوکی کۆچی دوایی کردووە وازی لە کاری میری هێناوە بۆ ئەوەی لە جێی باوکی دابنیشێ و خۆی بەکاری خوێندن و پێگەیاندنی فەقێیان



لە مزگەوت خەریک بکا.

کۆمەڵێک مەلای ناوداری کورد لە سەردەمێکدا قوتابی مەحوی بوون، لەمانە مەلا حەسەنی قزڵجی، مەلا مەحموودی مەزناوەیی، مەلا سەعیدی نائیب ئۆغلی کەرکوکی، مەلا عەزیزی مفتی سلێمانی و هی دیکە.

شێخ محەمەدی خاڵ ئەوە دەگێڕێتەوە گۆیا مەحوی لەگەڵ کۆمەڵێک مەلا لە سلێمانییەوە لە ساڵی ١٨٧٤ ئاوارەی بەغدا کراون، بەڵام هۆی ئەم مەسەلەیە نەزانراوە. لە ساڵی ١٨٨٣ مەحوی حەجی کردووە، لە ڕێی گەڕانەوە سەرێکی لە ئەستەمووڵ داوە. گۆیا لەو گەشتەیدا چاوی بەسوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی کەوتووە. سوڵتان پاداشی کردووە بەوەی فەرمانی دەرکردووە خانەقاییێک بۆ مەحوی دروست بکەن بۆ ئەوەی ئیرشادی تەریقەتی نەقشبەندی تیایدا بگەیەنێتە ئەنجام، هەروەها دەسەڵاتی عوسمانی مووچەی بۆ کارگەرانی خانەقای مەحوی بڕیوەتەوە.

لەم باسەدا پێویستە ئەوە بزانرێ بەهۆی ئەوەی «شەریعەت» (ئایین) «تەریقەتی» (سۆفیزمی) داگیر کرد و بۆ چاکەی خۆی بەکاری هێنا، لە دوای بڵاوبوونەوەی هەردوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندی لە کوردستاندا، دەسەڵاتی عوسمانی هەوڵی دەدا پێوەندی لە نێوان شەریعەت و تەریقەت بەهێز بکا، هەروەها لە لایێکی دیکەوە ئاگری دوژمنایەتی لە نێوان تەریقەتەکاندا خۆش بکا بۆ ئەوەی بتوانێ بۆ چاکەی خۆی بەکاریان بێنێ.

جا مەسەلە لێرەدا لەم ڕووەوە تەنیا خزمەتی مەحوی نەکراوە، بەڵکو خزمەتی هەموو ئەو مەلا و شێخانە کراوە لە دوای شێخ مارفی نۆدێ و شێخ خالیدی شارەزووری نەقشبەندییەوە بەناوی تەریقەتی قادری و نەقشبەندی ڕێکخراوی دەروێشییان دروست کردووە. ئەو مەلا و شێخانە دەسەڵات و هێز و توانا و دەوڵەمەندییان لە سایەی دەوڵەتی عوسمانییەوە بووە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار درز کەوتۆتە نێوان چاکە و بەرژەوەندی شێخ و مەلای کوردی پارێزەری ئایینی ئیسلام و دەوڵەتی عوسمانی بەم جۆرە ڕاپەڕین و شەڕوشۆڕ کەوتۆتە ناوەوە. ئەمە لە مێژووی سیاسی نەتەوەی کورددا باسی لێوە دەکرێ.

مەحوی لە دوای گەڕانەوەی لە ئەستەمووڵ خانەقای بەڕێوە بردووە، خەریکی ئیرشادی سۆفییان و وانە وتنەوەی فەقێیان بووە تا ساڵی ١٩٠٦ کۆچی دوایی کردووە و لە یەکێ لە ژوورەکانی خانەقای خۆی نێژراوە.

## شیعر

### کێش

مەحوی یەکێکە لە شاعیرە کەمەکانی کورد کە زۆرترین بەحرە عەرووزییەکانی کێشی عەرەبی بەکارهێنا بێ. لە شیعری مەحویدا ئەم بەحرانە دەبینرێن: هەزەج، موزاریع، رەمەل، موجتەس، خەفیف، بەسیت، موتەقاریب، ڕەجەز. لە بەشی هەرە زۆری شیعری دا سێ کێشی هەزەج و موزاریع و ڕەمەلی بەکارهێناوە. لە شیعرەکانی دیکەیدا لە تاکە شیعرێکەوە تا نزیکەی یازدە شیعری کێشەکانی تری بەکارهێناوە.

### قافیە

مەحوی یەکێکە لە شاعیرە دەگمەنەکانی کە هەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی بۆ قافیەی شیعری بەکاری هێناون، واتە هەر (٢٨) تیپی ئەلفوبێی عەرەبی، کەچی لە دەنگە کوردییەکان تەنیا دەنگەکانی «چ، ژ، گ، ێ»ی بەکارهێناوە. بەم ڕەنگە (٣٢) دەنگی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی بەکارهێناوە بۆ قافیەکانی.

لەم لایەنەوە شاعیر بایەخی زۆری بەپاش قافیە داوە، واتە ئەو وشە و نیوە ڕستە و ڕستانەی لە دوای دەنگی قافیە لە هەر شیعرێکدا لە سەرەتای شیعرەکەوە تا دوایی لە نیوە دێری دووەمی پارچە شیعرەکە دووبارە دەکرێنەوە. ئەگەر بەوردی سەرنج بدرێتە پاش قافیەی مەحوی ئەم وشە و نیوە ڕستە و ڕستانە بەرچاو دەکەون: خودا، چبکا، بکا، شکا، دەکا، ئەمما، بڕوا، غایب، قات، حەیات، دەست، مەست، بۆت، کەوت، بۆچ، هیچ، کرد، مەلاز (ملاذ)، ئەلعەیاز (العیاذ)، ڕۆژ، بەس، بەکەس، خۆ، خوسووس، قەت (قط)، زایع (ضایع)، مەخلووق، میسک، گەرەک، حەرام، کە من نەمام، دەگرم، چاوم، چووم، نەکەم چبکەم، دەکەم، زوبان (زمان)، چوون، چین، ڕۆیین، شەو، حەرامە، بۆچییە، چارێ، دزی، دەدوێ، لە نوێ، هەی!.

### ڕیتم و مۆسیقا

بەگشتی لە شیعری مەحوی هەست بەڕەوانی ڕیتم و مۆسیقا ناکرێ. ئەم دیاردەیە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بەشێکی زۆر لە کێشە عەرووزییەکانی لە بەحرە قورسەکانن، ئەمە زیاتر لەو شیعرانەدا دیارە کە لەسەر کێشی هەزەج و ڕەمەل نەهۆنراونەتەوە، زیاد لەسەر ئەمەش شاعیر وشەی نەبیستراو و دەنگ بەهێز بەکار دێنێ، لە سەرووی ئەمانە



هەموویانەوە وشەی عەرەبی و بێگانەی دیکەی نەبیستراو وەردەگرێ. ئەم هۆیانە هەموویان بەیەکەوە تۆنی ڕیتم و مۆسیقای ڕستەکان قورستر دەکەن، لەبەر ئەوە ئاوازی شیعرەکانی سەرت دەکەوێتە بەر گوێ، وەکو وێنەیێکی جوان بەسومبە (قەڵەمی ئاسن) و چەکوشی هونەروەرێکی گەورە لەسەر بەردی غارا کێشرا بێ وا دەکەوێتە بەرچاو.

### ڕەوانبێژی

مەحوی وەک ڕۆشنبیرێکی شارەزا لە زمانی عەرەبی و شەریعەتی ئیسلام و زمانانی دیکەی هاوسێیانی کورد، بایەخێکی زۆری بەڕەوانبێژی ئەدەبی عەرەبی داوە، بێ گومان ئەو ڕەوانبێژییەی لە ئەدەبی کوردیشدا بەگشتی ڕەنگی داوەتەوە بەزۆری لەو وشە و ڕستە عەرەبییانەدا بەرجەستە بووە کە شاعیر لە شیعری کوردیدا بەکاری هێناون.

لە گەلێ جێگەی شیعریدا مەحوی وەستایەتی نواندووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە داهێناندا لەم ڕووەوە لە شاعیرانی پێش خۆی نەچۆتە دەرەوە و داهێنانی لە پلەی ئەوان دایە لە هەردوو باری کە هەست بەداهێنان دەکرێ لە بەرهەمی شیعری مەحویدا، واتە وێنەی تازەی دروست کردووە، کەس بۆی نەچووە، یا ئەوانەی پێش خۆی دووبارە کردۆتەوە، بەڵام بەداهێنانێکی نوێ کەوتوونەتە ناوەوە.

لە هەندێ جێگە مەحوی بەرهەمی شیعری لە ناو تەمومژی تێکهەڵکێش (تضمین) و وەرگرتن (إقتباس) خنکاندووە بەتایبەتی وەرگرتن لە قورئان. سەیرە مەحوی بایەخی بەحەدیس نەداوە، کەچی بایەخی زۆری بەپێغەمبەر داوە. جگە لەمە ڕستەی ناکوردی لە شیعریدا تا ڕادەیێک گران دەکەوێ لە گوێی گوێگری کورد، بەتایبەتی کە هارمۆنیا دروست نەبێ لە نێوان زمانە کوردییەکەی شیعر و ئەو وشە و ڕستانەی بەزمانی بێگانە خراونەتە ناو شیعرەکانەوە.

### ئایین

دیوانی مەحوی کۆمەڵێک قەسیدە دەور دەکاتەوە، زۆربەیان بەناوەڕۆک دەچنە ناو دەلاقەی شیعری ئایینییەوە. بەواتایێکی دیکە شیعرە ئایینییەکانی هەموویان بەقەوارە درێژن:

١- قەسیدەی «عقد العقائد» (ملوانکەی باوەڕ) لە سەد و سی و شەش دێرە شیعر پێکهاتووە، لە ڕووی قافیەوە کراوە بەچوار بەش، دوو بەشیان لەسەر قافیەی «ان» و «ین» هۆنراونەتەوە، دووانەکەی دیکەیان لەسەر قافیەی «وون» دانراون.

سەرەتای قەسیدەکە ئەم دێرانەیە:

مەسئوولمە ئیعانە لە وەهھابی موستەعان
هەر لەو دەکەم سوئال و دەکەم حەمدی ئەو بەجان
تەوفیقی لێ تەڵەبمە بکەم خدمەتێ بە دین
مەئموولە خولاسەی ئەمالی بکەم بەیان
چەند گەوهەرێ لە جەوهەرە زەم بەو ئالییە
نەزمی بکەم بەکوردییەکی سیرفی جوملەزان

لەم شیعرەدا وشەی «ئەمالی» عەرەبییە، کۆی (الاملاء)ە. چەند کتێبێک بەم ناوەوە بەزمانی عەرەبی هەیە. لێرەدا مەبەستی مەحوی کتێبێکە بەم ناوەوە لە بارەی شەریعەتی ئایینی ئیسلامەوە.

دوایی قەسیدەکە بەم دێرانە هاتووە:

هەرکەس بەجان و دڵ لەبەری بێ لەبەریەتی
ڕووحێکی وا کە غەیبی نەکا ڕەیبی سەد مەنوون
بەو ڕووحەوەم خودا ببەیە بەر حوزووری خۆت
هەم خۆم و هەم ئەوانە کەخۆن و کەنێک خوون
باقی لە فەزڵی خۆتەوە سەر ڕووحی ئەحمەدی
نازیل بکەی سەڵات و سەلامی لە حەد فزوون

ئەو برە شیعرە نموونەییێکە بۆ بەکارهێنانی وشە و زاراوەی زۆری عەرەبی. خوێندەوار جگە لە گوێی مۆسیقی و چێژی شیعرایەتی پێویستی بەزانیارییێکی ئەنسیکلۆپیدی دەبێ بۆ تێگەیشتنی مانای وشە و زاراوەکانی کە مەحوی لە شیعریدا بەکاریان دێنێ.

٢- قەسیدەی «سوبحانە ئەو خودایە» لە بیست و سێ دێرە شیعر پێکهاتووە، مەحوی بەم شیعرانە قەسیدەکەی دەست پێ دەکا:

سوبحانە ئەو خودایە کە عەقڵی پەیەمبەران
دەرکی نیانە غەیری بە بەر دەرکیا گەران
سوبحانە ئەو خودایە کە دانانتری زەمان
دێوانەیە و لە مەعریفەتی کونهیا نەزان
سوبحانە ئەو خودایە کە کەڕڕووبییانی عەرش
وەک ناسی قوڕ بەسەر بە نەناسینی مویتەلان



لەم شیعرەدا وشەی «کەڕڕووبی» هاتووە، ئەمە لە حیکایەتی ئەفسانەی ئایینیدا دەڵێ: کۆمەڵێک مەلایکەتن، لە خوداوە زۆر نزیکن لە دەوروبەری عەرشدا خەریکی تەهلیلە و عیبادەتن.

بەم شیعرانە مەحوی کۆتایی بەقەسیدەکەی هێناوە:

(مەحوی) ئەدەب خەمۆشیی و مەحوبییەتە لەگەڵ
نەسرەتنێکی یەعنی بەدەم دەردەوە گلان
گریەی بەکوڵ بەدڵ لە خەرافاتی خۆ خەجل
ناڵەی دڵی شەوان و هەناسەی سەحەرگاهان
هەر ئەو هەناسەیە کە بدا فێنکی بەدڵ
بەو تاقە ناڵەیە کە بگا گەرمییێ بەگیان

٣- قەسیدەی «خودایا!». مەحوی شیعرەکەی بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

خودایا! ئیرادەی موناجاتمە
نیازی دوو سێ عەرزی حاجاتمە
بەدەرباری فەزڵتە ئیلتیجام
بەڕەحمەت نیشانم دە ڕێگەی نەجام

بەم دێرانە دوایی بەشیعرەکەی دێنێ:

بە(وەلعادییات) ئەسپی هیممەت دەوان
بەڕێی عیشق دا تا سەحەر شەب ڕەوان
بە(وەلعەسر)ی ئەو عەسرە فەڕڕوخ زەمەن
کە ناوی بەعەسری سەعادەت دەبەن

ئەم شیعرە لە قەسیدە کورتەکانی مەحوییە، ئەوەی مایەی سەرنجدانە لەم شیعرەدا ئەوەیە مەحوی سیستێمی جووت قافیە (مەسنەوی) (ا ا، ب ب، ج ج...) بەکارهێناوە بۆ شیعرەکە، کەچی لە غەزەل و قەسیدەی کوردستانی باکوور و باشووردا (قوتابخانەی مەلای جزیری و نالی) ئەم جۆرە قافیەیە بەکار نەهێنراوە. تەنیا ئەوە هەیە جووت قافیە لە شیعری کلاسیکی کوردستانی باکوور و شیعری میللی سەرزاری کوردستانی باشوور و شیعری گۆرانزەمێن بۆ چیرۆکی شیعری بەکار دەهێنرێ. وەک «مەم و زین» و «یووسف و زولەیخا» و «شیرین و خوسرەو» و «لەیلا و مەجنون» و هی دیکە.

هەروەها لەم بڕە شیعرەدا ئاماژە هەیە بۆ هەندێ لە سورەتەکانی قورئان و لە بنجدا شیعرەکەی بۆ ئەم مەبەسە هۆنیوەتەوە.

٤- قەسیدەی «بەحری نوور» ئەم قەسیدەیە لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی مەحوییە، چونکە کۆمەڵە شاعیرێکی دیکەش پێڕەوی نەعتەکەی نالییان کردووە، شاعیر لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ:

(وە سەلەڵڵا عەلا) ئەو بەحری نووری عیلم و عیرفانە
کە دەرکی غەوری ناکا (غەیرو عیلمیلڵاهی سوبحانە)
(وە سەلەڵڵا عەلا) ئەو زاتی پاکی قودسی ئایاتە
کە ئەخلاقی پەسەندیدەی جەنابی حەبیبی مەننانە
(وە سەلەڵڵا عەلا) ئەو حەزرەتەی ساحیب کەمالاتە
کە ئەعلا موعجیزە قوربانی بم من نووری قورئانە

مەحوی بەم دێرانە کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

سەبا تا لێوی غونچەی گوڵ دەکاتە عیلمی شەککەرخەند
نەسیمی سوبحدەم تا پەرچەمی سونبول دەکا شانە
هەتا هەوری بەهاری غازەکاری گوڵشەنە ئیشی
هەتا بولبول لەسەر گوڵ نەغمەخوان و نالە سەنجانە
بلێن ئینس و مەلەک پڕ بەم زەمین و ئاسمانانە
(وە سەلەڵڵا عەلا) ئەو بەحری نووری عیلم و عیرفانە
کە دەرکی غەوری ناکا (غەیرو عیلمیللاهی سوبحانە)

مەحوی لەم شیعرەدا و کۆمەڵێکی دیکە لە شاعیرانی کورد لەسەر کێش و قافیەی نالی لاسایی شیعرە بەناوبانگەکەی نالییان کردۆتەوە کە دەڵێ:

ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا هەتا کەی حیرسی وێرانە
لەگەڵ ئەم عیشقبازانە بڕۆ ئازانە بازانە

مەحوی نەک تەنیا لە کێش «هەزەجی هەشتی تەواو = هەشت جار مفاعیلن» و قافیە لاسایی نالی کردۆتەوە، بەڵکو لە مانا و وێنە و ڕستە و لێکسیکۆن لە دەوروبەری داهێنانەکانی نالی دەسووڕێتەوە، بەڵام وەنەبێ وەستایەتی شاعیر لەبەرچاو نەبێ. جگە لەوە هەموو ئەو شاعیرە کوردانەی لاسایی نالییان کردۆتەوە لەگەڵ مەحویش هونەریان



نواندووە لە شیعرەکانیاندا. داهێنانیان لەبەرچاوە، بەڵام هیچ یەکێکیان نەگەیشتۆتە ئەو پلە ئیستێتیکی و هونەرییەی نالی لەو شیعرەدا دروستی کردووە، لەبەر ئەوە قەسیدەکەی نالی بووە بەبەردی بناغە لە ئەدەبی کوردیدا بۆ هەموو ئەوانەی لاساییان کردۆتەوە.

٥- قەسیدەی «دڵم ئەمشەو». مەحوی ئەم شیعرەی بۆ ستایشی شێخ خالیدی شارەزووری نەقشبەندی وتووە.

شیعرەکە بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

دڵم ئەمشەو نەخۆشی نیسبەتی چاوێکی بیمارە
جیگەر غەڵتانی خوێنی حەسرەتی لێوێکی خوونخوارە
سەرم شێواوی شێوەی فیتنە هەڵگیرسێنی شۆخێکە
حەواسم تەفرەقەی عیشوە دڵ ئاشووبێکی عەییارە
خەیاڵی زولفی دەرناچێ لە دڵ تا دەرنەچێ ڕووحم
سپێراوە خەزێنەی بەختی ئێمە بەو سیا مارە

مەحوی بەم دێرانە دوایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

بەیومنی ئەو بەهارە پاییز و زستان و هاوینم
کە هەر گاهێ بکەم بەحسی لە دەورم گوڵ بەخەروارە
بەئیخلاسی ئەوم ئاوێنەکەی دڵ وا جەلادراوە
کە چەهرەی شاهیدی مەقسوودمی تێدا نموودارە
جەمالی ڕابیتەی وا دڵ بەرە بەختی خەواڵووشم
بەئومێدی تەماشایێک هەمیشە چاوی بێدارە

کردەوەیێکی سروشتییە ئەگەر مەحوی لەمەش بەکوڵتر ستایشی شێخ خالیدی نەقشبەندی بکردایە، چونکە هیچ سنوورێک لە گێتی سۆفیزم لە لای مەحوی نییە ئەم شێخەی خۆی تێدا نەبێ. لە دوای پێغەمبەر شاعیر وەک مەلاییێکی شەریعەت و شێخێکی تەریقەت هەموو «بوون»ی لە شێخ خالید کۆکردۆتەوە (یەکێتی بوون)، بەپێچەوانەی شێخانی دیکە هەندێکیان نەک تەنیا ڕێزیان لە هەموو تەریقەتەکان و شێخەکانیان ناوە، بەڵکو بۆ موجامەلەش بێ دوو تەریقەتەکەی کوردستان قادری و نەقشبەندی لەگەڵ ئەوەی جیاوازی فیکری و ناخۆشیش لە نێوانیاندا بووە هەندێ جار ڕێزیان لە یەکتری ناوە.

## غەزەل

غەزەل بەهەردوو مانای جێگەی دیاری لە دیوانی مەحویدا هەیە. یەکەمیان بەمانای ڕوخساری شیعر لە ڕووی ژمارەی دێرەکانییەوە، بەشی هەرە زۆری دیوانی مەحوی بریتییە لەم بابەتە، واتە ئەو شیعرەی ژمارەی دێرەکانی لە دوازدە کەمتر دەبێ. هەرچی مانای دووەمی «غەزەل»یشە ئەویان پێوەندی بەناوەڕۆکەوە هەیە، واتە بەمانای دڵداری و خۆشەویستی و ئەڤین هاتووە. لەم ڕووەوە بەشێک لە شیعری مەحوی بەتایبەتی دڵداری و وەسف دەچنە ناو ئەو بەشە شیعرەی کە دڵداری زەمینی یا مەجازی پێ دەڵێن، دلبەرەکەی مەحوی هەر ئەو کچە جوانەیە کە بووە بەبووکی شیعر لای زۆربەی شاعیرانی کلاسیکی.

بۆ بەڵگە مەحوی دەڵێ:

خەلاسی بوونی قەت ناوێ ئەسیری زولفی زنجیرت
لەبەر تیرت مەلەک بێ هەڵفڕێنێ نەبووە نەخچیرت
موژەت قوللابی گیرا زولفی دڵگیرت کەمەند ئاسا
مەحاڵە بەر گرێ یا بەر ببێ کەس کەوتە بەر گیرت
لە ناوا باسی تۆبەی تۆ بوو ئەمڕۆ ئەی ستەمگەر شۆخ
بخە ئەم تۆبە پاشی کوشتنی من تۆ بی یو پیرت
بەدەنگی ناڵەوە هات ئەو دەمە ڕووح هاتە سەر لێوم
بڵێ ئەی ناڵە ئاخر ئێستە من چبکەم لە تەئسیرت
لە چینی پەرچەما نووری جەبینی دی وتی زاهید
کە سووتا دامی تەزویرم بەنووری دامی تەنویرت
فەزیلەی ئەسڵ و فەسڵ ئینسانی پێ نابێ بەساحیب فەزڵ
کە تۆ کۆسەی بەتۆ چی مامەڕیشی باب و باپیرت
لە خاکی پاکی ئەو بەردەرکەدا گەوزا ڕەقیب ئامان
دەری کە حەیفە گووراسن خەسارەت دا لە ئیکسیرت
لەبەر باری مەحەببەت ئاسمان و ئەرز دەناڵێنن
چییە ئەم دەعوییەت زاهید جلی لێ بارە گا پیرت
شوکور (مەحوی) کەوا موددێکە ناوی چوو بووە نیسیان
لە زومرەی وەعدی کوشتن هاتووانا هاتەوە بیرت



ئەم شیعرە وەک وەسفێکی ڕووکەشی دلبەرێک دەکەوێتە ڕوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا مەحوی لە هەوای سۆفیزم ڕزگاری نەبووە، بەڵام ئەو مانا و وێنانەی بۆنی داهێنانی سۆفیزمیان لێ دێ لە ناو وەسفە ڕووکەشەکەدا بزربوون، لەبەر ئەوە شیعرەکە وەک وەسفێکی دڵداری دەمێنێتەوە.

لە غەزەلێکی دیکەیدا مەحوی دەڵێ:

بەسورمە بۆیە دلبەر خەنجەری موژگانی دا پەرداخ
دڵی هەڵناگرێ ببیێ لە کوشتە دەنگی ئۆف و ئاخ
بەتیرێ کوشتمی هەڵیاوەسیم سووتاندمی ڕۆیی
دوعا بۆ حیفزی کەن کێ دیویە جانانە وا گوستاخ
گوڵ و لالەی کەژ و کۆ، کۆهکەن دێنێتەوە فیکرم
کە خوێنی ناحەقی ئەو مەوج دەدا ئێستەش لە کێو و شاخ
لەبەر قاپی خەراباتا کە یاڕەب دایمە ئاوا بێ
مەگەر خاکێ بەسەرداکەم بکەم گاهێ دەماغێ چاخ
خەرابی عیشقی تۆ وا بێ سەروسامان و دەروێشە
سەری بێ تاجە کولبەی بێ دەرە دیواری بێ ساچاخ
نەگەینە کەعبەی ئامالە هەموو ئەسبابی ئامادە
کە دەستە بێ عەسا پێ خاوسە یەک قەتعەڕێ قوملاخ
لە ڕەشکی سەیدی فیتراکی چی شیرین شەهسوارێکە
کە (مەحوی) هەر وەکو دێوانە عەنقا کەوتە شاخ و داخ

لەم شیعرەدا مەحوی لە مەبەسەکانی شیعری ئاسایی نەچۆتە دەرەوە. مەسەلەی ڕاووشکار ناوەڕۆکێکی گرنگە، ئەو شاعیرەی خۆی بەڕاوچی دادەنێ مایە پووچە، چونکە بەهیچ جۆرێ ناتوانێ دلبەر ڕاو بکا و ببێ بەنێچیری، بەڵکو بەپێچەوانەوە سەردەمی گوشادی لەوەدایە دلبەر شاعیر ڕاو بکا و بیکاتە نێچیری خۆی، ئەمەش نابێ چونکە لە سروشتی شیعردا نییە. بەڵام ئەوە هەیە مەحوی توانیویەتی ئەم بابەتە لاساییانە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە داهێنانی هونەرییان تێدا دروست بکا.

## وەسف

بابەتی وەسف لە شیعری کوردیدا لە دڵداری جیا ناکرێتەوە. زۆربەی شیعری مەحوی لەم بابەتەیە، ئەگەر لەم خانەیەش بچێتە دەرەوە خەریکی سروشت و کەژەکانی ساڵ دەبێ بەتایبەتی بەهار. هەرچی لایەنەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی و سیاسی هەیە، مەحوی خۆی لێیان دوور گرتووە.

لە شیعرێکی بەهاریدا مەحوی دەڵێ:

شنەی بادی بەهاری هاتەوە خۆشی لە تۆ بولبول
بەشایی هاتی گوڵ کۆکی کە سازی چەهچەهە و غولغول
چەمەن هەر سەروو نەسرینە لە تەرزی خوابگەی شیرین
سەری کێوانە یەکسەر وەک کەناری کۆهکەن هەر گوڵ
چی شۆرێکی جونوونی پێوەیە بای ئەم بەهارانە
لە شارا هەر زرەی زنجیرە سەحرا شۆڕشی بولبول
دەبینی (قول هووەڵڵا) خوێنەکانی کونجی مزگەوتان
ڕووەو سەحرا کە دەبیەن وا سوراحی هاتەوە قولقول
دەبینم سیبحە دەردەستانی مل کەچ بوو لە تەکیانا
لە سەحنی گوڵشەنا سەرمەست و دەستەملانی شیشەی مول
هەموو خوێنی شەهان و تاجدارانە لە بن خاکا
کەوا هەوری بەهاری سەر زەمینی پێ دەکا گول گول
زمانی لالە بۆ حەیرانە حاڵی بۆ پەرێشانە
لە سۆسەن دەفکرم (مەحوی) لە وەزعی نێرگس و سونبول

لەم شیعرەدا مەحوی لە داهێنانی فەزای سۆفیزمی کۆزمۆسی و ڕەشبینی دەست نەکەوتنی مەعشووق یا مەعشوقە دوور کەوتۆتەوە، گێتییێکی بێ تەنگوچەڵەمە و ژیانێکی بێ گرێی ساز کردووە، بێ گومان دیمەنی بەهار جوانترین و چاکترین شانۆیێکە ئەم هەست و نەستانەی تێدا بنوێنێ.

لە وەسفی هێز و توانای دلبەردا مەحوی ئەوە دەخاتە ڕوو هیچ کەس ناتوانێ بەرهەڵستی بکا:

هەموو عالەمتە پابەند و لەدامان
کەچی دەستی کەست ناگاتە دامان



دوهاتی ئەوروپا وەک ئەهلی دێهات
لە چارەی دەردی عیشقا جوملە دامان
برا! مەردم دەوێ عەقڵی نەلەنگێ
بەلەنجەی ناز و عیشوەی نەونەمامان
لەگەڵ زانت دەکەویە کۆشی دنیا
سبەی قاتیلتە ئەمرۆ بۆتە مامان
سەروسامانمت پرسی مەپرسە
سەری تۆ خۆش نە سەر ما وە نە سامان
غورووری حوسنە فیرعەونی بەتۆدا
ڕەقیبی سەگ بەچی بووبوو بەهامان
لە دنیادا وەکو منداڵی ناکام
بەناکامی دەچن دنیا بەکامان
بەهانە مەگرە لەو جامانە جامێ
کەرەم کە ساقیا بگرە ڕجامان
بەکولفەت ئەو بەئولفەت ئەم گرفتار
وەکو یەک زاهید و (مەحوی) لە دامان

گەورەیی دلبەر لە هەموو شتێکدا بەڵگە نەویستە، بەڵام شاعیر بۆ مەبەسی وێنە و مانا دروستکردن بەڵگە دێنێتەوە ناوی ئەو کەسانە دەبا کە ڕەمزی توانایی و هێزی بێ سنوورن وەکو داناییانی ئەوروپا و فیرعەونی میسر، هەروەها ئەوانەی ڕەمزی ناشارەزاییێ وەکو خەڵکی لادێیانی لای خۆمان، ئەمانە هەموویان، بەتوانا و بێ هێز دەستیان ناگاتە دامانی دلبەر.

لە وەسفی ددان و ئەندامی دیکەی دلبەر و کردەوەی کە لە غەمزەی چاودا دەردەکەوێ مەحوی دەڵێ:

دەمت چی پڕ لە دوڕ دورجێکی یاقووت
نیشانە و مۆری چی خەتتێکی زومرووت
بەگریانم وەکو گوڵ پێکەنی یار
لە باغی من بە بارش غونچە پشکووت

قوبوولّم كەی ئەگەر لوتفێكی زۆرە
بەكەمتر هیندوییێكی خاڵی هیندووت
شوكر هەر مامەوە بۆ یادگاری
بەكاری زەخمەكەی شمشێری ئەبرووت
لە غەمزەی چاوت ئەبرۆ داگرە و بەس
مەكە بۆ قەتڵی عاشق ڕەنجە بازووت
نەخۆشی عیشقی لێوت وەسیەتی كرد
بتاشن داری عوننابی بەتابووت
منی بەم حاڵ و قاڵە دی كە دەیووت
كتێبێكی غەریبم دیوە پەرپووت
بەنیلە بێ نەباتی میسری لێوت
جلم سوبحم هەموو هەر شامە بێ ڕووت
لە ناڵەی گەرمی دڵ باكت نەبوو تۆ
بەئاهی سەردی (مەحوی) من دڵم سووت

لەم شیعرەدا مەحوی وەسفی هەندێ لە ئەندامەكانی دلبەر دەكا، بزووتنەوەی ئەم ئەندامانە بەحاڵەتی خۆشی و ناخۆشی خۆی گرێ دەدا و مانای داهێنراویان لێ دروست دەكا. لە لاییێكی دیكەوە گەمە بەوشە و مانا دەكا و وێنەی ڕەوانبێژی بەدەستەوە دەدا وەكو ئەو پێوەندییانەی لە نێوان ڕووباری نیل و میسر و شام و بێرووت لە وشەی (بێ ڕووت) واتە (بێ ڕوخسارت)دا هەیە دەیانخاتە چوارچێوەی داهێنانی شیعرییەوە.

مەحوی وەسفی جوانی لەش و ناسكی ڕەوشتی یاری خۆشەویست بەم جۆرە دەكا:

دڵی بردم بەشۆخی دلبەرێكی تازە سەرلەنوێ
موبارەك بێ لە دڵ سەودایەكی كەی كەوتە سەرلەنوێ
كەچ ئەبرۆ دیدە ئاهوو شۆڕشێن خوو فیتنەجۆ توركێ
خورۆش و شۆر و شینی خستە ناو ئەهلی نەزەر لە نوێ
بەناز و عیشوە پاك ئەرواحی پاكانی مەسەخەر كرد
بەغەمزە خاترانی دایە بەر تیری نەزەر لە نوێ
سەبا كردوویە وەعدەی گەردی كۆیی مەگری ئەی دیدە
بەئومێدم جەواهیر سورمە بۆ نووری بەسەر لە نوێ



لەبی لەعلی شیفابەخشی برینی دڵ دەكا مەرهەم
ئیشارەی چاوی دەكولێنێتەوە داغی جیگەر لە نوێ
بەشێوەی شكڵی شیرینی وەكو كاكۆڵی موشكینی
پەشێوی كردووە ئەحواڵی (مەحوی)ی دەربەدەر لە نوێ

ئەم شیعرەی مەحوی لە وێنەی فۆتۆگرافی كیژێكی جوان دەكا، وێنەكە لە دوای گرتنی بەكامێرا ڕووتۆش كرا بێ، بەڵام مەحوی بزووتنەوە و هەست و نەستی داوەتە كیژەكە، ئیتر لە بێ گیانییەوە بووە بەگیاندار و بەنازونووزی هەستی شاعیر دەبزوێنێ.

## دژی بێگانە (ناموسوڵمان)

لە شیعرێكیدا مەحوی دیالۆجێك دروست دەكا لە نێوان ئەفلاتوون و كەسێكی دیكە، بێ گومان ئەو كەسە خۆیەتی، لە شیعرەكەدا دەڵێ:

شەخسێكی ساحیب ئەحوال پرسی: كە ئەی فلاتوون
یۆنانییانی قەومت بۆچی بەدەردی سەگ چوون
ئەو زوو فونوونە جوابی دابوو: بەجێیە وا بێ
خۆی دایە بەر شیهابی ساقیب كە دێوی مەلعوون
باتیل موقابیلی حەق وەستا بەتاڵە ئیشی
گەردی بەبادە خاكێ بێ هەڵپڕژێ بەگەردوون
خورشیدە موعجیزە شەرع زوڵماتە سەفسەتەی پووچ
ئیسلامییان هەموو دین، یۆنانییان هەموو دوون
لەم كارەدا تكاكەر كێ حەزرەتی ڕیسالەت
(لاسییەما) تكاگر كێ (زولجەلال)ی بێچوون
فەتح و زەفەر بەناوی كێ بێ خەلیفەی ئیسلام
عەبدولحەمیدی غازی سوڵتانی ڕوبعی مەسكوون
سائیل كە لەو جەنابە فائیز بوو بەم جەوابە
مەزموونی پڕ لە حیكمەت ئەلغازی پڕ لە مەزموون
پێی وت بەسەد تەئەددوب ئوستادی بێ تەعەسسوب
بەم حاڵ و ساڵە لایق تەئریخی چی دەفەرموون

دووباره هاته گـــوفـــتـــار من زوو وتوومـــه ناچار
ئیـســـلامـیـیـان بفـەرمـوون یۆنانیـیـان تەلەف بوون
(اسلامیان بفرمون یونانیان تلف بون ۱۸۹۹/۱۳۱۷–۱۹۰۰م)

مەحوی ئەم شیعرەی لە ئەنجامی ئەو جەنگە وتووە کە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و یۆنانی لە ساڵی ۱۸۹۹ ڕوویداوە و عوسمانییان تیایدا سەرکەوتوون. بەئاشکرا دیارە مەحوی لایەنگری دەوڵەتی عوسمانییە. بەهەموو لێکدانەوەیێک و جیاوازی ئیدیۆلۆجییەتێکەوە دەبوو مەحوی لایەنی عوسمانییان بێ، چونکە مەسەلە لێرە مافی نەتەوایەتی نییە، چاکە و بەرژەوەندی چینایەتی نییە، بەتایبەتی لەو سەردەمەدا، بەڵکو مەسەلە موسوڵمانەتییە. باوەڕ ناکرێ لەو کاتەدا نەک تەنیا مەلا و شێخێکی وەک مەحوی بەڵکو هەموو کوردێکی موسوڵمان بەدڵ حەز بەسەرکەوتنی یۆنان و شکانی عوسمانی کردبێ. ئەمە لێرە، خۆ ئەگەر هەندێکی دیکە بەرەو ڕۆژهەڵات ببینەوە مەسەلەی ڕووس و ئەرمەنی مەسیحی و کورد و عوسمانی موسوڵمان دێتە گۆڕێ. حاجی نەک تەنیا لە دژی ڕووسی مەسیحی دەوەستێ بەڵکو نایەوێ کوردستان لە لایەن ڕووسەوە بکرێ بەئەرمەنستان. ئیتر لەو سەردەمەدا سۆزی ئایینی لە کۆمەڵی ئیسلامیدا بەتایبەتی لە نێوەندی پیاوانی ئایینی (شێخ و مەلا)دا لە سەرووی سۆزی نەتەوەیی (قەومی) و ئیدیۆلۆجییەوە بوو، لەبەر ئەوە پێویستە مامەڵەی تیۆرییەکانی جوانکاری و داهێنان لەگەڵ ئەم شیعرانەدا بکرێ نەک بەچاوی کێشەکانی ئیدیۆلۆجی تەماشا بکرێ.

لە شیعرێکی دیکەیدا مەحوی ئیلهام لە جەنگی ساڵی ۱۹۰۵ی نێوان ڕووسیا و یابان وەردەگرێ و دەڵێ:

ئەی ئەو کەسە کە مەستی غورووری بەهاتی کار
بەو دەسـتی زۆرە بدڕە پەڕۆیێک لە کـاری چار
هەرچەندە خـەرتەلی لەپڕێ چەرخی پەنجـەباز
دەتکا بەبازی پەنجـەیی مـیـقـادۆیی شکار
یا مـاری سـەر خـەزێنە بترسـە کـە گـەژدومێ
بەو نوکـە چزوە پڕ بەدەست کـا لە ژەهری مـار
زەڕڕە تریشـقـەیێکە کـە کـێـوێ دەدا بەباد
ئەشبـاه ئەوەندە زۆرە بەکـەس نایەتە شـومـار



پەس ئەوروپالی بەس بگەزن لێـو ئەمـە چییـە
ژاپۆنیـیـێک مـوحـارەدا چار دەوری چار
چار قـەدەر بزانە نیـیـە چەندە چاری وا
بێ چارە مـا کـە بوو بەدوو پەنجـەی قـەزا دووچار
لەم کـاروباری چارە یەکێ چارە گـرژ دەکـا
وا تێگەیشـتـووە کـە هەر ئەسـبـابە دێ بەکـار
پڕ سـبـیـریا بەبێ مـەددەی زاتی کـبـریا
ئەسـبـابت ئەر هەیە نیـیـە شایانی ئیـعـتـیـبار
هەرچی هەیە مـوسـەببـیـبـە باقـیکە فـانیـیـە
بەندەی یەکێ بە بەس ببـەرە عـەبدی سـەد هەزار
(مـەحـوی) چ کـەس مـەناسـە بناسـە خـودا و بەس
زیکری یەکێ کـە مـارە مـەکـە باسی چار و مـار
لەم چارە پیـسـە مـیللەتی پاکی مـوحـەممەدی
دەر قـەلعـە بێ خـودا بەحـەقی جاهی هەر دووچار

وەک لەم شیعرەدا دەردەکەوێ مەبەسی بنچینەیی مەحوی لە هۆنینەوەی ئەم شیعرە ئەوەیە بەخراپە باسی ڕووس بکا، چونکە لە بنجدا لەگەڵ ڕووس تەنگوچەڵەمەی هەیە تەنیا لەبەر ئەوەی میللەتی ڕووس لەسەر ئایینی مەسیحییە. شاعیر نەک تەنیا مەسیحی بەڵکو هەموو ئایینێک ڕەت دەکاتەوە تا دەگاتە ئایینی یابانییەکانیش ئەگەر ئایینیان هەبێ و میکادۆی مەلیکیان بپەرستن و بەخودای بزانن. شاعیر هیچ جۆرە کێشەیێکی لەگەڵ یابانی زۆر دوور و کەم ناسراو نییە، کێشەی ئەو لەگەڵ ڕووسی مەسیحییە، چونکە هەمیشە لە جەنگ و شەڕوشۆڕدا بووە لەگەڵ دەوڵەتە ئیسلامییەکانی باشوور. جا ئەگەر مەحوی تا ڕادەیێک لەبەر ئێران بەتەنگ مەسەلەکەوە نەبووبێ، جەنگی ڕووس لە دژی عوسمانی گرنگ بووە بۆی چونکە بەئایین موسوڵمان و بەئایینزا سوننی بوون. دیسانەوە مەحوی لەم هەستەیدا تەعبیر لە فیکر و بۆچوونی ئەو سەردەمەی توێژێکی گرنگی کوردەواری بەتایبەتی خوێندەوار و ڕۆشنبیرەکانیان دەکا.

هەڵەیێک لە نووسینی کوردیدا هەیە لە ناو ئەم شیعرەشدا دووبارە کراوەتەوە، پێویستە ڕاست بکرێتەوە: نووسەرانی کورد زاراوەی «چار» بۆ زاراوەی «قەیسەر» بەکار دێنن. لەم وشە ڕووسییەدا بەلای ئێمەوە دەنگی «تس» لە دەنگی «چ» نزیکترە لە دەنگی تیپە ئەسڵییەکەی ڕووسی، بۆیە ڕاستتر ئەوەیە بنووسرێ «تسار» نەک «چار».

## چوارین

دیوانی مەحوی کۆمەڵێک چوارین دەور دەکاتەوە. ئەوەی پێویستە لێرەدا ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە چوارینەکان ئاسایی نین، واتە هەموویان لەسەر کێشێکی عەرووزی دانەنراون، هەروەها لە ڕووی قافیەشەوە شاعیر تەنیا قافیە ئاساییەکانی (ا ا ب ا) و (ا ا ا ا)ی بەکار نەهێناوە، بەڵکو قافیەی دیکەشی هەیە وەکو (ا ب ا ب) و (ا ب ج ب). ئەو بەحرە عەرووزییانەی لە چوارینەکاندا بەکارهێنراون ئەمانەن:

هەزەج، ڕەمەل، خەفیف، موجتەس، موتەقاریب، موزاریع، مەقسوور، بەسیت.

لەم ماوەیەدا هەندێ نموونەی چوارینی مەحوی دەخرێتە بەرچاو.

– ١ –

بەبێ بەزمی حوزووری تۆ حەرامم کردووە بادە
نەوەک بشکێ بەنەشئەی مەی خوماری دەردی بێ تۆیی
لە میحنەت خانەکەی مندا بەبێ تۆ هەر برا ڕۆیە
کە جارێ ئێوە ناپرسن لە من بۆچی برا ڕۆیی

شاعیر لە ناو گەردوونێکی سۆفیزم دەسووڕێتەوە، بادەی ئاسایی بەکەڵکی نایە چونکە سەرخۆشییەکەی کاتییە، کەچی سەرخۆشی هەمیشەیی ئاتاجی ئەوە نییە دووبارە بخواتەوە بۆ ئەوەی خوماری بشکێ واتە سەرێشەی نەمێنێ. شاعیر گلەیی لە مەعشووق دەکا بۆچ لە حاڵی پەرێشانی ناپرسێ!.

– ٢ –

ئەگەر لەیلا ئەگەر فەرهادە تا حەشر هەر بن مەمنوون
لە یومنی عیشقە فەیزی حوسنە وا بەم روتبەنائیل بوون
دەکەن ڕەشتاڵەییێکی دەشتەکی باسی لەگەڵ شیرین
دەبەن بەرهەڵکەنێکی کێزری ناوی لەگەڵ مەجنوون

مەحوی لەم چوارینەدا هەندێ وێنەی ساکاری جوان دەخاتە ڕوو لە بەسەرهاتی دڵداری «لەیلا و مەجنوون» و «شیرین و فەرهاد». شاعیر دەڵێ ئەو کەسە سادانە لەیلا کیژە ڕەشتاڵەییێکی دەشتەکی و فەرهاد کێو هەڵکەنێکی هەرزەی بزێو ناویان لە گێتیدا دەنگیدایەوە و هەتا هەتایە لە بیر ناکرێن و بوون بەڕەمزی دڵداری.



– ٣ –

شێخێ هەمەوەندێکی دەدا پەند و نەسیحەت
ئەو قوڕبەسەرەی دابووە بەر فەحش و فەزیحەت
خۆش هاتە جەواب و وتی تۆ حەقتە فەقەت من
قوتتاعی تەریقم نەکو قوتتاعی تەریقەت

ئەم چوارینەی مەحوی دەچێتە ناو دەلاقەی شیعری دژی دەروێشیزم. لێرەدا کابرای هەمەوەند ڕەمزی ڕێگرییە، شێخی تەریقەت دەیەوێ بیهێنێتە سەر ڕێی ڕاست، لە گفتوگۆدا کابرای هەمەوەند بەتەوسەوە دەڵێ من ڕێگرم تۆش ڕێبەر و ڕێ پیشاندەری. بەڵام مەبەسی ئەوەیە شێخ ڕێگری ڕاستەقینەیە. وەک دیارە مەحوی شێوازی کۆمیدی لەم چوارینەدا بەکارهێناوە.

– ٤ –

هەی لە ژن کەمتر موعەتتەل بۆچی نەی ژەن لێدە نەی
ساقی یا! ساقت شکێ بەس ڕابوەستە بێنە مەی
ئەو قورومساغە دەڵێن پیری موغانە پێی بڵێن
پیری ئاخرشەڕ دەری مەیخانە تا کەی دادەخەی

ئیلهامی شیعری مەحوی هەمیشە و تەنیا لە گێتی تەمومژی ئەفسانەیی و نادیاری سۆفیزم نەبووە. ئەم چوارینەی زادەی کۆڕی پێکەنین و ڕابواردنی ڕۆژانەیە. شاعیر قسە لەگەڵ سێ کەس دەکا: نەی ژەن و مەیگێڕ و پیری موغان، هەرسێکیان تاوانبار دەکا بەوەی کاری خۆیان بەجێ نەهێناوە. لەبەر ئەوە لە ژن بەکەمتریان دادەنێ. ئەمە جنێو نییە بۆ ژن، نوکتەییێکە بەدرێژایی مێژوو لە هەموو گێتیدا دروست بووە، تەنیا لە ناو ئێمەدا نییە، وەک سەرچاوەییێک بۆ داهێنانی هونەری و ئەدەبی لە هەموو کۆمەڵێکدا دەمێنێ.

– ٥ –

برینانی دەروونم چاوەکەم وەک چاومە وێران
لە وێرانی مەپرسە هەم دەر و هەم ناومە وێران
بەدڵ ڕازی نەبوو ڕۆیی لە حوجرە هەم لەبەرچاوم
بەجارێ ماڵی دڵم و خۆم و هەردوو چاومە وێران

لەم چوارینەدا مەحوی لە مەعشووق دەدوێ وەک نەک مەعشووقە، ئەگەر باس لە حوجرە بکرێ خەیاڵ بۆ مزگەوت دەڕوا وەک جێی ژیانی خوێندەواری و حەسانەوەی مەلا، دیارە شاعیر هەوڵیداوە بوعدێکی سۆفیزمی بداتە شیعرەکەی بەوەی هەموو شتێکی وێرانە و لە ناون ونبووندا نەبێ خۆی نادۆزێتەوە چونکە مەعشووقی لێ ونە.

- ٦ -

مەحوی لەم چوارینەدا بەتەواوی لە تیۆرییەکانی سۆفیزمی کۆزمۆسی دوور دەکەوێتەوە کە جنێوی بازاڕی بەرەو ڕووی هەندێ ئایینی ناموسوڵمان یا دوور لە موسوڵمان دەکا:

ئەو دەووت بابەی کە خەڵقی ناوی نابەن بێ جەناب
ئەسڵ و فەسڵی گەر بزانی واجیبە لێی ئیجتیناب
ئەکدەشی خینزیر و سەگ مەعجوونی بەنگ و خەندەریس
داکی دایە ڕێزباری بابی بابیی قەحبەباب

لەم شیعرەدا ئەوەی مەحوی دایدەشۆرێنێ هەموو تاوانەکەی ئەوەیە بەموسوڵمان و ئایینزای سوننی نەخولقاوە. ئەو کەسە بەدووڕەگ دادەنێ، لە داک و بابێک بووە یەکێکیان خەنزیر و ئەوی دیکەیان سەگ، لە هەویرێک دروستکراوە بریتییە لە بەنگ بەشەرابی کۆنە شێلراوە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەو کەسە بەنگ کێش و شەراب خۆریشە، ئیتر ئەو داک و بابە یەکێکیان دایە ڕێزباری داپیرە گەورەی بەڕێزی یارسانانە (کاکەییان)، ئەوی دیکەیان لە نەوەی محەمەد عەلی شیرازی خودای بابییەکانە. ئەم بیروباوەڕەی مەحوی گەلێ دوورن لە سۆفیزمی کۆزمۆسی، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین شیعری سۆفیزمی کۆزمۆسی لە بەرهەمی مەحوی دەبینرێ، بەڵام ڕەوشتی سۆفیزمی کۆزمۆسی بەهیچ جۆرێ لە کردەوە و بیروباوەڕی مەحوی نابینرێ، چونکە دژی هەموو ئایینەکانی سەر ڕووی زەوییە و ئیسلامی سوننی نەبێ.

- ٧ -

مەحوی لە چوارینێکیدا خۆی لە ناو زەریای پڕ لە گیروگرفتی سۆفیزم ون دەکا:

هەر گفتوگۆمە کەچی هەر دەڵێم و تێناگەم
هەر جوست و جۆمە کەچی هەر دەڕۆم و پێناگەم
چاوم ڕواو و گۆشەیی ئەو ئەبروەم نەدی
دڵ بوو بەبەحری عولووم و لە ئەلف و بێ ناگەم



لەم چوارینەدا مەحوی فیکری ورد دەکاتەوە، بەڵام لە هیچ ناگا، هەوڵ دەدا بگا بەحەقیقەت کەچی نایگاتێ. مەبەسی «یەکێتی بوون»ە، خۆ ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم یەکێتی بوونە لە ئەنجامی پراکتیکدا ببێتە ڕاستی، ئەو کاتە دەبێ فەلسەفەی سۆفیزم بەتاڵ ببێ لەبەر ئەوە شاعیر هیچ نەبی لە بەرهەمی شیعریدا ڕەنگی ناداتەوە، واتە حەقیقەتەکە ناکەوێتە ڕوو.

- ٨ -

مەحوی لە دەرەوەی ئایینی ئیسلام ڕاستی نابینێ، بەلای ئەوەوە ئەو گێتییە هەموو خراپەیە. ئەمجارەیان جنێو بەفیرعەون هامان دەدا:

چوو ئەو فیرعەونە حیزە بۆ جەهەننەم قوڕبەسەر هامان
دەبێ ئەسبابی زووتر چوونە خزمەت ئەو بدا سامان
لەوانە و هەم لە ئەمسالی ئەوانە یا ڕەبی هەر ئان
جەهەننەم پڕ بکەن جەننەت تەهی بێ بۆ موسوڵمانان

مەحوی وەک لەم چوارینەدا دەردەکەوێ هەموو ئایین و بیروباوەڕی پێش ئایینی ئیسلامیش ڕەت دەکاتەوە. فیرعەون و هامان بەڕەمزی کوفر و نەناسینی خودا دەزانێ و ئەوان و هەموو کەسێکی وەک ئەوان بۆ دۆزەخیان دەنێرێ چونکە بەلای ئەوەوە بەهەشت تەنیا بۆ موسوڵمانانە و جێی کەسی دیکەی لێ نابێتەوە.

- ٩ -

مەحوی لەم چوارینەدا باس لە شێوانی کۆمەڵی ئادەمزاد دەکا بەوەی چاکە نەماوە و خراپە بووە بەنەریت:

ئەهلی فەزڵ ئارام و ڕووناکی نە شەو ئەسلانە ڕۆژ
بۆ نییە نابێ کە ئەمڕۆ ڕۆژی نائەهلانە ڕۆژ
فەزڵ و جەوهەر بۆتە نەقس ئەم ئەهلە بۆیە فەسڵ ئەکەن
سەگ زمانی دەردەکێشێ چ بووە چی تاوانە ڕۆژ

شاعیر دەڵێ کەسی دانا لەسەر ڕووی ئەم زەوییە ئەو مەقامەی نییە شایانی بێ. لەبەر ئەوە یەکێکی وەکو مەحوی جیا دەکرێتەوە و لە دانایان ناژمێررێ. ئەمە وەکو ئەوە وایە سەگ بەزمانی قەشمەری ئامێز لە ڕووی ڕۆژدا بوەستێ. بێ گومان ڕۆژ هیچ تاوانێکی نییە و بەمەش کەم نابێ، یا وەکو دەڵێن سەگ بەئاسمان وەڕینە.

- ١٠ -

لە چوارینێکیدا مەحوی وردەکاری و هونەرێکی بەرز دەنوێنێ لەو پرسیار و وەرامەی لە نێوان لەیلا و مەجنوون دەکەوێتەوە:

شەوێ لەیلا بە مەجنوونی دەووت بنوارە حاڵی خۆت
بەخۆڕایی کە چۆنت دا بەبا عەقڵ و کەماڵی خۆت
جوابی دایەوە مەجنوون ئەگەر تاقەت ببێ لەحزێ
لە ناو ئاوێنەدا بنوارەرە حوسن و جەماڵی خۆت

پرسیار و وەرامەکە گەلێ ئاسایی و ساکار و جوانە ئەگەر لەیلا بەمەجنوون بڵێ: بۆچ خۆت شێت کردووە؟ مەجنوون لە وەرامدا بڵێ: لەبەر جوانی تۆ!

مەحوی وەستایانە وێنەیێکی هونەری داهێنراوی لەم پرسیار و وەرامە دروست کردووە. لەیلا دەڵێ: مەجنوونی ماڵ وێران لە پای چی شێت بووی و عەقڵ و کەمالت بزر کردووە؟ لە وەرامدا مەجنوون دەڵێ: بڕۆ تەماشای ئاوێنە بکە و جوانی خۆت ببینە ئینجا ئەم پرسیارە لە من بکە!

**تاک**

لە دیوانی مەحویدا نزیکەی پازدە شازدە تاک هەیە. ئەو تاکانە لە ڕووی کێشەوە لەسەر بەحرەکانی هەزەج و ڕەمەل و موزاریع و ڕەجەز و بەسیتی عەرووزین. لە ڕووی قافیەوە هەردوو جۆرە قافیەیان تێدایە (اا) و (ا ب).

- ١ -

مەحوی بەم جۆرە قووڵایی لای سەرەوە و بنەوەی سێو بەزەنەخدانی (قووڵایی چەناگەی) دلبەر دەچوێنێ:

ناوی زەنەخدانت لە ناو باغی بەهەشتا بێتە نێو
سەر وەردەگێڕێ باغەوان هەر جێبەجێ بۆ تف لە سێو

مەحوی ڕوو دەکاتە دلبەر و پێی دەڵێ: ئەگەر لە ناو باغی بەهەشتدا مەسەلە باسکردنی قووڵایی چەناگەی تۆ بێ، باغەوانی بەهەشت ڕوو وەردەگێڕێ و تف لە سێو دەکا چونکە قووڵایی تۆ لە هی ئەو جوانترە.

ئەم تاکە موعەمماییێکیشی تێدایە ئەویش ئەمەیە: سێوی کوردی کە لە شیعرەکەدا هاتووە



بەعەرەبی «تفاح»ی پێ دەوترێ، ئەگەر نیوەی یەکەمی وشەکە کە «تف»ە وەربگێڕدرێ دەبێتە «فت» و بەنیوەی دووەمی وشە ئەسڵییەکەوە بنووسێنرێ دەبێتە «فتاح»، بەم جۆرە «تفاح» دەبێ بە«فتاح».

- ٢ -

لە تالێکیدا مەحوی ئاماژە بۆ هەندێ لە سەرچاوەکانی سۆفیزم دەکا:

بکە سەیری فوتووحات ئەر گەرەکتە تۆ فوتووحی ڕووح
کتێبی دڵ موتالاکردنە بڕوانە مەکتووبات

کتێبی «الفتوحات المكية في معرفة أسرار الملكية» یەکێکە لە کتێبە گرنگەکانی شێخ محیەدینی عەرەبی. هەروەها باس لە «مەکتووبات» دەکا. بەم ناوەوە چەند کتێبێک هەیە. ڕەنگە مەبەسی مەحوی کتێبەکەی ئیمامی ڕەببانی بێ. بەم جۆرە شاعیر دەڵێ یەکەمیان نهێنییەکانی گیان بۆ مرۆڤ ئاشکرا دەکا و دووەمیان لە عیشق و دڵداری دەدوێ، باس لە هەست و نەستی ناو دڵ دەکا.

- ٣ -

لە تاکێکی دیکەیدا مەحوی گەمە بەوشەکانی شەو و ڕۆژ دەکا و دەڵێ:

من ڕۆژ ڕەشم و فەرقی نییە ڕۆژی من لە شەو
سەد ڕۆژ ئەگەر هەڵێ لەسەرم ڕۆژم هەر شەوە

لەم تاکەدا مەحوی ئەوە دەخاتە ڕوو ڕۆژی ئەو ڕووناک نییە و تاریکە، واتە ڕۆژی ئەو شەوە لەبەر ئەوە ئەگەر ڕۆژی سەد جار ئەو ڕۆژە هەڵبێ لای ئەو شەو هەمیشەیییە و ڕۆژ نییە، ئەمە یەکێکە لە وێنە جوانەکانی داهێنانی ئەدەبی.

## بەشی دەیەم

# شیعری گێتی سۆفیزمی مەحوی

## سۆفیزم

بیرکردنەوەی ئادەمزاد لە دروستبوونی خۆی و سروشت ڕایکێشاوە بۆ بیرکردنەوە لە کردگار. ئەمە لە ڕۆژگارێکدا بووە کە مەڵبەندی ژیان (المجال الحیوي) پەیدا بووە. واتە لەو کاتەی کە ئادەمزاد لە سروشت پچڕاوە و هەوڵیداوە بۆ چاکەی خۆی بەکاری بێنێ.

بیرکردنەوە لە کردگار و گەڕان بەشوێنیدا فەلسەفە و سۆفیزمی دروست کردووە. پێشکەوتنە ناوەوەیان وەکو زاراوەیێکی ئەکادیمی. بەڵام بیرکردنەوە و گەڕانەکە ساکار بووە تا ڕۆژگاری فەیلەسوفەکانی بەرایی گریکی، ئینجا سەردەمی نەوەی دووەم لە فەیلەسوفەکان، سوکرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ. لەم ماوەیەدا بیروڕا لە بنج و بناوانی «ئادەمزاد–سروشت–کردگار» شێوەیەکی جەدەلی وەرگرت و بەدرێژایی ڕۆژگار ماوەی بیرکردنەوە قووڵتر و فراوانتر بوو و گەلێ تیۆری و تاقیکردنەوە کەوتە ناوەوە.

جەوهەری ئایینە ئاسمانی و زەمینییەکان لەسەر بنجی ناسینی کردگار دامەزراوە، هەستکردن بەبوونی کردگار و جۆری ناسینی و وێنەگرتنی لە ناو ئایینەکاندا وەک یەک نییە و جیاوازە، بەڵام زۆربەی ئایینەکان لە «بوون» (کەون)دا کە «ئادەمزاد و سروشت»ە، «کردگار» دەبینن.

تاقیکردنەوە لەم بابەتەوە گەلێ فراوان بوو، سامانێکی بیروڕای فەلسەفی گەورە و دەستووری ئایینە کۆنەکان و کتێبی پیرۆزی ئایینە ئاسمانی و زەمینییەکان کەوتنە ناوەوە تا داهاتنی ئایینی ئیسلام. ئەم ئایینە شۆڕشێکی گەورە بوو لە تازەکردنەوەی ئایینە ئاسمانییەکانی پێش خۆی بەتایبەتی ئایینی مەسیحی کە ڕاستەوخۆ پێشکەوتبوو. هەر لە سەرەتاوە بەهۆی لە ناوەوەبوونی سامانێکی گەورە لە بیروباوەڕی فەلسەفی و سۆفیزمی گریکی و ڕۆمانی و ئایینە ئاسمانی و زەمینییەکان بیروباوەڕی «زوهد» لە کۆمەڵی ئیسلامی تازەدا پەیدا بوو. نویشکی ئەمە لە فەلسەفەی ئایینی ئیسلامەوە وەرگیرا بوو بەوەی کە گێتی ئێستا لەناودەچێ، گێتی دواڕۆژ نەمر و هەمیشەییە. بۆ وەدەستخستنی گێتی داهاتوو پێویستە بایەخ بەم گێتییە و ژیانی ئەم سەرزەوییە نەدرێ.



«زوهد»ی ئیسلامی سەرچاوەی دۆزینەوەی سۆفیزم بوو لە کۆمەڵی ئیسلامی تازەدا، لەو کاتە کە «زوهد» لە چوارچێوەی شەریعەتدا نەچووبووە دەرەوە سۆفیزم خەریکی لێکدانەوەی دەستوورەکانی ئایین بوو بەشێوەیەکی تازە. تاقیکردنەوەیێک بوو بینراو و نەبینراو (الظاهر والباطن)ی بابەت و کەس (الموضوع والذات) ئادەمزاد و کردگار (الانسان والخالق)ی بەیەک شت دەزانێ. لەبەر ئەوە سۆفیزم لە سروشتی دەکۆڵییەوە لەبەر ڕۆشنایی «دەرچوون لە دەستوور» کە خۆی لە خۆیدا دۆزینەوەی سەربەستی بوو. سۆفیزم لە چوارچێوەی مێژووی نووسراو ڕەت دەبێ خۆی دەکوتێتەوە ناوجەرگەی گێتییەوە خەریکی مانای شاراوە دەبێ و لە مەنتیق و دەستوورەکانی دەچێتە دەرەوە.

ئیدیۆلۆجی سۆفیزم لەسەر ئەوە دامەزراوە کە «بوون» دیار و نادیارە، بوونی ڕاستەقینە نادیارییە لە ئایین و شەریعەت دەبێ بۆ حەقیقەت و بەرەو دۆزینەوەی کردگار دەکەوێتە ڕێ. کردگار جەوهەری گێتییە، سۆفیزم لەناویدا دەتوێتەوە، بەم پێیە پرتەوی دیارە بۆ نادیار. دڵسۆزیی لقە بۆ بنج (الفرع للاصل)، وە گەڕانەوەی وێنە بۆ ناوەڕۆک.

ڕاستی (حەقیقەت) لە سۆفیزمدا دیاردەیێکی عەقڵی (مەنتیقی) نییە هەروەها نەقلی (شەرعی)یش نییە بەڵکو ئیلهامی و زەوقییە. دیارە دەبێ «اداة» (ئامراز، دەستاوێژ)ی گەیشتن بەحەقیقەت شتێکی تری غەیری هەست (الحس) و بیر (العقل) و دەستوور (شەریعەت) بێ دڵ دیاردەی کردگارەکەیە کە سۆفی بەهۆی ئەوەوە هەست بەخودا و نهێنییەکانی بوون دەکا، دڵ مەڵبەندی زانین و دڵدارییە.

لە کۆمەڵی ئیسلامیی تازەدا بۆ یەکەم جار لە نیوەی یەکەمی سەدەی دووەمی هیجری (نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی مەسیحی) زاراوەی «سۆفی» پەیدا بوو. لە ناوەڕاستی سەدەی دووەمی هیجری (نیوەی دووەمی سەدەی نۆیەمی مەسیحی) شاری بەغدا بوو بەمەڵبەندی بزووتنەوەی سۆفیزم و کۆبوونەوە و گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕی بیروباوەڕی ئایین و شەریعەتی تێدا دەکرا.

بەلای ئێمەوە قۆناغی یەکەمی بزووتنەوەی سۆفیزم کە لە سەدەی دووەمی هیجرییەوە دەست پێ دەکا و ماوەی جموجۆڵی سۆفیزمە لە ڕووی تیۆرییەوە. سۆفیزم بزووتنەوە (حركة) بووە لە دژی وەستان (دەستووری هەمیشەیی نەگۆڕان)، بێ گومان شۆڕشێک بوو دژی دەستووری هەمیشەیی لەبەر ئەوە لە لایەن دەسەڵاتەوە بەرهەڵستی دەکرا، هێشتا ڕەنگێکی تەواوی لە داهێنانی شیعریدا نەدابووەوە. ئەم قۆناغە تا دەوروبەری دوا ساڵانی سەدەی شەشەمی هیجری (دوا ساڵانی سەدەی دوازدەمی مەسیحی) خایاند. ئەم قۆناغە

دوورودرێژە ناوی گەلێ لە سۆفییەکانی سۆفیزمی ئیسلامی دەور دەکاتەوە بەشێکیان گەیشتنە پلەی فەیلەسوفی بەهۆی لێکدانەوە ورد و ژیرەکانیان کە لە دواییدا بوون بەتیۆری لە بزووتنەوەی سۆفیزمدا. بەشێکی تریان خوورەوشت و ژیانی ڕۆژانەیان یاغیبوون و بەرهەڵستیی دەسەڵاتی خوێنخوار بوو.

بەشی سێیەم تیۆرییەکانی سۆفیزمیان لەگەڵ شەریعەتدا گونجان و بزووتنەوەی دەروێشی کەوتە ناوەوە. هەندێ لە سۆفییە هەرە دیارەکانی سۆفیزمی ئیسلامی ئەمانە بوون: حەسەن ئەلبەسری (٢١هـ-٦٤٢م، ١١٠هـ-٧٢٨م) ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم لە (١٦١هـ-٧٧٨م) مردووە، بالوولی دانا لە (١٩١هـ-٨٠٦م) مردووە، شێخ مەعرووفی کەرخی لە (٢٤٥هـ-٨٥٩م) مردووە، زونونی میسری لە (٢٤٥هـ-٨٥٩م) مردووە تەیفووری بایەزیدی بەستامی لە (٢٦١هـ-٨٧٥م) مردووە، جونەیدی کوڕی محەمەدی بەغدایی لە (٢٩٧هـ-٩١٠م) مردووە، مەنسووری هەلاج لە (٣٠٩هـ-٩٢٢م) مردووە، ئەبولقاسم عەبدولکەریمی قوشەیری لە (٤٦٥هـ-١٠٧٢م) مردووە، ئەبوحامیدی غەزالی لە (٥٠٥هـ-١١١١م) مردووە، شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە (٥٦١هـ-١١٦٦م) مردووە، سەید ئەحمەدی ڕفاعی لە (٥٧٨هـ-١١٨٢م) مردووە، شەهابەدین سەهرەوەردی کوژرا لە (٥٨٧هـ-١١٩١م) مردووە و هی تریش.

قۆناغی دووەمی بزووتنەوەی سۆفیزم لە سەدەی سێزدەمی مەسیحییەوە دەست پێ دەکا، بەدڵنیاییەوە دەتوانین ناوی بنێین قۆناغی داهێنانی ئەدەبی لە چوارچێوەی سۆفیزمی کۆزمۆسی و سۆفیزمی ئیسلامی. لەم قۆناغەدا شاعیرە سۆفییەکان یا سۆفییە شاعیرەکان ڕەمزی سۆفیزم و زاراوەی فەلسەفییان تێکەڵ بەسروشت و هەستی ناوەوەی خۆیان کردووە و ئەدەبێکی مرۆڤایەتییان هێناوەتە ناوەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیێنی کە لێکۆڵینەوە لە ئیدیۆلۆجییەتی سۆفیزم پەکی کەوتبوو یاخود تەریقەتەکانی دەروێشیزم کپ بووبوون، بەپێچەوانەوە ئەم هەموو دیاردانە لە گۆڕان و پەرەسەندندا بوون، هەندێ جاریش تێکهەڵکێش بووبوون. بۆ بەڵگە ئەم قۆناغە کۆمەڵێک لە سۆفی و شاعیر و شێخی سۆفی و دەروێش دەور دەکاتەوە هی وەکو: فەریدەدین عەتاری نیشابووری لە (١٢٣٠م) مردووە، ئیبنولفاریز لە (١٢٣٥م) مردووە، شێخ محیەدین عەرەبی لە (١٢٤٩م) مردووە، ئەبولحەسەنی شازلی لە (١٢٥٨م) مردووە، جەلالەدین ڕۆمی لە (١٢٧٣م) مردووە، حاجی بەکتاش لە (١٣٣٧م) مردووە، عیمادەدین نەسیمی لە (١٤١٧م) مردووە، نوورەدین جامی لە (١٤٩٢م) مردووە و هی تریش.



## نموونەی شیعری سۆفیزمی کۆزمۆسی
## (گەردوونی)

شیعری سۆفیزم داهێنانێکە ئیلهامی لە ناوەڕۆکی فەلسەفەی سۆفیزم وەردەگرێ، واتە داهێنانی وێنەی فەلسەفەی سۆفیزم ئامێز زۆرتر پەنا بۆ ڕەمز و ڕۆمانتیزم دەبا. تا ئێستا سنوورێک بۆ شیعری سۆفیزم لە ئەدەبی کوردیدا نەکێشراوە. بەرهەمی هەندێ شاعیر بەشیعری سۆفیزم لە قەڵەم دراوە بەڵام ڕاستییەکەی ئەوە نییە، شاعیری دیکەش هەن دەوری باڵایان بووە لە شیعری سۆفیزم بەڵام گوم ناون.

مەحوی یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی دەوری باڵایان بووە لە دەوڵەمەندکردنی ئەم بابەتە شیعرە لە ئەدەبی کوردیدا.

- ١ -

بەنووری بادە کەشفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم چبکەم
بەشەمعێکی وەها چاری شەوێکی وا نەکەم چبکەم
لە خەزنەی دڵمدا هەرچی هەیە هەر داغی سەودایە
دەسا ئەم نەقدە دەردی عیشقی پێ سەودا نەکەم چبکەم
لەگەڵ دەستی مەلا ڕێ ناکەوێ زوننارى زولفی یار
وەکو شێخ ئیختیاری مەزهەبی تەرسا نەکەم چبکەم
لە ڕێی ئەو شۆخەدا خۆم کردە خاک و پێی نەنا پێما
دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم چبکەم
دەمێکە شاری پڕ شۆری مەحەببەت مات و خامۆشە
بەقانوونی تەجەننون شۆڕشێ ئینشا نەکەم چبکەم
لە چاوانم نەما بۆ گریە نۆبەی سەجدە بەردەریە
سیا ساڵم نەبارە نوێژی ئیستیسقا نەکەم چبکەم
لەسەر تۆم دوژمنە دنیا قەزییەم مانیعولجەمعە
کە تەرکی تۆ نەکەم، تەرکی هەموو دنیا نەکەم چبکەم
بەجێماوم لە یاران نابەجێ ماوم ئەجەل زوو بە
بەمردن لەم قوسووری ژینە ئیستیعفا نەکەم چبکەم

ئەوا لەیلا بەڕۆژی حەشر ئەدا وادەی لیقا (مەحوی)
هەتا قامی قیامەت ئاه و واوەیلا نەکەم چبکەم

زوڵمەتی تەقوا ئیماندار و کۆلکە مەلای ناهوشیارە ئەوەی «عیبادەت» لە لای بووە بە«عادەت» ، نووری بادە «پرتەو» و «ئیشراق»ە، دیارە ئیمانداری ناهوشیار لە کردگارەوە نزیک نییە، سۆفی کە باوەڕی بەپرتەو هەیە لە پێشانا خۆشی ناهوشیار بووە بەڵام لە دواییدا بەو نوور و چرایە تاریکی عیبادەتی ناهوشیاری ڕووناک بۆتەوە، لەبەر ئەوەیە سۆفی لە کردگارەوە نزیکە نەک ئیمانداری ناهوشیار.

دڵی سۆفی لە دەردی دڵداری زیاتر هیچی دیکەی تێدا نییە، جێی هیچ شتێکی دیکەی تێدا نابێتەوە، ئەو دەردە گەڕان بەشوێن کردگارە، برینەکانی پارەیە پێویستە دەردی دڵداری پێ بکرێ، واتە ئەم دەردە دەبێ هەر بمێنێتەوە، دەردەکە پارەیە و خۆی پێ دەکڕێتەوە واتە سارێژ نابێ.

لای شاعیر مەلا بەڵگەی ئایین و شەریعەتە، شێخ ڕەمزی سۆفیزم و تەریقەتە، ئەم دوو شتە لەگەڵ یەکتریدا ناگونجێن، بەڵام شاعیر لەسەر ڕێی تەریقەتە، لەبەر ئەوە لاسایی شێخی سەنعان دەکاتەوە چونکە ئەم شێخە کردەوە و جوانی کردگاری لە کچێکی گاوردا دیوە، ئەمە بیروڕای سۆفیزمی کۆزمۆسییە.

مەحوی بۆ گەیشتن بەو شۆخە (مەحبووب) خۆی دەکا بەخاک بەڵام مەحبووب گوێی ناداتێ، دەبێ گوێشی نەداتێ، جا ئەگەر هەموو خاکی زەوی بەسەر خۆیدا بکا، واتە ببێتە هەموو خاکەکە ئایا لێی نزیک دەبێتەوە؟ ئەم پرسیارەش هەر بێ وەرامە.

شاری دڵداری (مەملەکەتی سۆفییان) پڕە لە جموجۆڵی و بیرکردنەوە و داهێنان، بەپێچەوانەی ئەو کۆمەڵەی کە «دەستووری سنوور کێشراوی نەگۆڕاو» بەرێوەی دەبا، لەو کۆمەڵەدا هەموو داهێنانێک قەدەغەیە، هەموو دەرچوونێک لە دەستوور نائاساییە، ئەمە شاری خامۆشانە لەبەر ئەوەیە ئەگەر قانوونی سنوور کێشراو «عاقلی» بێ دەبێ ئەو قانوونە بەقانوونی «شێتی» بەرهەڵستی بکرێ (بالوولی دانا و مەنسووری هەلاج).

مەحوی لە ساڵی ڕەشی بێ باران ئەگەر نوێژە بارانە نەکا چبکا، بۆ ئەم مەبەسە چەند بەڵگەیێک دێنێتەوە، هەندێ لە تیۆرییەکانی لۆجیک (مەنتیق) بەداهێنانی هونەری دەڕازێنێتەوە. بەتایبەتی لە دواییدا ئەوە دەڵێ گۆیا لەیلا بەڵێنی داوەتە مەحوی لە ڕۆژی حەشردا بەیەکتری بگەن، ئیتر تا ئەو ڕۆژە شاعیر چی دیکەی پێ دەکرێ لە ئاه و واوەیلا بەولاوە!



- ٢ -

دیارم دەیری عیشقە جێ بەسووتن بێ لەوێ دەگرم
کە من مشتێ چڵ و چێوم بەچی بم کەڵکی کێ دەگرم
نەگەییە دامەنی دەستی دوعا جا دەبمە خاکی ڕێی
تەریقەی گۆشەگیری بەردەدەم ئەمجارە ڕێ دەگرم
کە دادی یەئسی خۆمم بردەلا ئەم عاریفە توند بوو
وتی ئاخر سبەینێ جەژنە خوێنی تۆ لە پێ دەگرم
لە ڕوو سووری عیبادەت لام و ڕوو زەردی خەجالەت مام
بەناوی سێوی ناوم باغەوان و من بەهێ دەگرم
لەسەرخۆ چوونە، شەیدا بوونە قوڕپێوانە سووتانە
هەتا مردن مەحەبەت ئیشی زۆرە ڕێزی لێ دەگرم
چ شۆخە ئاگرم تێ بەردەدات و پێم دەڵێ یا شێخ
بەخاشاکی دەوت شوعلە عەسامە دەستی پێ دەگرم
کە سینەی ڕێشمی بەو تیغی نازە ئەنجن ئەنجن کرد
وتی پەژموردەیە ئەم لالەزارە ئاوی تێ دەگرم
لە پاداشی قسەی سەردا هەمە ئاه و هەناسەی گەرم
کەسێ شێتانە بەردم تێ گرێ من بەرقی تێ دەگرم
شوکور هوشیارە (مەحوی) تێ دەگا دنیا خەراباتە
کە بەدمەستی بکا ئەهلی خراپەی بۆچی لێ دەگرم

لەم شیعرەدا مەحوی لە پێشانا خۆی لە هەموو شتێکدا بەناتەواو پیشان دەدا، دلبەر بۆ تەواوکردنی هیچ یەکێک لە ناتەواوییەکان ناگاتە فریای، بەڵام شاعیر خۆی دەگاتە فریای خۆی بەلای ئەوەوە سۆفیزمستان مەڵبەندی جموجۆڵی و داهێنان و گەڕان بەشوێن ڕاستی و دروستکردنە. بەرامبەر ئەو وڵاتی دەستوور و دەسەڵات و فەرمانڕەوایی و زۆر و ستەم هەیە. قسەی سارد و تانە لێدان و شێت و بەرد تێ گرتن لە ئەدگاری دەستوور و دەسەڵاتە بەڵام مەحوی باوەڕی بەمە نییە بەڵکو باوەڕی بەوڵاتی سۆفیزم هەیە کە هەناسەی گەرمی تێدایە. ئەمە وەکو بروسک و هەورەتریشقە وایە بۆ وەرامدانەوەی قسەی سارد و بەردی دەستی شێتان. ئەوەی مەحوی زۆر و ستەمی تێدا نییە، ئەوەی ئەوان دروشمی زۆرداری و

ستەم و خراپەیە. بەرقی مەحوی هەناسەیەتی ئەمە ئاشتیخوازانەیە، هێمنی و نەرم و نیانی تێدایە، بەپێچەوانەوە بەردی دەستی شێت شەڕخوازانەیە و برین و ئێش و ئازاری تێدایە.

بەلای مەحوییەوە گێتی مەڵبەندی دەستوور و دەسەڵاتە، مەیخانەیە، خەڵکەکەی بەدمەست و نوستوون، بێ ئاگان، بەڵام مەحوی لە گێتی سۆفیزم مەستی بادەی کردگارە، هوشیارە، ئاگادارە نانوێ، ئیتر چۆن دەبێ یەکێکی هوشیار ناهۆشیارێک تاوانبار بکا!

مەحوی لەم بەشە شیعرەیدا خۆی وەکو سۆفییێکی سۆفیزمی ئیسلامی و کۆزمۆسی پیشان دەدا، داهێنان و وێنە شیعرییەکانی دەچنە ناو ڕەمزی ڕۆمانتیکی ئەدەبی گێتی و شێوەییێکی مرۆڤایەتی وەردەگرن.

- ٣ -

بوومە خاکی سەری ڕێی پێییێکی تا پێمانا
وتی سەد دەفعە بخۆ ئەی حەریکەی بێ مانا
تەڵەبی ڕەحم و مورووەت لە دڵی ئەهلی زەمان
تەڵەبی ئاوی حەیاتە لە سەرابستانا
قاتی پیاوە لەسەر ئەم ئەرزە دەبینی مەنسووڕ
بەسەری دارەوە (زەنئوون)ە لە بن زیندانا
لەقسێکی لەبی پشکووتووە شۆری دوو جیهان
قسەییێک سەد لەکی مانا لە لکی دامانا
قەسەمی گوێمی بەچاوی بەچەدا پیری موغان
کە لە مەولا نەبییێ وەعز و قسەی مەولانا
تۆوی سەر خستووە بن خاکە سەرئەفرازیی بەر
هەر لە ڕێگەی تەڵەبا بوو سەری دانا، دانا
وتم ئەو خاڵە چ بوو هەر کەڕەتێکت دەرخست
وتی داغێ بوو بەجەرگ و دڵی (مەحوی) مانا

مەحوی لەم شیعرەدا لە گەشتی خەیاڵبازی شیعری گێتی سۆفیزمدا پیاسە دەکا. هەموو شت پێچەوانەی ویستی ئەوە. خۆی دەکا بەخاک بەڵام مەعشووق بەسەریدا هەنگاو نانێ، ئارەزووی ئاوی ژیان دەکا بەڵام لە سەرابستاندا بۆی دەگەڕێ. دنیا وا شێواوە پیاوی



ئاسایی لەسەر ڕووی زەوی نەماوە. پیاوی ماقووڵی وەک مەنسووری هەلاج لە سێدارە دراوە و هەڵواسراوە، سۆفییێکی گەورەی وەک زەنوونی میسری بەنەژاد نووبی لە (٨٥٩م) مردووە لە بن زینداندا ئازاری چەشتووە لە دەست ئۆتۆکراتییەتی خەلیفەی عەباسی لە بەغدا. بەچکەی مەیگێڕی پیری موغانی زەردەشتی چۆن ئامۆژگاری لە مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی وەردەگرێ! مەحوی ئەم دوو دیاردەیە بەپێچەوانەی یەکتری دەزانێ، بەڵام ئەگەر مەبەسی سۆفیزمی کۆزمۆسی بێ پیری موغانی زەردەشتی، خاوەنی عەقیدەی زەردەشتی بێ یا خاوەن مەیخانە، لەگەڵ مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی لە گێتی سۆفیزمدا یەکتری دەگرنەوە.

- ٤ -

موحەققەق هەر کەسێ مەسلەکیە حەقق و حەققییە مەنزوور
سولووکی چوونە سەردارە تەریقەی پیرییە مەنسوور
لە ئولکەی عیشقەدا بۆ هەر کەسێ سەرداریە مەنزوور
عولووی مەرتەبەی سەردارە بۆتە پەیڕەوی مەنسوور
دەڵێ دانام و دڵ خۆشی دەخاتە داوی زولف و خەت
ئەگەر عەقلی هەیە بۆچی حەزەر ناکا لە مار و موور
کەمالات و مەعاریف مەبیە بێ دەخلی هەوێنی عیشق
عەجەب پشکووتووە لەم جەزوە نارە پڕ بەعالەم نوور
بەخوێنم تینووە با نۆشی کات و نۆشی بێ ئەمما
لەسەر چی تۆ بڵێ ئەو لێوە مۆرە وا لە من بوو سوور
ویساڵت نارە هیجرت ڕۆژە ڕەش وەک ئافتابی تۆ
لە تۆ نەزدیکە پشکۆیە خەڵووزە گەر لە تۆ بێ دوور
تەعەججوب گرتمێ سۆفی کە تەسبیحم لە ملیا دی
کە بێ تەقریبە پیرێژن لەبەریا بێ بەر و بەرموور
بەزەرد و سووری دنیا زەردەواڵەت لێ نەگۆڕا بێ
بەهەنگی تێبگەی هەرنێشە نۆشێکی نییە زەنبوور
لە تێغی تۆ هەتا (مەحوی) شەرەفیابی شەهادەت بوو
خوێنی بوو بەئاو ئیتر لە داوێنت نەما مەحزوور

مەحوی لە بەشێکی زۆر لە شیعریدا یادی مەنسووری هەلاج دەکاتەوە وەکو کەسێکی خاوەن بیروباوەڕ دەیخاتە ڕوو، ئەو فرزەندە گەورەیەی گێتی سۆفیزم گیانی کردە قوربانی لە پێناوی بیروباوەڕی.

لەم شیعرەدا مەحوی مەنسووری خاوەن هەق دەکاتە بەڵگەی سەربەرزی و باڵایی. هەمیشە لە جێی بەرزدایە و پێویستە خەڵکی لاسایی بکەنەوە.

وردەکاری شاعیر لەم شیعرەدا لە چەند وێنەیێکدا بەدی دەکرێ، لەوانە بەلای ئەوەوە زانستی بەبێ دڵداری نرخی نییە، یا نزیکبوونەوە لە دلبەر ئاگر بارانە، دووری لێی ڕۆژی ڕەشە، وەک هەتاوە ئەوەی لێی نزیک بێ پشکۆیە و بڵێسەی هەیە، ئەوەی لێی دوور بێ خەڵووزی ڕەشە.

لەم شیعرەدا دیاردەیێک هەیە دێری یەکەم و دووەم یەکێکن، دەبوو تەنیا یەکێکیان بمێنێتەوە و ئەویتریان ببێ بەنوسخە، بەڵام دیارە لەبەر هەر هۆیێک بێ هەردوو دێر لە ناو تێکستی شیعرەکە ماونەتەوە.

- ٥ -

کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تۆ دەکەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا
کە خۆ دەرخەی وەکو خۆر دڵ وەکو شەونم لە خۆ بڕوا
کە ڕووحم تێ گەیی تۆ حەز بەدەرچوونی دەکەی دەرچوو
دەبێ عاشق کە دی بێزارە یاری بێ برۆ بڕوا
وتم با لەم دەر و لەم کۆیەدا ئانێ سوکوونەت کەم
وتی عاشق دەبێ هەر دەربەدەر بێ کۆ بەکۆ بڕوا
ڕەقیبت دەرکە ئەم بەر دەرکە پاکە پیس ئەکا فەرمووی
کە بەم بەر قاپییە لازم سەگێکی وایە بۆ بڕوا
وتی (مەحوی) من و تۆ ئافتاب و سایە ئیمسالین
جەنابی من کە دەرکەوتم دەبێ تەشریفی تۆ بڕوا

دڵی شاعیر دەبێ لە ناو مەحبووبدا بتوێتەوە، ئەمە بەنزیکبوونەوە دەبێ، کە نزیک دەبێتەوە توانەوەیێک دروست دەبێ وەکو چۆن شەونم لە ناو خۆردا دەتوێتەوە. خۆر کردگارە و دڵیش شاعیرە. بەڵام مەسەلەکە پێویستە تەنیا لە نێوان «دەبێ» و «نابێ»دا بێ و کۆتایی پێ نەیە. چونکە گیانی شاعیر لە ناو مەحبووبدایە هەر کاتێک ئەگەر



خۆشەویست بەم یەکێتییە ڕازی نەبوو پێویستە لە خۆیەوە دوور بکەوێتەوە. وەک شاعیران دەڵێن مەحویش لەگەڵ ئەواندایە: دڵدار و دلبەر نە بێ یەکتری هەڵدەکەن و نە لەگەڵ یەکتریش هەڵدەکەن، بۆیە مەحوی ئەم وێنە جوانانە دروست دەکا: عاشق دەبێ هەر دەربەدەر بێ و دوور لە یار بێ، تا ئەگەر سەگێکی بەردەرگاش بێ پێویست ناکا. شاعیر دەگاتە ئەوەی بڵێ ئەگەر لەگەڵ یار سێبەر و هەتاویش بن، ئەگەر یەکێکیان لە جێییێک بوو دەبێ ئەوی دیکەیان بڕوا.

- ٦ -

گەردی ڕێی هەستاوە جێ داوا دەکا
بەختە ماڵی چاوی کێ ئاوا دەکا
وەردەگێڕێ ڕوو کە سوجدەی بەر دەبەم
هەی دەڵێ کەی نوێژی ڕۆژ ئاوا دەکا
چاوە جێی ئەو شۆخە بێ وتم و وتی
ئەم مەلا شێخە قسەی بێ جا دەکا
کوشتەی ئەو چاوەم لە جەمعی کوشتەگان
خەنجەری موژگانی، من منها دەکا
دا بە یەکبارە بەبادا عومری خەڵق
دێ بەبا کاکۆڵەکەی تاتا دەکا
چاوەکەی بەیدەستی مەستیشە کەچی
هەر بە لەحزێ فیتنەیێ بەرپا دەکا
ئەو کە دڵ دوو قەد دەکا شیری برۆی
ئیکە خەنجەر بۆیە قەد خۆیا دەکا
زامی دڵ وێران و ماڵ ئاوا تەبیب
ماڵی وێرانم کەماڵ ئاوا دەکا
تورکی چاوی مەستی (مەحوی) مژدە بێ
وا کەبابی جەرگ و دڵ داوا دەکا

لەم شیعرەدا هەندێ وردەکاری شاعیر لە چەند وێنەیێکی ڕۆمانتیکی داهێنراوی ڕەمزی هەوای سۆفیزم بەرچاو دەکەوێ. تۆزی ڕێی پێی مەحبووب کە هەڵدەستێ دیارە جارێکی

ديکەش دەنیشێتەوە، جا چاوی ئەو سۆفییە بەختیار دەبێ ئەگەر تێیدا بنیشێتەوە، بێ گومان ئەو تۆز و گەردە لەباتی کل دەبێ.

مەحوی لەم شیعرەدا کێشەیێک لە نێوان مەحبووب و سۆفی دروست دەکا، کێشەکە لەوەوەیە چونکە سۆفی شێخ و مەلایە، نوێنەری تەریقەت و شەریعەتە. سۆفی کە ڕووی مەحبووب دەبینێ پێویستە سوجدەی بۆ ببا، بەڵام مەلا دەبێ ڕۆژی پێنج جار نوێژ بکا، کەچی نوێژی سۆفی کات و وەختی بۆ نییە، لەبەر ئەوە هەرکە پێویست بێ عیبادەت دەکا و سوجدە دەبا.

- ٧ -

ئەرێ دڵ بێ شەرابی لەعلی گوڵ ڕەنگت لە گوڵ چبکا
کە جیلوەی گوڵ لە گوڵشەن دا نەبێ بولبول لە چڵ چبکا
کە هەڵگیرسا لە نووری بادە شەمعی حوسنی جانانە
نەچێتە سەر تەریقەی حەزرەتی پەروانە دڵ چبکا
بەئاهم گەر ڕەقیبانت بسووتێن ئەی گوڵی ڕەعنا
مەڕەنجە تۆ خودا شوعلە لە ئاقاری چقڵ چبکا
هەتا ماوە دەبێ ئەشکی نەدامەت داوەرێنێ چاو
عەرەق ڕێتن نەبێ شەخسی لە کاری خۆ خەجڵ چبکا
سەفەر جائیز نییە با بۆ حەرەم بێ لەو بەروبوومە
فەقەت مەجزووبی زنجیری نەسیبی ئاو و گڵ چبکا
فەلەک هەرگا کەسێکی هەڵبڕی وەقتی هیلاکەتییە
کە سەر بۆ گەینە پەت بێ پێ لە کورسی و ئەسکەمل چبکا
لە عوششاق و ڕەقیب ئەو شۆخە چاوی لوتفی وەرگێڕا
کە ئاسک ئادەمی یا سەگ ببینێ غەیری سڵ چبکا
چ حاجەت نێرگسی مەستت بکەم وەسفی بەمەخمووری
کە چاوی سورمە کێشراوی خودایی بێ لە کل چبکا
لە هەر جێیێک هەڵێ خورشیدی عیشقی گوڵ روخان (مەحوی)
ئەگەر عەقڵی ببێ لەو جێگە ئاونگی عەقڵ چبکا

لێرەدا مەحوی بەهیوای ئەوەیە دوو شت بگەنە یەکتری، خۆی و کردگار. دڵ هی



مەحوییە، شەرابی لێو هی مەحبووبە. بولبول مەحوییە، گوڵی گوڵشەن مەحبووبەیە، بەڵام ئەم دوو شتە نەگەیشتوونەتە یەکتری و یەکێتی دروست نەبووە. بەڵام مەحوی واز ناهێنێ و خەیاڵی بەرفراوانی لە گێتی داهێناندا لە باڵەفڕێ دایە. دەڵێ پرتەو هی کردگارە، دڵی شاعیر پێویستە لە ناو ئەو پرتەوەدا بتوێتەوە و یەکێتی دروست ببێ، لێرەدا پەروانە (پەپوولە) دەوری گرنگی هەیە، چۆن پەروانە واز ناهێنێ تا بەڕووناکی چرا دەسووتێ، شاعیریش واز ناهێنێ تا لە ناو پرتەوی کردگار دەتوێتەوە و دەبن بەیەک.

## نموونەی شیعری وەسفی سۆفیزم

شیعری وەسفی سۆفیزم وەسفێکی ڕووکەشی خوو و ڕەوشت و کردەوە پراکتیکییەکانی دەستووری سۆفیزمە، هەندێ جار خەریکی لێکدانەوە و شیکردنەوەی ڕاستی و زانیارییەکانی سۆفیزمە و تیۆری و دەستوورەکانی دەخاتە ڕوو. هەندێ جاریش دەم لە مێژووی سۆفیزم دەدا، بۆ ئەم ئامانجە پەنا دەباتە بەر زاراوە و لێکسیکۆنی سۆفیزم، وە بەشێوەی شیعری تەعلیمی (دیداکتیکی) بیروڕاکانی دەگەیەنێتە خوێندەواران.

شیعری ئایینی لای یارسانانی (ئەهلی حەق) کە بەدیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردییە دەچێتە ناو ئەم جۆرە شیعرەوە چونکە ڕێباز و دەستوور و مێژووی ئایینی یارسان و گەورە پیاوانیان هەمووی بەشیعر هۆنراوەتەوە، ئەوەی شایانی باسە لەم ڕووەوە ئەوەیە بەشێک لە کتێبی پیرۆزیان «سەرەنجام» شیعرە و بەشەکەی دیکەی پەخشانە.

مەحوی ئەگەر لە بەشی «شیعری سۆفیزمی کۆزمۆسی»دا نوێنەری داهێنانی «شیعری سۆفیزم» بێ، لە «شیعری وەسفی سۆفیزم»دا تەریقەت و شەریعەت تێکەڵ بەیەکتری دەکا بۆ چاکەی شەریعەت. وەکو لەم شیعرەدا دەردەکەوێ:

ڕێگەی هودا تەریقەتی عیشقە دە (مەحوی)ا
وەرن پیا بڕۆن (سەڵڵو عەلە ررەسوول)

لێرەدا مەحوی خۆی وەکو واعیزێک پیشان دەدا نەک وەکو سۆفییێک، کارەکەی زۆر ئاسان کردووە، ڕێگەی ڕاست خۆشویستنی پێغەمبەرە، دەبا سەڵەوات لە دیداری پێغەمبەر بدەین و بەو ڕێگەیە بۆی بڕۆین.

- ١ -

مەنسووری هەلاج جێگەیێکی دیاری داگیر کردووە لە شیعری مەحویدا و بەڵگەی خۆ بەختکردنە لە پێناوی بیروباوەڕ و ئیدیۆلۆجی، مەحوی لێرەدا وەکو سۆفییێکی ڕاست

مەنسووری هەلاجی کردووە بەرەمز بۆ خۆی بەپێچەوانەی هەندێ مەلا و پیاوی ئایینی موسڵمان کە مەنسووری هەلاجیان بە«بەدخوو» لە قەڵەم داوە.

گەڕان بەشوێن ڕاستیدا کردنەوەی سۆفییە، کۆمەڵێ قانوون و دەستوور ڕاستیی ساغ کردۆتەوە و باوەڕی بەداهێنان نییە لەبەر ئەوەیە مەنسووری هەلاج لە سێدارە دەدا چونکە دان بەداهێنان و ڕاستییەکەی ئەو ناهێنێ.

لە وڵاتی عیشقدا کە سۆفی لە مەحبووب دەگەڕێ ئەنجامی سێدارەیە، بەمە لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە پلەی بەرز دەبێ. لە کاتی هەڵواسیندا لەشی دەکەوێتە سەرووی ئادەمزاد وەکو مەعناش لەشی لەناودەچێ لە پێناوی بیروباوەڕدا، دیارە ئەمە دەبێتە ئیدیۆلۆجی و تەریقەت کە بەناوی مەنسووری هەلاجەوە خۆی دەنوێنێ.

«حەق»ی مەنسووری هەلاج بووە بەرەمز و بەڵگە و پێڕەو و قوتابخانە بۆ مەحوی:

بەحەق هەر حەق بەناحەق ناحەقم وتووە لە ڕۆژی بووم

وەکو مەنسوور ئەگەر بیشمکوژن ناکەم لە حەق لادەم

شاعیر لە حەق لانادا ئامادەیە بۆ ئەوەی ئەنجامی ئەویش وەکو ئەنجامی مەنسوور بێ.

لە حەق بێژی بووە بەحری (انا الحق) هەر قەسیدێکم

لەباتی جائیزە واجیب گەڕا قەتڵم بکەن واجیب

دیارە شاعیر ئەوەش دەزانێ کە ئەوەی حەق بڵێ دەبێ پاداش بکرێ بەڵام نەک پاداش ناکرێ و لێی دەگەڕێن بەڵکو لەناویشی دەبەن، ئەمەیە زۆرانبازی و چوونە مەیدان لە نێوان دەستووری خاوەن دەسەڵات و ڕاستی و داهێنان و دۆزینەوەی سۆفیزم.

- ٢ -

لەم ماوەیەدا تەنیا مەنسووری هەلاج یاری مەحوی نییە بەڵکو یاری دیکەش دەدۆزێتەوە، ئەمانە ڕەمز و بەڵگەی تری سۆفی و دەروێشانن بەشێکیان پێوەندییان بەدەروێشیزمەوە هەیە، لەبەر ئەوەیە لە چوارچێوەی شیعری وەسف ناچنە دەرەوە و ئەو وێنە داهێنراو و ڕەمزییانەیان نییە.

شاعیر دەڵێ:

نەگەیە ئەو جوانە و گەیە پیری

مەدەد یا پیری پیرانی بوخارا

واتە لە سەردەمی ئەو لاوە (مەنسووری هەلاج) نەژیام بەڵکو کەوتمە پاش سەردەمی



پیری پیرانی بوخارا کە بەهائەدینی نەقشبەندی شێخی تەریقەتی نەقشبەندییە کە مەحوی خۆشی ئەندامێکی ڕێکخراوی ئەو تەریقەتەیە.

لە شیعری تریدا دەڵێ:

خۆشی فەرموو چ مەجنوون و چ مەنسوور

بەشی عـــاشق درا هەر بەرد و هەر دار

«لەیلا»ی مەجنوون و «حەق»ی مەنسووری هەلاج یەک شتە لە پێناوی نزیکبوونەوە لەو شتە وتووانەوە لە ناویدا، مەجنوون بەردە باران کرا و مەنسووری هەلاجیش لە سێدارە درا.

- ٣ -

هەموو تازەکەرەوە و داهێنەر و شۆڕشگێڕێک کە دەیەوێ گۆمی مەند بشڵەقێنێ تاوانێ و گێرەشێوێنێ و تێکدانی شیرازەی کۆمەڵ و شتی دەدرێتە پاڵ. ئەوەی لە شاری دەستوورا لە قانوون بچێتە دەرەوە بەشێت دەدانرێ. بالوولی دانا شێت بوو مەحوی باس لە شێتێکی سلێمانی دەکا:

ڕەحە بەو شێتییە ئەلحەق قسێکی عاقلانەی وت

منم عاقڵ لە بەرگی عارییە خۆمم کە عاری کرد

ئادەمزاد بەڕووتی خولقاوە، جلوبەرگ جەوهەری ئادەمزاد دادەپۆشی کەچی ئەوەی بگەڕێتەوە سەر ئەسڵەکە وەکو ڕەحە بەڕووتی بگەڕێ بەشێت لە قەڵەم دەدرێ بەڵام دیارە هەر ڕەحەش ڕاست دەکا چونکە خۆی لە شتێکی سەپێنراو بەسەریدا (کە جلوبەرگە) ڕزگار کرد. دیسانەوە لە بابەت شێتییەوە دەڵێ:

جونوونی نەو زوهوورە (مەحوی)! دێوانەگی مەنسوور

کە دێوانەن هەموو مائیل بەبەرد ئەو مەیلی داری کرد

شێتیی مەنسووری هەلاج لەبەر ئەوە بوو بەرهەڵستی کۆمەڵێ قانوون و دەستووری کرد ئەنجامی گەیاندە سەر قەنارە کەچی شێتی تر بەرد کۆ دەکەنەوە و دەیگرنە یەکتری.

مەحوی لەو دێرانەیدا ئەگەرچی لە ڕووی ئیستێتیکییەوە نەگەیشتۆتە پلەی شیعرەکانی دیکە لە ڕووی سۆفیزمەوە بەڵام گیانێکی فێرکردنی (تەعلیمی) داوەتێ و هەندێ لایەنی مێژووی سۆفیزم و نەریتی تەریقەتی ڕوون کردۆتەوە.

## شیعری دژی دەروێشیزم

دەروێشیزم لایەنی پراکتیکی ڕەشبینی سەلبی سۆفیزم دەور دەکاتەوە، خەریکی لاپەڕە تاریکەکانیەتی، دەروێشیزم بوو بەدیاردەییەکی کۆمەڵایەتی دەسەڵات (بەتایبەتی عوسمانی) بەکاری دەهێنا و کردبووی بەداردەست بۆ ڕاووڕووت و بەنجکردنی خەڵکی ناو کۆمەڵ. شیعری دژی دەروێشیزم دوو شێوازی وەرگرتووە، یەکەمیان پەنجە درێژکردن بۆ هەندێ کار و کردەوەی خراپی دەروێشیزم و بەراووردکردنی لەگەڵ کەموکووڕی و ناگزووری کۆمەڵایەتی بەشێوەیێکی هونەری، دووەمیان هێرش بردنە بۆ سەر خوو و ڕەوشت و دیاردە پراکتیکییەکانی دەروێشیزم وەکو ڕووداوێکی دواکەوتوو و کۆنەپەرست لە ناو کۆمەڵی کوردەواریدا.

دەروێشیزم هەندێ دەستوور و خوو و نەریت و بیروباوەڕی سۆفیزم لە ڕووی پراکتیکییەوە دەور دەکاتەوە، ڕەنگە لە سەرەتادا لە دژی دەسەڵات بووبێ، بەڵام لە پاشانا لەگەڵ دەسەڵات یەکی گرت و بەناوی «تەریقەت»ەوە کەوتە ناوەوە و بوو بەپاڵپشتی دەسەڵات وەکو لە مێژووی سۆفیزمی ئیسلامیدا دەردەکەوێ، تیۆریی هەموو فەیلەسوفەکانی سۆفیزم نەبووە بەتەریقەت بەڵکو بەشێکیان، هەر ئەو بەشە بووە بەڕێکخراو و بەناوی شێخی خاوەن تیۆرییەکانی سۆفیزم ناوبانگی دەرکردووە، لە سەرانسەری بزووتنەوەی سۆفیزمی ئیسلامیدا، نموونەی تەریقەتە گرنگەکان ئەمانەن:

تەریقەی تەیفووری یا بەستامی، تەریقەتی جونەیدی، تەریقەتی قادری، تەریقەتی ڕیفاعی، تەریقەتی شازلی، تەریقەتی مەولەوی (جەلالەدین ڕۆمی)، تەریقەتی بەکتاشی، تەریقەتی نەقشبەندی، تەریقەتی حرووفی و هی تریش.

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە ئەگەر بەوردی تەماشای ئەم تەریقەتە دەروێشییانە بکەین دەبینین ڕێبەر و شێخەکانیان وەکو خاوەن تیۆریی سۆفیزم بیروڕا و بۆچوون و زانیاریی ئەوتۆیان نەخستۆتە ناو بزووتنەوەی سۆفیزمییەوە زیاتریش ناویان هەر بە«دەروێش» ڕۆیشتووە وەکو لە عەرەبیشدا دەبینین زاراوەی «الدروشة» بۆ ئەم بزووتنەوەیە بەکار دێ، هەروەها ئەم تەریقەتانە بەگشتی نەبوونە هۆی داهێنانێکی ئەدەبی، بێ گومان لێرەدا دەبێ حسێبێکی تایبەتی لەگەڵ جەلالەدین ڕۆمی بکرێ.

ئەمە و لە لایێکی ترەوە کردەوە پراکتیکییەکانی ڕێکخراوی تەریقەتی دەروێشی بۆتە هۆی ئەوەی «دژی دەروێشیزم» لە بەرهەمی ئەدەبی نەتەوە موسڵمانەکاندا پەیدا بێ.



ئەوەی زۆر دیار و ئاشکراشە لە بابەت مێژووی دەروێشیزم لە کوردستانا وەکو ڕێکخراوێک بەشێوەییێکی ڕەسمی لە سەدەی هەژدەمدا پەیدا بووە بەناوی دوو تەریقەتی بەناوبانگ قادری و نەقشبەندی، دەسەڵاتی عوسمانی ڕێزی لێ گرتوون و یارمەتی داون.

لەم ڕۆژگارەدا سۆفیزیم وەکو ڕێباز و فەلسەفە و ئیدیۆلۆجی و داهێنانی ئەدەبی لە گێتی موسڵمانیدا بەسەرچوو بوو.

مەحوی لەم جۆرە شیعرەیدا زیاتر وەکو دادپەروەرێکی کۆمەڵایەتی و دڵسۆز، مرۆڤایەتی و لایەنگیری مافی ئادەمزاد خۆی پیشان دەدا. بێ گومان ئەم جۆرە شیعرانە شێوەی شیعری فێرکردن (تەعلیمی)یان وەرگرتووە، لێرەدا شاعیر تەماشای لایەنی ڕەشبینی بزووتنەوەی دەروێشیزمی کردووە بەتایبەتی لە سەردەمی ئەودا دەورێکی گەورەی بووە لە دواکەوتنی کۆمەڵ لەبەر ئەوە هێرشی بردۆتە سەر ڕەوشتیان و ڕەخنەی لە کردەوەیان گرتووە لەم جۆرە شیعرانەیدا زاراوەکانی شێخ سۆفی دەروێش واعیز زاهید... بەکار دێنێ.

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

کە شێخ و واعیز و سۆفی بەجەننەت بەن گەد و گیپاڵ
دەبێ ئەمساڵی ئێمە بۆ جەهەننەم بەن سڕوسیپاڵ

شێخ و واعیز و سۆفی ڕاست گەد و گیپاڵی نابێ بەپێچەوانەوە لەڕولاواز سڕوسیپاڵی لەبەرا دەبێ کەوا بێ ئەمانە ڕاست نین و درۆ دەکەن، ئیتر کە ئەمانە جێگەیان بەهەشت بێ پێویستە هی وەکو مەحوی جێگەیان دۆزەخ بێ، بەڵام مەحوی بەهەموو جۆرێ ئەنجام بەپێچەوانەی ئەمە دەزانێ.

ڕیش و پرچ هێشتنەوە کە ڕەمزی دەرەوەی سیمای دەروێشانە دەبێتە هۆی ئەوەی مەحوی پەیکەری دەروێش لەگەڵ پەیکەری جوولەکە بەراوورد بکا:

ڕیشێکی پان و تووکی بناگوێ درێژ و لوول
سۆفی لە دینی لادە بەدیمەن لە جوو دەکا

ئێمە دەزانین نەوەکو تەنیا جوولەکە بەڵکو هەموو موسڵمانێک نرخیان لای مەحوی وەکو مەلا و شێخێک چەندە!

لە بابەت واعیز و زاهیدەوە مەحوی دەڵێ:

لالغاوەی واعیزا ئەمڕۆ مەوج ئەدا دەم پڕ لە کەف
ڕیشی قیروسیا کتێبی وەعزەکەی بوو بەتەرەف

مەحوی گاڵتە بەواعیز دەکا بەوەی ئەوەی دەیڵێ هەر دەیڵێتەوە، دەمی کەفی کردووە و بەڕیشیدا هاتۆتە خوارەوە، کتێبی وەعزەکەشی هەر ئەوەیە نەگۆڕاوە، بەدرێژایی ڕۆژگار نە کەمی کردووە نە زیاد، دوورە لە داهێنان و گۆڕان.

ئینجا دێتە سەر زاهید و سۆفی وەکو دوژمنی یەکتری و دەڵێ:

زاهید و سۆفی بەشەڕهاتن لەسەر تەزویر و شەید
خێری ڕەندانە خودا کا بەتەرەف بێ هەر تەرەف

ئەمانە لەسەر کاری قەلب و چرووکێ خۆیان بەشەڕهاتن دیارە ژێرکەوتنی هەر لایێکی ئەم بێ بارانە قازانجی پیاوچاکانی تێدا دەبێ، ئەگەر هیچ کامێکیشیان سەرنەکەوێ باشتر.

لە بابەت زاهیدەوە دیسانەوە دەڵێ:

زاهید خودا لە ناوی بەرێ ناوی عاشقان
بۆچی دەبا ئەوەندە خودایا بەبێ ئەدەب

زاهید بەڵگەی درۆیە عاشق بەڵگەی ڕاستییە لەبەر ئەوە زاهید ناوی عاشقان بەخراپە دەبا، ئنجا شاعیر ڕوو دەکاتە واعیز:

واعیز لە من بلێ بەنەزەر تەعنە بەس بدا
دینی بتانە دینی من ئەو مەزهەبی زەهەب

واعیزیش دیسانەوە لە عاشق دەدا بەڵام دەبێ ئەوە بزانێ کە عاشق مەحبووب (کردگار، بت، جوانی) دەپەرستی بەڵام واعیز زێڕ و سامان دەپەرستێ.

شاعیر دێتە سەر واعیز و دەڵێ:

بەدەفعی سیخنی کردن لە زاهید ڕاغیبی مەی بوو
کەچی ساقی وتی: نادەم بەکەم فام ئەزمەیی گوڵ فام

ئەگەر زاهید بیەوێ بێتە سەر ڕێی ڕاست و داوای مەی بکا ساقی دەوران بادەی ناداتێ چونکە بەفێڵبازی داناوە و باوەڕی پێ ناکا.

ئەم بابەتە شیعرەی مەحوی دەچێتە ناو شیعری چاککردنی باری ژیانی کۆمەڵایەتی و زیاتریش بۆ فێرکردن و ڕێ پیشاندانی خەڵکی بەکار دەهێنرێ لە ڕووی ئیستێتیکیشەوە لە پلەی شیعرەکانی تری نییە.

***

مەحوی شاعیرێکی گەورەیە، شاعیرییەتی زاڵە بەسەر بیروباوەڕ و ئیدیۆلۆجییەتی،



وەک شاعیرێک کەوتۆتە ناو تەنگوچەڵەمەی بیرییەوە. لە ڕوخساردا هونەروەرە، ڕێکوپێکە بۆیە ئەگەر دوو ڕای پێچەوانەی یەکتریشی بووبێ وەکو ناوەڕۆک لە دەربڕینی هەردووکیاندا سەرکەوتووە.

مەحوی وەکو ڕێبەرێکی ئایینی باوەڕی تەواوی بەئیسلام بووە، ئایینە ئاسمانی و زەوییەکانی کۆنی پێش ئیسلامی ڕەت کردۆتەوە، بەهاتنی ئیسلام ئەم ئایینانە هەموویان بەتاڵ بوون و هەموو ئایینزاکانی ئیسلام و نائیسلامیشی ڕەت کردۆتەوە.

مەحوی وەکو شێخێکی تەریقەتی نەقشبەندی باوەڕی بەتێکەڵکردنی تەریقەت و شەریعەت بووە، ئەمەش بەمانای تەریقەت لە پێناوی شەریعەتدا نەک پێچەوانە. شیعری دژی دەروێشیزم لای شاعیر لە پێناوی چاککردنی باری کۆمەڵایەتی بووە. وەک شاعیرێکی چاک سوودی لە سۆفیزم یاخود شیعری سۆفیزمی ئیسلامی پێش خۆی وەرگرتووە، هەندێ شیعری دەچێتە ناو بیروباوەڕی سۆفیزمی کۆزمۆسی لە ڕووی تیۆرییەوە لەگەڵ سۆفیزمی ئیسلامیش دەگونجێ.

لە زاراوە و تەعبیر و لێکسیکۆندا شەقڵی شیعری سۆفیزمی ئیسلامی پێوە دیارە بەتایبەتی شاعیرە گەورەکانی نەتەوە هاوسێکانی کورد. لەمەوە دەتوانین بڵێین لەگەڵ ئەوەی مەحوی تەریقەتی بۆ شەریعەت بەکارهێناوە، هەموو ئایینە کۆن و تازەکانی ڕەت کردۆتەوە، بەڵام لە بەشە شیعرییە سۆفیزمییەکانیدا توانیویەتی بەرهەمێکی ئەوتۆ دابنێ لە ڕووی ڕەمزی سۆفیزمی و ئیستێتیکی ڕۆمانتیزمییەوە بەرامبەر بەرهەمە گەورەکانی سۆفیزمی ئیسلامی بوەستێ و ببێ بە«موتڵەق» و لە لایەن هەموو کەسێکەوە چێژی لێ وەربگیرێ و بەچاوێکی بەرز تەماشا بکرێ.

## بەشی یازدەم

# ساڵح

## ١٨٣٤ - ١٩٠٥

### بەسەرهاتی شاعیر

ساڵح یا سەید محەممەد ساڵح لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بەمیر محەممەد ساڵح حەسەنی نیعمەتوڵڵاهی کرماشانی ناسراوە. نازناوی لە ڕێکخراوی تەریقەتی سۆفیزمی نیعمەتوڵڵاهیدا حەیران عەلی شا بووە. ساڵح ناوی حەسەنی هەڵگرتووە چونکە سەید بووە، لە نەوەی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیب. نیعمەتوڵڵاهی پێ وتراوە چونکە دەروێش و ڕێبەری تەریقەتی نیعمەتوڵڵاهی بووە، بەکرماشانی ناسراوە چونکە لە ساڵی ١٨٣٤ لە ئاوایی ماهیدەشتی سەر بەکرماشان لە دایکبووە و زۆربەی ژیانی لەوێ بردۆتە سەر.

تەریقەتی نیعمەتوڵڵاهی لە لایەن نیعمەتوڵڵای کوڕی میر عەبدوڵڵا (١٣٢٩ - ١٤٣٠) دامەزراوە. ئەم زاتە لە حەڵەب لە دایکبووە. سەردەمی لاویەتی لە بەغدا بردۆتە سەر. لە تەمەنی بیست و چوار ساڵیدا حەجی کردووە و حەوت ساڵ لە مەککە ماوەتەوە. لە سەمەرقەند و هەرات ژیاوە، لە دواییدا شاری ماهانی کردووە بەمەڵبەندی ژیانی و دوا قۆناغی کە بیست و پێنج ساڵ بووە لەوێ ژیاوە. لە تەمەنی سەد ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. ئارامگای لە شاری ماهان لە جێگە پیرۆزەکانی دەروێش و سۆفیانی تەریقەتەکانی سۆفیزمە بەتایبەتی تەریقەتی نیعمەتوڵڵاهی.لە شیعردا دەستی باڵای بووە.

سەید ساڵح هێشتا لە تەمەنی لاویدا بووە کە ژیانی گۆشەگیری هەڵبژاردووە و زۆربەی کاتی لە حوجرەی مزگەوت بردۆتە سەر. ڕۆژگاری خۆ دروستکردن و باوەڕ بەخۆکردن لە ژیانی شاعیردا بەسەر دوو مەبەس دابەش کرابوو. یەکەمیان فێربوونی زانستییەکانی ئایینی ئیسلام بووە، دووەمیان بیرکردنەوە لە گێتی بێ پایانی سۆفیزم.

لە تافی لاویدا لە دوای ئەوەی هەندێ لە زانستییەکانی ئیسلام و نهێنییەکانی سۆفیزمی لا ئاشکرا بوو، بۆ زێدەکردنی زانیاری لە بارەی شەریعەت و تەریقەتەوە ڕووی کردۆتە شاری کاشان و بەدیداری شێخ محەممەد حەسەنی کاشانی شاد بووە. ئەم کەسە



یەکێک بووە لە شێخ و ڕێبەرە گەورەکانی تەریقەتی حەققەی نیعمەتوڵڵاهی کە ئەویش نازناوی عەبد عەلی شا بووە.

لە دوای خوێندن و وەرگرتنی سولووکی پێویست لە بابەت ئەم تەریقەتەوە، سەید ساڵح ئیجازەی تەریقەتی نیعمەتوڵڵاهی لەم شێخە وەرگرتووە. لەو کاتەی هیوای دێتە جێ و مەبەسی خۆی دەست دەخا، دەکەوێتە سەر هەوەسی گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆی. بەم جۆرە دەگەڕێتەوە کرماشان، بەڵام زۆری پێ ناچێ دووبارە ڕوو دەکاتەوە کاشان و جارێکی دیکە بەدیداری شێخی ڕێبەری شاد دەبێ.

لە پێناوی بەهێزکردنی گیانی سۆفیزم لە ناو دڵ و دەروونی و پاککردنەوەی گیانی لە هەموو خەوشێک ڕوو دەکاتە مەشهەد لە خۆراسان، لە یەکێ لە ژوورەکانی ئارامگای ئیمام عەلی کوڕی مووسای ڕەزا خەریکی ڕیازەتی سۆفیزم دەبێ. لە پاش ماوەیێک دەگەڕێتەوە کاشان و لەوێ مۆڵەت لە شێخی گەورەی دەخوازێ ڕێگەی بدا و بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی و لەوێ ببێ بەیەکێ لە ڕێبەرەکانی تەریقەتی حەققەی نیعمەتوڵڵاهی.

سەید ساڵح لە ماوەی زیاتر لە سی ساڵ خانەقای تایبەتی خۆی بووە. ڕێبەری سەدان کەسی کردووە، بیروباوەڕی تەریقەتی حەققەی نیعمەتوڵڵاهی بڵاوکردۆتەوە. لە ماوەی نیشتەجێبوونی لە وڵاتی خۆیدا زیارەتی ئارامگای هەموو ئیمامانی شیعەی کردووە لە وڵاتی عێراقدا. سەید ساڵح لە ساڵی ١٩٠٥ کۆچی دوایی کردووە، لەسەر داوای خۆی لە گۆڕستانی گشتی دەرەوەی ئاوایی فەیزاباد نێژراوە. ئەم ئاواییە سەر بەشاری توربەتی حەیدەرییە لە ئوستانی نۆیەم (خۆراسان)ی ئێران، کەوتۆتە لای باشووری نیشابوور و ڕۆژهەڵاتی کاشمەر.

### خاسیەتی شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

دیوانی شاعیر بۆ جاری یەکەم لە ساڵی ١٩١٧ لە کرماشان چاپ کراوە. وەکو دەردەکەوێ ئەم چاپە کەموکووڕی زۆری تێدا بووە. بۆ جاری دووەم لە لایەن محەممەد حەسەنی حەیرانی لە ساڵی ١٩٤٥ لە چاپخانەی کاوە لە کرماشان لە چاپ دراوەتەوە بەناوی «کەنزولعیرفان (كنز العرفان)- دیوانی غەزەلیاتی حەزرەتی میر محەممەد ساڵح حەسەنی نیعمەتوڵڵاهی مولەقەب بەحەیران عەلی شا». بڵاوکەرەوە پێشەکییێکی بۆ ئەم چاپە نووسیوەتەوە.

زمانی شیعری ساڵح لە بنجدا دەچێتەوە سەر دیالێکتی گۆرانی زمانی کوردی، بەڵام

ئەدگاری دیالێکتی کرمانجی باشوور و وردە دیالێکتەکانی لوڕی و دەوروبەری کرماشانی پێوە دیارە.

بەرهەمی ئەم شاعیرەمان وەکو هەموو شاعیرانی دیکەی گۆرانزەمێن لە ڕووی کێشەوە دە سیلابییە، وەستان لە ناوەڕاستیدایە. بەگشتی ئەم جۆرە شیعرە لیریکییانە نیوە دێری یەکەم لە پێنج بڕگە (سیلاب) پێکهاتووە، بۆ ئەوەی لەگەڵ هەموو نیوە دێرەکانی دیکە ڕێک بکەوێ پێویستە ڕستە پێنج بڕگەییەکە دووبارە بکرێتەوە بۆ ئەوەی نیوە دێرەکە ببێ بە دە بڕگە و وەستان لە ناوەڕاستدا بێ. بۆ بەڵگە لە سەرەتای لیریکێکیدا دەڵێ:

مات و حەیرانم
یاڕەب لە دەرگات مات و حەیرانم

ئەم دێرە دەکرێ وەک نووسراوە بخوێندرێتەوە، یا ڕستەی نیوە دێری یەکەم دووبارە بکرێتەوە:

مات و حەیرانم مات و حەیرانم
یاڕەب لە دەرگات مات و حەیرانم

بەڵام وەک دەردەکەوێ ساڵح نەیویستووە ڕستە پێنج بڕگەییەکە دووبارە بکرێتەوە. لە هەموو لیریکەکانی دیوانیدا لەسەر ئەم دەستوورە ڕۆیشتووە.

یەکێ لە خاسیەتە تایبەتییەکانی دیکەی شیعری ساڵح، شاعیر هاتووە دێری یەکەم و دێری دووەم، واتە هەر چوار نیوە دێری یەکەمی هەموو لیریکێک لەسەر یەک قافیە ڕێکخستووە، وەکو:

گەنج نیهانی
ئیسم تو میفتاح گەنج نیهانی
پەنهانی لە پشت پەردەی پەنهانی
نە هەر من ماچوم عالەم کول زانی

واتاکەی:

خەزنەی نهێنی
ناوی تۆ کلیلی خەزنەی نهێنییە
نهێنی لە پشت پەردەی نهێنییە
ئەمە تەنیا من نایڵێم هەموو کەس دەیزانێ



ئینجا لە دوای ئەو شیعرە کە لەسەر بنچینەی جووت قافیە (مەسنەوی) بەڕێوە دەچێ (ا ا، ب ب، ج ج...) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە بەرهەمی شیعری وا بەرچاو دەکەوێ هەموو شیعرەکە لەسەر یەک قافیە دەبێ، نەوەکو تەنیا نیوە دێرە دووەمەکان، بەڵکو نیوە دێری لیریکەکە هەمووی بەگشتی.

لە ڕووی کورتی و درێژی شیعرەکانەوە، دەتوانرێ دوو زاراوەی «غەزەل» و «قەسیدە» بۆ شیعرە لیریکییەکانی ساڵح بەکار بهێنرێ، بەناوی ئەوەی شیعرە کورتەکان بە«غەزەل» حسێب بکرێن و درێژەکان بە«قەسیدە» حسێب بکرێن، لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا ئەم دوو زاراوەیە بەکار دەهێنرێن.

ساڵح دوو دێرە شیعری سەرەتای هەموو بەرهەمی شیعری یا چوار نیوە دێر شیعر، خۆیان وەک چوارینێک دەنوێنن لەسەر یەک قافیە بن وەکو:

سەید ساڵح عاشق خواجە قەنبەرەن
گوفتەی ئو وکەلام ساقی کەوسەرەن
موشتاقی لیقای حەیی حەیدەرەن
لەفزی گوهەربار ئیمان پەروەرەن

واتاکەی:

سەید ساڵح عاشقی خواجە قەنبەرە
قسەی ئەو قسەی مەیگێڕی کەوسەرە
موشتاقی بینینی حەیدەری زیندووە
وتەی (شیعری) گەوهەرە و خۆی ئیماندارە

ئیتر شیعری دیکەی سەرانسەری دیوانی کە لە نەوەد پارچە زیاترن لە پێنج دێرەوە پێکهاتوون تا لە هەشتا زیاتر.

بێ گومان زۆربەی لیریکەکانی ساڵح بەغەزەل دەژمێررێن، واتە ئەو شیعرانەی لە پێنج دێرەوە تا دەوروبەری بیست دێر، دەمێنێتەوە بەشێکی کەمتر دەتوانرێ بەقەسیدە ناویان ببرێ ژمارەی دێرەکانیان دەگاتە سی دێر شیعر. سێ قەسیدەی زۆر درێژیشی هەیە لە شەست و چوار، حەفتا و چوار، هەشتا و دوو دێر پێکهاتوون.

لە دیوانی ساڵحدا حەوت پارچە شیعری لیریکی بەرچاو دەکەوێ لە شێوەی تەرجیع بەند و تەرکیب بەندی ئیسلامەوی و سۆنێتی شیعری ئەورووپایی دەکەن. هەر پارچەی لە

هەشت دێرە شیعر پێکهاتووە، بەمەرجێک هەموو نیوە دێرە شیعرەکان لەسەر یەک قافیەن دێری دوایی نەبێ، دێری هەشتەم لە هەموو بەندەکان (کۆپلەکان)دا دووبارە دەبێتەوە.

نموونەیێک لەو شیعرانە:

من و زات هوو
ئیـــبـــتـــیـــدا مـــەکم من و زات هوو
وە زبـان حـــــەق مــــــواچـم وە تـوو
گوللو شەیئـ هالیک ئیللا وەجهوهوو
(کل شيء هالك الا وجــــــهـــــــه)
گـــووش و دل واکـــە تـا باچم لە نـوو
فـەرهاد سیفـەتان کـەم وە نەقش کـوو
لە واتم لەیلا ئەفـــســـــانە مـــو وو
عـالەم چون مـەجنوون دێـوانە مـو وو
دل کـەش وە مـیرئات ئەسـرار مگوو
چون تەرســـا بـەچە بنیش ڕووبەڕوو
خـوا مـووش بەنین جاکـە گـفـتـوگـوو
تا بوینی جەمال دل ڕوبای خۆشخوو
گووش و دل بدەر وە ساحێب سەروو
بشنەو ژ سـاغـیـر ژ سـەهبـاو سـەبوو
وە لیـــســـــان غــەیب مــواچن وە توو
گوللو شەیئـ هالیک ئیللا وەجهوهوو

واتاکەی:

من و زاتی ئەو
سەرەتا دەست پێ دەکەم من و زاتی ئەو
بەزمانی حەق بەتۆ دەڵێم
هەموو شت نامێنێ تەنیا شێوەی ئەو نەبێ
گوێ و دڵم بکەرەوە تا لە نوێ بژیبێمەوە
وەکو فەرهاد کێو بنەخشێنم
سەربردەی لەیلا ئەفسانە نییە



خەڵکیش هەموو وەکو مەجنوون شێت نابن
دڵ ڕەنگدانەوەی نهێنییەکانی مگوویە
وەکو بەچکەی گاور بەرامبەر بەیەکتری دادەنیشین
هەمیشە و هەردەم پێویستە گفتوگۆ لە ناوەوە بێ
تا بەڕوونی جوانی دڵ دەربکەوێ
گوێ و دڵت بدەرە خاوەن نهێنی
گوێ لە پیاڵە و سوراحی و مەی بگرە
بەزمانی غەیبەوە پێت دەڵێن
هەموو شت نامێنێ تەنیا شێوەی ئەو نەبێ

لەم لیریکەدا وەک دیارە ئاماژە هەیە بۆ دڵداری لەیلا و مەجنوون و کچە گاوری ئەرمەن یا گورج (شیرین). هەروەها ناوی «ئەسراری مگو = نهێنییەکانی مگو» هاتووە. ئەمەیان سـرووەدێکی ئایینی یارسـانانە بەناوی دەورەی وەزاوەر، بەشـێکە لە دەفـتـەری پیـرۆزی پیردیوەری یارسانانی گۆران.

## خاسیەتەکانی شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

ساڵح سەرتاپای شیعری تەرخان کردووە بۆ مەبەسێکی سەرەکی، ئەویش تێگەیشتنی فەلسەفەی سۆفیزمە، خۆی لە ناو تەمومژی ئەو گێتییە نادیارەدا نوقوم کردووە، ڕاستە شاعیر دەروێشی تەریقەتی نیعمەتوڵڵاهی بووە کردگاری لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب دیوە، بەڵام بەگشتی هەموو بۆچوون و بیروڕاکانی ڕەنگدانەوەی فەلسەفەی «یەکێتی بوون»ی گشتی سۆفیزمی کۆزمۆسی و سۆفیزمی ئیسلامییە. ئەگەر لە شیعریدا هەست بەئەڤینی مێیینە و دڵداری ژنان بکرێ، ئەو کچە جوانە وێنەی ڕاستی کردگارە.

بیروباوەڕی سۆفیزم کە هەموو «بوون = گەردوون» دەگرێتەوە، لە گێتی کەموکووڕییەوە دەکەوێتە ڕێ و ڕوو دەکاتە گێتی «کامل»ی، شاعیر ئەم دیاردەیەی لە خۆیدا دەبینێ، هەندێ جار لە ڕووی باوەڕی سۆفیزمییەوە خۆی وەک بەتواوەییێک لە ناو کردگاردا دەزانێ، بەمە دەبێتە شتێکی «کامل»، ئەمە لایەنی گیانی شاعیرەکەیە، کەچی پێچەوانەی ئەمەش لای شاعیر بەرچاو دەکەوێ لەو کاتەی کە خۆی بەئادەمزاد دێتە بەرچاو، واتە لایەنی مەتریالی وەک گۆشت و ئێسقان، لەم حاڵەتەدا خۆی بەنزمترین کەسێک پیشان دەدا.

ساڵح لە بەشێکی زۆری بەرهەمی شیعریدا شێوازی گفتوگۆ (دیالۆج) بەکار دێنێ، واتە خۆی و کەسی دووەم قسە دەکەن، بەڵام شاعیر تەنیا خۆی قسە دەکا، بەرامبەرەکەی دەنگی لێوە نایە. لەم جۆرە شیعرەیدا بەزۆری ئیمامی عەلی دەردەکەوێ.

شاعیر ناوی خۆی «سەید ساڵح» وەک نازناوێک لە بەرهەمی شیعریدا زۆر بەکاری دێنێ، نەک تەنیا لە دوا دێری لیریکەکانی بەڵکو لە سەرەتا و ناوەڕاستی شیعرەکانیشیدا بەدی دەکرێن. هەندێ جار نازناوی زیاتر لە جارێک لە پارچە شیعرێکیدا بەکاری دەهێنێ.

## گەشتی گێتی لاهووتی

## شیعری ساڵح

گێتی شیعری ساڵح بەڕووکەش وەک گێتییێکی تەسک و تروسکی سنوور کێشراو دەکەوێتە بەرچاو. پیاو وا هەست دەکا لە بیروباوەڕ و بۆچوون و ڕەوشت و دەستوورەکانی سۆفیزم ناچێتە دەرەوە. ئەم قسەیە ڕاستە، بەڵام سەرچاوەکە واتە سۆفیزم بەڕاستی و لە بنجدا ئەوەندە فراوانە دەتوانین بڵێین بێ دواییيە، وەک مەبەسەکانی شاعیر وەک شتێکی سنوور کێشراو دەکەونە بەرچاو، بەڵام لە ڕووی ڕوخسارەوە چۆن ساڵح توانیویەتی لە قاڵبی کێشی خۆماڵی دە سیلابی و قافیەی مەسنەوی نەچێتە دەرەوە، واتە تەنیا یەک کێش و یەک جۆرە قافیەی بەکارهێناوە. هەروەها توانیویەتی لە مەبەسی سۆفیزم بەتایبەتی لە موناجاتدا نەچێتە دەرەوە، بەم جۆرە لە ڕوخسار و ناوەڕۆکدا ئاسۆی فراوان و هەمە ڕەنگ نییە، بەڵام توانیویەتی بەوەستایەتی شاعیرییەتی خۆی هەردوو ئەم جەوهەرە سنوور کێشراوە لە ناو یەکتریدا بتوێنێتەوە و بەرهەمێکی ئەدەبی بەرزی لێ دروست بکا.

### شاعیر کوردایەتی دەکا

ساڵح وەک دەروێشێکی سۆفیزمی کۆزمۆسی بێ گومان دەبوو بایەخێکی ئەوتۆ نەدا بەدیاردەی نەتەوەیی، ئادەمزاد بەلای ئەوەوە دیاردەیێکە نەتەوە ئایین جیای ناکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە دلبەرەکەی دەکا بەکورد هەستی ناوەوەی دەروونی لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە هانی دەدا کورد بهێنێتە ڕیزی هەموو نەتەوەکانی دیکە کە بەلای ئەوەوە یەکێکن و هیچ جۆرە جیاوازییێک لە نێوانیاندا نییە. لەم بابەتەوە دەڵێ:



دلبەر تو کوردی
من تو مەشناسوم مەزانم کوردی
ساقی دلڕوبا بادە بێ دەردی
وە یەک نیم نیگا دل لە من بردی
تو تالیبی من من تالیبی تو
پەس مەتلووب کیەن تالیب هالە کو
بایەد چون جارچی جاڕ بدەم لە نو
تالیب و مەتلووب بایەد وەی تەور بو
سەید ساڵح غافل مەوە ژ تو ئاو
دلبەر بێدارەن مەرتوهای لە خاو

واتاکەی:

دلبەر تۆ کوردی
من تۆ دەناسم دەزانم کوردی
مەیگێڕی دلڕفێن بادەت بێ دەردە
بەتاکە چاوهەڵتەکاندنێک دڵی منت برد
تۆ منت دەوێ منیش تۆم دەوێ
داواکراو کێیە، داواکەر لە کوێیە
با دەلاڵ جارێکی دیکە بانگ بکا
داواکەرو داواکراو پێویستە بەم جۆرە بێ
سەید ساڵح دەمێک لێی غافڵ بوو
دلبەر بێدارە بەڵام تۆ لە خەودای

لە لیریکێکی دیکەیدا باس لە بەسەرچوونی ئەو ڕۆژگارەی ئایین یا سۆفیزم دەکا کە عەرەبی بووە. لە دوای ئەوە ساڵح باس لە سەردەمی کوردی ئەو ئایین و سۆفیزمە دەکا. لێرەدا شاعیر تیۆرییەکانی یارسانانمان (ئەهلی حەقمان) دێنێتەوە یاد، ئەوان باوەڕیان بەدۆنا دۆن هەیە لە سەردەمی ئادەم پێغەمبەرەوە، کردگار تەنیا جارێک خۆی جلواندووە لە ئیمامی عەلی لە ڕۆژگاری پەیدابوونی ئایینی ئیسلام، لە دوای ئەو ئەوانەی گیانی کردگار چۆتە لەشیانەوە هەموویان کوردبوون و ئایینەکەیان کوردی بووە تا ئێستا.

هەرچەندە ساڵح لە بۆتقەی بیروباوەڕی یارسانان نەتواوەتەوە بەڵام لێیانەوە نزیک بووە.

له سەرانسەری دیوانی شیعریدا هەڵوێستی بەرامبەر بەعەلی کوڕی ئەبوتالیب ئەگەرچی له چوارچێوەی ئایینزای شیعەی دوازده ئیمامییه، بەڵام له بیروباوەڕی یارسانانی ئەهلی حەق نزیک دەبێتەوه. بەم جۆره یاران و دەروێش و سۆفی و ئەو خەڵکەی که باوەڕیان بەفەلسەفەی تەریقەتی سۆفیزمی نیعمەتوڵلاهی هەیه، بەکوردیان دادەنێ.

لەم لایەنەوه دەڵێ:

هەمسەران کوردن
عەسر عەرەب چییه دەور کوردن
له دوعای سەحەر تەئسیر وەردن
ساغیرم سەر شار باده بێدردن
عەرەبی خەتم بی وه چارده مەعسووم
چاو بەدنامی عەجەم دان وه رووم
چونکه فانی بیم له زات داوەر
نوور کەرد چون شەمس عالەم کرد نەوەر
حوکمی بدەم پێت من که سەید سالم
ئەوراق ئەلغاز بشۆر له عالم
مەست مەلەنگم له جام سەر شار
وه لیسان قەوم مەکرم گفتار
هەرچەند علم عیشق له دەفتەر نیەن
دەفتەرخانەی عیشق بێ سەمەر نیەن

واتاکەی:

هاوسەران کوردن
ڕۆژگاری عەرەب بەسەرچوو ئەمه دەوری کوردانه
کاری له موناجاتی سەحەر کردووه
پیاڵه هەیه باده بێ دەرده
عەرەب لەگەڵ چوارده مەعسووم تەواو بوو
عەجەم بەدناویان دایه ڕۆم
چونکه له ناو زاتی فەرمانڕەوا توامەوه
نوور وەکو خۆر گێتی ڕووناک کردەوه



من که سەید ساڵحم فەرمانت بۆ دەردەکەم
کاغەزی قسه له گێتی پاک بکەرەوه
مەست و سەرخۆشم بەجامی پڕی تا سەر لێوان
بەزمانی قەوم گفتوگۆم کردووه
هەرچەند عیلمی عیشق له کتێبدا نەنووسراوه
دەفتەری عیشق بێ سوود نییه

لەم دێرانەدا ساڵح ئەوه دەگێڕێتەوه: له سەردەمی ژیانی شاعیر یارانی تەریقەت هەموویان کورد بوون، ڕۆژگاری عەرەب بەسەرچوو، سەردەمی کورد هاته ناوەوه. دەوری عەرەب بەچوارده مەعسوومەکانی ئایینزای شیعه کۆتایی هات، عەجەم هاتنه سەر ئەو ئایینه و بەدناویان دایه ڕۆم (مەبەس تورکی عوسمانییه که لەسەر ئایینزای سوننەن)، دیاره هەر لەبەر ئەوەشه من که سەید ساڵم (سەید ساڵحم) بەزمانی قەومی خۆم قسه دەکەم و شیعرم نووسیوه، واته زمانی کوردی.

له بابەت گیانی نەتەوەییەوه شاعیر له درێژترین قەسیدەی که له هەشتا و دوو دێر شیعر پێکهاتووه ئەستووری هەست و نەستی خۆی دەردەبڕێ که چۆن له ڕێگەی تەریقەتەوه بەشوێن حەقیقەت گەڕاوه و ئەو شیعرەی چڕیوبەتی بەوشەی گۆرانی بووه واته دیالێکتی گۆرانی زمانی کوردی.

خیرقه سۆزەنی پیری نوورانی
ماوەرووم وه نەزم لەفزی گۆرانی

واتاکەی:

خیرقەی دەروێشی پیری نوورانی
کردوومەته شیعر بەلەفزی کوردی

ئینجا خۆی ئاماده دەکا بۆ گەشتی گیانی مۆڵەت له شای نەجەف (عەلی) و یارمەتی له قەنبەر وەردەگرێ و ناوی هەموو ئەو جێگایانه دەبا که بەدڵیەتی و دەڵێ:

له ڕێی مەحەبەت ڕووم کرد وه یاران
هیممەت خواهیم کەرد له تەکیەداران
لوام وه خدمەت شاه نەجەف یانه
سەر کوتام له خاک پای ئاستانه

ڕشتەی مەحەببەت بەسام لە کەمەر
هیممەت خواهیم کەرد لە ئاقای قەنبەر
بەسرە و مەداین تا شەهری بەغداد
یەکا یەک کێلام هەر یەک وە دڵشاد
کەرکووک و مووسڵ و مەککەو میسرو شام
بەیتولمەعموور دیم تا بەیتولحەرام
قوستەنتەنییە چەنی ئیسلامبوول
شاران یەکا یەک گشت و عەرز و توول
قەندەهار و شەهر کشمیر و کابول
هەرات و ئەفغان تا شەهر زابول
سیستان مەکان روستەم داستان
یەلان سەرمەست بادە پەرستان
تەهران و کاشان شەهر هەمەدان
پاتەخت شاهان شەهر ئەسفەهان
ڕەشت و گەیلانات تا مازەندەران
شەهر ئەستراباد تەمام بەهبەهان
زەنجان و قەزوین شەکی شیروان
تارم و خەلخال تا وە نەخچەوان
ئازربایجان ئەریوان و تەبریز
مەردان سەرمەست شیران خوێنڕێژ
لە خۆی و سەلماس تا وە قەرەداغ
تورکستان یەکجا تا وە قەرەباغ
بوخارا و تەبس خەیبە و خۆراسان
یەکا یەک کێلام وە سەهل و ئاسان
لەچین تا ماچین فەرەنگ و تاتار
هیند و هیندوستان تا وە زنگبار
تکە و تورکمان تا شەهر ئامەل
سەییاحان دەور مەردان کامل



یەزد و قوم گەیلان تا شەهر شیراز
جاکە بەسەفای حەقیقەت مومتاز
کرمانشا و کرمان تا مولک ماهان
جاکە عەیش و نۆش عوشرەتگای شاهان
ئیران و توران بەلخ و بوخارا
فەقیر و مسکین دارا و نەدارا

واتاکەی:

لە ڕێی دڵسۆزییەوە ڕووم کردە یاران
داوای یارمەتیم کرد لە بەتوانایان
خۆم خستە خزمەتی شای نەجەف
سەرم لە خاک بوو پێم لە ناو دەرگا
ڕستەی دڵداریم لە کەمەرم بەست
هێزم لە ئاغای قەنبەر داوا کرد
بەسرە و مەدائین تا شاری بەغدا
یەک یەک گەڕام بەدڵشادی
کەرکووک و مووسڵ و مەککە و میسر و شام
چاوم بەبەیتولمەعموور کەوت تا بەیتولحەزەن
قوستەنتەنییە کە ئەستەمووڵە
هەموو شارەکان یەک یەک بەعەرز و تووڵ
قەندەهار و شاری کشمیر و کابول
هەرات و ئەفغان تا شاری زابول
سیستانی مەڵبەندی ڕۆستەمی داستان
قارەمانانی مەستی بادە پەرستان
تاران و کاشان شاری هەمەدان
پایتەختی شاهان شاری ئەسفەهان
ڕەشت و گەیلان تا مازەندەران
شاری ئەستراباد و بەهبەهان
زەنجان و قەزوین و شیروان

تارم و خەلخال و نەخچەوان
ئازربایجان ئەریوان و تەورێز
کەسانی سەرمەست شێرانی خوێنڕێژ
خۆی و سەلماس و قەرەداغ
لە تورکستانەوە تا قەرەباغ
بوخارا و تبس و خەیبە و خوراسان
یەک یەک گەڕام بەئاسانی
لەچین تا ماچین فەرەنگ و تاتار
هیند و هیندستان تا زەنگبار
تکە و تورکمان تا شاری ئامل
گەڕۆکەکان لە دەوری پیاوچاکان بوون
یەزد و قوم و گەیلان تا شاری شیراز
جێگایانی خۆش و مومتاز
کرماشان و کرمان تا مەملەکەتی ماهان
جێی ژیانی بەختیاری و کۆبوونەوەی شاهان
ئێران و توران و بەلخ و بوخارا
جێی هەژار و بێ توانا و نابووت

لەم بڕە شیعرەدا شاعیر لیستەیێکی دروست کردووە لە ناوی جوگرافی بەولاوە هەست بەهیچ جۆرە چێژێکی ئەدەبی ناکرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ناوی ئەم شار و ناوچانە لە گوێی خوێنەر دەزرنگێنەوە گەلێ وێنەی بیرەوەری هونەری و یادی هەست بزوێن لای دروست دەبێ.

لە لیستەکەدا ساڵح یادی ئەم جێیانە دەکاتەوە: بەسرە، مەدائین، بەغدا، کەرکووک، مووسڵ، مەککە، میسر، شام، قوستەنتەنییە (ئیسلامبول)، قەندەهار، کشمیر، کابول، هەرات، ئەفغان، زابول، سیستان، تاران، کاشان، هەمەدان، ئەسفەهان، ڕەشت، گەیلانات، مازەندەران، ئەستراباد، زەنجان، قەزوین، شیروان، تارم، خەلخال، نەخچەوان، ئازربایجان، ئەریوان، تەورێز، خۆی، سەلماس، قەرەداغ، تورکستان، قەرەباغ، بوخارا، تبس، خەیبەر، خوراسان، چین، ماچین، فرەنگ، تاتار، هیند، هیندستان، زەنگبار، تکە،



تورکمان، ئامەل، یەزد، قوم، گەیلان، شیراز، کرماشان، کرمان، ماهان، ئێران، توران، بەلخ، بوخارا.

شاعیر لە هەموو ئەم جێیانە گەڕاوە بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت، دیارە گەشت و گەڕانەکە گیانی بووە نەک مەتریالی.

## گونجاندنی تەریقەت و شەریعەت

ئەوەی ئاشکرایە لە کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەتایبەتی لە دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بزووتنەوەی «زوهد» لە کۆمەڵی ئیسلامدا پەیدا بوو. ئەمە ئەنجامی بیروباوەڕێکی تایبەتی بوو بەرامبەر بەئایین، وەک لێکدانەوەیێکی ئیدیۆلۆجی ئیدیۆلۆجی ئایینی ئیسلام لەسەر ئەو باوەڕەدا بوو بەختیاری لەوەدایە لەم گێتییەدا بەدرشتی بژی (هەژاری) بۆ ئەوەی لە گێتی دواییدا لە بەهەشتا بەنەرمی (بەختیاری) بژی. لە سەرەتای فەرمانڕەوایی عەباسییان لە بەغدا بیروباوەڕی «زوهد» بوو بەبنج و بناوان بۆ پەیدابوونی بزووتنەوەی سۆفیزم. ئەمە شۆڕشێک بوو لە دژی ئۆتۆکراتییەتی دەوڵەت کە لەسەر بنیادی پراکتیکی شەریعەت دامەزرا بوو، هێز و توانای لە سەرچاوەی زوهدی ئیسلامی و سۆفیزمی ئەفلاتوونی و مەسیحی و هیندی و ئایینە کۆنەکان وەردەگرت.

دەسەڵات لە پێشانا بەکوشتن و بڕین بەربەرەکانی سۆفیزمی کرد، لە دواییدا داگیری کرد و بۆ چاکەی خۆی بەکاری هێنا، واتە شەریعەت و تەریقەت لە دوژمنداریەوە بوون بەدۆست، بەڵام دۆستایەتییەکە لە بەرژەوەندی شەریعەت بوو. ئەو دوژمندارییە وەک تیۆرییێک تا ئێستا ماوەتەوە. بەم جۆرە ساڵح وەکو بەشێکی زۆر لە شاعیر و نووسەرانی کورد باوەڕی بەو دۆستایەتییە هەبوو و لە ژیانی خۆیدا بەکاری دەهێنا، واتە گونجاندنی ئایینی ئیسلامی خۆی کە لە بەشی ئایینزای شیعە بوو لەگەڵ تەریقەتی سۆفیزمی نیعمەتوڵڵاهی. ئەم جۆرە کەسانە لەسەر ئەو باوەڕەن شەریعەت واتە ئایین بەڕێگەی تەریقەت کە سۆفیزمە دەگاتە حەقیقەت حەقیقەت.

لەم بارەیەوە دەڵێ:

شای دەروێشانم
من عەبد عەبید شای دەروێشانم
بێزار لە گرووە زوهد فرۆشانم
عەبد زەر خرید ژەندە پۆشانم

قــــەول قــــەلەندەر دایم زیکری مـن
سـرری لە ئـەسـرار پەنهـان فـیکر من
زەمیِن تەخنە پووس تەخت عــاج مـن
تـەرک تـاج و تـەخت تـەرک تـاج مـن
سلسلە کـەشکوول فـەقر لە مشت من
تار مــەحــەبیــەت ڕشــتــە پشت من
سـەنگ قـەناعـەت مـایەی دەست من
نەفس ئەسیر جووع بەستە ششت من
گــولبــانگ ئـازان شــاخ نەفــیــر من
مـونتـە شـام نەمـاز قـیبلەم پیـر من
دەست و پای تەلەب ئـەسپ و زین من
زەبـان پـیـــــــــرم تـبــــــــر ژیـن مـن
خـیـرقـەم حـیـجـابەن ز دیدار دۆست
وێنە قــــەلەندەر بەر لوام لە پۆست
شــەریعــەت چراغ تەریقــەت را من
حـەقـیـقـەت مـەقسـوود خـەتم کـەلامن
سـەید سالْح بەندە عـەبد عـەلی شاهن
شـاهان بەندە ئوو ئـوو بەندەی شــاهن
مـوحـەڕڕەم دەرگـاه ئـەولیـای حـەقن
ئـەمیِن ئـەســــرار حـــەق مـــوتلەقن

واتاکەی:

شای دەروێشانم
من عەبدی عەبید شای دەروێشانم
بێزارم لە تاقمی زوهدفرۆشان (زاهیدان)
عەبدی زێڕکرم کۆنە پۆشم
بەقسەی قەلەندەران هەمیشە لە زیکر دام
نهێنی نهێنییەکان لە بیری من شارراوەتەوە
زەوی ئەو جێگە خۆشەی منە کە لە عاج دروست کراوە



دوورکەوتنەوە لە تاج و تەختی شاهانە تاجی منە
زنجیری کەشکۆڵی هەژاری لە دەستی من دایە
ڕەمزی دڵداری تەنافی (پشتێدنی) پشتی منە
ڕازی بوون بەبەش مایەی دەستی منە
دەروونم دیلی برسییەتییە بەجیگەرم بەستراوە
ئاوازی بانگ دەنگی شەیپووڕی منە
عەسای نوێژ و قیبلەم پیری منە
دەست و پێی ئەسپ و زینی منە
زمانی پیرم تەوروزینی منە
خیرقەم پەردەیە بۆ بینینی دۆست
وەک قەلەندەر لە پێستەدا لوول دراوم
شەریعەت چرامە تەریقەت ڕێگامە
حەقیقەت مەبەسمە ئەمە خەتمی کەلامە
سەید سالْح بەندەی شا عەلییە
شایان بەندەی ئەون ئەو شای بەندانە
هەموویان ئەولیای دەرگای ڕاستین
پارێزەری نهێنییەکانی حەقی موتلەقن

لەم شیعرەدا سالْح شەریعەت و تەریقەتی لەگەڵ یەکتریدا گونجاندووە بۆ ئەوەی بگاتە حەقیقەت، بەڵام دیسانەوە مەسەلەی سۆفیزم لە بیریدا بەسەر مەسەلەی شەریعەتدا زاڵە، لەبەر ئەوە ئیمامی عەلی کردووە بەڕەمز بۆ هەموو لایەنەکان، شەریعەت (ئایینی ئیسلام)، سۆفیزم (تەریقەتی نیعمەتوڵڵاهی)، حەقیقەت (کردگار).

### یادی شاعیرانی کلاسیک دەکاتەوە

لە یەکێ لە لیریکەکانیدا سالْح یادی هەندێ لە شاعیرانی کلاسیکی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکاتەوە، لە پاشانا بەشێوازی موناجات داوا دەکا یارانی یارسانان یا دەروێشانی تەریقەتی نیعمەتوڵڵاهی هەموو خەوشێک نەیانگرێتەوە و لە هەموو ناکاملێییێک دوور بن و یادی هەندێ لە شاعیرانی فارسی زمان دەکاتەوە:

هەمسەران واکەی
حەق قاپی ڕەحمەت لە ڕووتان واکەی
جام قەلبتان جیهان نما کەی
گەدایانتان وە شەهنشاکەی
فەقیر و عالیم و حەکیم و واعیز
گشت غەرق بم ز خوان ئیحسان حافز
بۆی عەتر عەتتار دا لە دەماغم
ڕۆشن کرد لە نوور خودا چراغم
ئەسرار وەحدەت ها لە مەسنەوی
بشنەو تو ژ قەول مەلای مەعنەوی
گووش بدەر وە نەی بشنەو ژ نائی
گیان و فیدای مەدح حەکیم سەنائی
عیبادەت هەر مەدح شاه مەردانەن
قەول حەکیمەن دەوای دەردانەن
لە دەور خەرمەن عیلم بەهائی
گشت خۆشە چینێ مەکەن گەدائی
ڕەزم فیردەوسی و بەزم نیزامی
شوعەرایانی دەهر ئەنوەری و جامی
لە شەهد ئەشعار سەعدی شیرازی
مورغ رووح چون تەیر مای وەباڵ بازی

واتاکەی:

هاوسەران وا لێ بکەی
خودا قاپی ڕەحمەت لە ڕووتاندا بکاتەوە
ناوەڕۆکی دڵتان بەعالەم پیشان بدرێ
هەژارانتان ببنە شاهنشا
فەقیر و عالیم و حەکیم و واعیز
هەموویان لە ناو خۆشی و شادیدا نوقوم بێن



بۆ عەتری عەتتار لە مێشکمی داوە
خودا چرامی پڕ لە نوور کرد و ڕووناک بووەوە
نهێنییەکانی یەکتایی خودا لە مەسنەویدا تۆمار کراوە
گوێ لە قسەکانی مەلای مەعنەوی بگرە
گوێ بدەرە ئاوازی نای گوێ لە بلوێرژەن بگرە
گیانم فیدای ستایشی سەنائی دانابێ
عیبادەت تەنیا ستایشی شای مەردانە
قسەی داناییە دەرمانی دەردانە
لە دەوری خەرمانە زانستی جوانییە
هەمووتان گوڵەوەچنی بکەن و دەرۆزە مەکەن
ڕەزمی فیردەوسی و بەزمی نیزامی
شاعیرانی ڕۆژگار ئەنوەری و جامی
لە شیرینی شیعری سەعدی شیرازی
تەیری ڕووح وەک باڵندە باڵەفڕێ دەکا

لەم بڕە شیعرەدا ساڵح هەموو نهێنییەکانی یەکێتی بوون لە مەسنەوی جەلالەدینی ڕۆمیدا دەبینێ. سەرنج دەداتە ئەو ئاوازەی لە نای جیا دەبێتەوە و یەکێکە لە داهێنانە هەرە بەرزەکانی جەلالەدین لە فەلسەفەی سۆفیزمدا. شاعیر عیبادەت لە ستایشی شای مەردان عەلی دەبینێ. ناوی فیردەوسی و نیزامی و ئەنوەری و جامی و سەعدی شیرازی دەبا.

لە پاشانا ساڵح یادی هەندێ لە شاعیرانی کورد دەکاتەوە:

بشنەوژ نەجەف و شاکە و تورکەمیر
کەس چون سەید یەعقووب نەفس نەکرد ئەسیر
تو بناز نیتە وە نیازەوە
دوو دیدەی خومار چون شەهبازەوە
غولام ڕەزا نیتە وە شۆر موناجات
چون مووسا لە توور قازییەلحاجات

واتاکەی:

گوێ لە نەجەف و شاکە و تورکەمیر بگرە
کەس وەکو سەید یەعقووب گیانی خۆی دیل نەکرد
تۆ نیازت نییە و هەمیشە بەهیواوە نەژیاوی
بەدوو چاوی خوماری وەک چاوی شای بازان
غولام ڕەزا بەخۆی و شۆری موناجاتەکانییەوە
وەک مووسا بوو لە کێوی تووڕ یارمەتی داوا دەکرد

لەم دێرانەدا ساڵح یادی بڕێک لە شاعیرانی کوردی دەوروبەری ژیانی خۆی دەکاتەوە، وەکو: تورکەمیر، یا تورکە شاعیرێکی گۆرانزەمێن بووە، هەندێ دەڵێن لە یارسانانی کرند بووە، هی دیکە دەڵێن کوردی لوڕ بووە لە ساڵی ١٨٢٠ کۆچی دوایی کردووە. هەروەها ناوی شاعیرانی ناوداری وەکو غولام ڕەزا و سەید یەعقووبی ماهیدەشتی دەبا کە لە بەرگەکانی ئەم کتێبەدا باس لە ژیانی شیعریان کراوە. جگە لەمانە یادی دوو شاعیری دیکەش دەکاتەوە نەجەف و شاکە، لە بابەت ئەمانەوە لە مێژووی ئەدەبدا زانیارییێکی ئەوتۆ لە ناوەوە نییە، تەنیا ئەوە هەیە ئەو شاعیرەی ناوی نەجەفە و شیعری هەیە بەناوی نەجەف چارزەبری ناوبانگی دەرکردووە و مامۆستای تورکەمیر بووە.

## یەکێتی بوون

بیری بنچینەیی شیعری ساڵح ڕوونکردنەوەی فەلسەفەی «یەکێتی بوون = وحدة الوجود»ە. لەمەدا «بوون» وەکو ڕووداو لە هەموو دیاردەیێک و پێچەوانەی پێکهاتووە، ئەگەر بەراستی پێچەوانەی هەبێ، واتە «بوون» بەهەموو گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەیەوە، دیاردە چاک و خراپەکانییەوە شاعیر لێیان دەدوێ، یا دروستیان دەکا. لەم لایەنەوە لە لیریکێکیدا دەڵێ:

ئاما وەسەرم
هەم لە نوو شۆری ئاما وەسەرم
گاهێ دڵدارم گاهێ دلبەرم
گاه بەدر مونیر شمس خاوەرم
گاه سیفات مەحز گاه عەین زاتم
بت و بتشکەن لات و مەناتم



گاهێ دوزەخم گاهێ بەهەشتم
گاهێ مەسیجدم گاهێ کەنشتم
گاه دەریای عومان گاه کۆ هی قافم
گاه تورکی (بیلمەز) گاه کوردی جافم
گاهێ پەیغەمبەر پەیغام ئاوەرم
گاهێ لە ڕەندان جام وەرگرم

***

گاه خاوگاه خۆراک گاه گەرم و سەردم
گاه جەمع و تەفریق گاه زەوج و فەردم
گاه ساقی ڕەندان خەرابات خانەم
گاه ڕەتلی گران گاهێ پەیمانەم
گاه شام و سەحەر نەقش و نیگارم
گاه باغ و بیستان گوڵ و گوڵزارم

***

گاهێ عابیدم گاهێ مەعبوودم
گاهێ ساجیدم گاهێ مەسجوودم
گا بودی مەحزم گاهێ نابوودم
گا حامیدی حەمد گاهێ مەحموودم
گاهێ محەمەد گاهێ عەلی بیم
گاه نیعمەتوڵڵا شای وەلی بیم

واتاکەی:

هاتە سەرم
جارێکی دیکە شۆڕش هاتە سەرم
دەمێک دڵدارم دەمێک دلبەرم
دەمێک مانگی چواردەی ڕووناک و دەمێک خۆری ڕۆژهەڵاتم
دەمێک تەنیا سیفەتم دەمێک بەتەواوی زاتم
بتم و بتشکێن و لات و مەناتم
دەمێک دۆزەخم دەمێک بەهەشتم

دەمێک مزگەوتم دەمێک کەنشتەم
دەمێک زەریای عوممان دەمێک کێوی قافم
دەمێ تورکی نازانم دەمێک کوردی جافم
دەمێک پێغەمبەرم پەیام دەهێنم
دەمێک لە ڕەندانم پیاڵەی مەی وەردەگرم

***

دەمێک خەو و دەمێک خۆراک دەمێ سارد و گەرمم
دەمێ کۆ و دەمێک جیابوونەوە، دەمێ جووت و دەمێ تاکم
دەمێک مەیگێڕی ڕەندان و مەیخانەکانم
دەمێک سەنگی کێشان و دەمێک قاپی پێوانم
دەمێک ئێوارە و بەیانیان نەقش و نیگارم
دەمێک باغ و بێستان و گوڵ و گوڵزارم

***

دەمێک دەپەرستم دەمێک دەپەرسترێم
دەمێک سوجدە دەبەم دەمێک سوجدەم بۆ دەبرێ
دەمێک بوونی تەواوم دەمێک بوونم نییە
دەمێک بەگەورەیی خودا هەڵدەڵێم دەمێ بەگەورەیی من هەڵدەڵێن
دەمێک محەممەدم دەمێک عەلیم
دەمێک شا نیعمەتوڵڵا دەمێ وەلیم

لەم دێرە شیعرانەدا ساڵح خۆی دەکاتە بەڵگە و دیاردەییێکی «بوون» لەبەر ئەوە تاکی هەموو جووتەکانە: دڵدار و دلبەر، مانگ و ڕۆژ، گیان و لەش، ئەوجا تاکی هەموو دوو شتەکانی پێچەوانەی یەکترین: بتی لات و مەنات و بتشکێن، دۆزەخ و بەهەشت، مزگەوت و کەنشتەی جوولەکان، زەریای عوممان و کێوی قاف، زمانی تورکی نەزانین و کوردی جاف، پێغەمبەری خاوەن پەیام و سەرخۆشان یا فێڵبازانی جام بەدەست. لێرەدا ساڵح وشەی تورکی «بیلمز = bilmez»ی بەکارهێناوە، ئەم وشەیە بەمانای (نازانێ) هاتووە.

شاعیر دووبارە دەکەوێتە باسی ئەو جووتانەی لەگەڵ یەکتریدا ڕێکن وەک: عابید و مەعبوود، ساجید و مەسجوود، بوون و گەردوون، حامید و مەحموود، محەمەد و عەلی،



نیعمەتوڵڵا شا و خۆی وەک شێخ و مورید. نیعمەتوڵڵا وەک ئاشکرایە دامەزرێنەری تەریقەتی نیعمەتوڵڵاهییە. لە کۆکردنەوەی هەموو ئەم دیاردانە دەیەوێ ئەوە بخاتە ڕوو خۆی ئەم هەمووانەیە و هەموویانیش ئەوون.

ساڵح لە شیعرێکی دیکەیدا هەندێ وێنەی هونەری دروست دەکا پێوەندی بەهەستی ناوەوەی هەیە بەرامبەر بەیەکێتی بوون بەتایبەتی لە ڕووی کردەوە و ڕەوشتەوە.

لەو لیریکەدا دەڵێ:

هەم بزم یارم
ئەمشەو لە تەزا هەم بزم یارم
سەرتاپا لە جام وەحدەت سەرشارم
لە عیشق دل بر مەست و خومارم
وە دل چراغم وە تەن فانۆسم
خالی لە خودی مەملوو لە دۆسم
هام لە کۆی ویساڵ چون قەیس لە کۆی نەجد
گووش پڕ لە سەماع دل مەملوو لە وەجد
بێ بادە سەرخۆش ژ عیشق یارم
مات و مەدهۆشم مەست و هوشیارم
ئاون من زاکیر زیکر و مەزکوور دیم
تادیم و زاکیر زیکر و مەزکوور دیم
من و ما خەتاست لە هەر جا یارەن
عیبارەت تەنگ چارم ناچارەن
سەید ساڵح خوا مووش فاش مەکر ئەسرار
زومرەی مەنسوور کش مەدەنت وە دار

واتاکەی:

لەگەڵ یارم لە بەزم داین
ئەمشەو لەو جێگەیە لەگەڵ یارم لە بەزم داین
سەرتاپام بریتییە لە جامی سەر لێوم
لە عیشقی دڵ گەلێ مەست و خومارم
بەدڵ چرام بەتەن فانۆسم

له خۆم خاڵیم پڕم له دۆستم
له جێگەی ژوانم وەک قەیسی کێوی نەجد
گوێم پڕ له ئاواز و دڵم پڕ له وەجدە
بێ بادە سەرخۆشی عیشقی یارم
مات و مەدهۆشم مەست و هوشیارم
ئەوانەی بیرم لێ دەکەنەوە نیشانەی ئەوەیە بیرم لێ دەکرێتەوە
من دەبم بەبیرکەرەوە هەروەها بیریشم لێ دەکرێتەوە
من و نەیارەکان و یارانی هەموو لایێک
قسەی خراپ هەبێ چارم ناچارە
سەید ساڵح له ڕێی خودا نهێنی ئاشکرا مەکە
با لایەنگرانی مەنسووڕ له سێدارە نەدرێن

لێرەدا شاعیر باس لەو شەوە دەکا کە لەگەڵ یاردا بووە، له ناویدا تواوەتەوە، مەست و سەرخۆش بووە. بەدڵ ڕووناکی بووە و بەلەش فانۆس بووە. خۆی له ناو خۆیدا نەماوە، ناوەوەی پڕ بووە له دۆستەکانی. له جێگەی ژواندا وەک قەیس بووە له کێوی نەجد، گوێی پڕ له ئاواز و دڵی پڕ له وەجد (خۆشەویستی) بووە، له عەشقی یار بێ بادە سەرخۆش بووە. بەم ڕەنگە «بوون» لەناو ئەوبووە، له دەرەوە و ناوەوەی ئەو هیچ «بوون»ێک نەبووە.

## لەناو «بوون»دا تواوەتەوە

له لیریکێکیدا شاعیر خەریکی «یەکێتی بوون»ە. بەجۆرێک هەستی دەردەبڕێ ئادەمزاد بەلەش له گوڵستانی سروشت دەدۆزرێتەوە بەڵام ئەو گوڵستانە «بوون»ە پێش ئەوەی جێگەی سەیران و خۆشی و جێی ماچوموچی دڵداری بێ. بەم جۆرە سروشت له وێنەی مەتریالییەوە دەگوێزرێتەوە ڕەمزی وێنەی گیانی:

هەمسەران ژارم
غەنی موتڵەقم فەقیر و ژارم
باغ و بیستانم گوڵ و گوڵزارم
پەروانەی شەمعم له گیان بێزارم
عاشق و مەعشووق مەحوو و مەفتوونم
مەجنوونی لەیلا و لەیلای مەجنوونم



نوور و زولمەتم یار و ئەغیارم
سەنەم پەرستم ڕشتە و زوننارم
موغ و موغبەبەچچە بادە فرۆشم
پیر پڕ ئیدراک با عەقڵ و هۆشم
***
ساقی سەرمەستان بادە تەهوورم
سوراحی پڕ مەی جام بلوورم
عەشق شۆرئەنگێز جام سەرشارم
له دەردی کشان مەیخانەبارم
سەمسام و قەمقام تیغ برندەم
جەللاد خوێنڕێژ شێر دڕندەم
ئایین و مەزهەب ئیمان و دینم
کەلام ناتیق ئایەی موبینم
هەمشیرەی عیشقم هەم مەعنی خەسمم
بێ نامونیشان بێ ئیسم و ڕەسمم

واتاکەی:

هەمسەران لەڕولاوازم
دەوڵەمەندی گەورە و هەژار و لەڕولاوازم
باغ و بێستانم گوڵ و گوڵزارم
پەپوولەی مۆمم له گیان بێزارم
عاشق و مەعشووق نەماو و گرفتارم
مەجنوونی لەیلا و لەیلای مەجنوونم
ڕووناکی و تاریکیم و یار و نەیارم
بتپەرستم و پشتێند و زوننارم
موغم موغبەچەم مەیگێڕم
پیرێکی پڕ له دانایی و خاوەن بیر و هۆشم
***
مەیگێڕی سەرخۆشان بادەی پاک و خاوێنم

سوراحی پڕ لە مەی و جامی بلوورینم
عیشقی پڕ لە غەوغا جامی سەر لێوم
لە دەوریدا مەنگیرانی مەیخانەچیم
شمشێر و گەورەم خەنجەری تیژم
جەللادی خوێنڕێژ و شێری دڕندەم
ئایین و مەزهەب و ئیمان و دینم
قسەی سەرزارم ئایەتی قورئانە
هاوشیر و خوشکی عیشقم و هەروەها دوژمنم
ناوونیشانم نییە، بێ ناو و لەشم

شاعیر لەم دێرانەدا لەیەکچوو و لەیەکنەچووی سروشت و دیاردە کۆ دەکاتەوە بەپێی زانستی لۆجیک کارێکی بەجێ نییە، بەڵام سۆفیزم لەبەر ئەوەی لە گێتی لۆجیک و دەستوور و شەریعەت دەچێتە دەرەوە ئەو وێنانەی سالح دروستیان دەکا لە گێتی هونەر و داهێناندا لە ناماقووڵەوە دەبن بەماقووڵ. شاعیر سیفەتی هەژاری، باغ و بێستان، عاشق و مەعشووق، ڕووناکی و تاریکی، سوراحی و بادە، هەوێنی عیشق و مانای دڵداری و گەلێکی دیکە لە خۆی کۆ دەکاتەوە تا دەگاتە ئەوەی بڵێ: بێ ناوونیشانم، نە ناوم هەیە نە ناوەڕۆک، واتە «نەمان» و دروستبوونی جەوهەرێکە هەموو بوون کۆ دەکاتەوە.

### سەرخۆشی کردگاری

لە دیوانی سالحدا مەبەسی سەرخۆشی بایەخێکی زۆری پێ دراوە. هەندێ جار بەڕووکەش لە مەی و مەیخانەی ئاسایی ئەدەبی کلاسیکی جیا ناکرێتەوە. بەڵام بەهەموو جۆرێک شاعیر مەبەسی لە سەرخۆشییەکەی خۆی مەستی کردگاری یا سۆفیزمییە. ئەگەر سەرخۆشی جیابوونەوەی ئەقڵ بێ لە لۆجیک، دیارە سۆفی باوەڕی بەلۆجیک نییە لەبەر ئەوە بێ مەی سەرخۆش دەبێ.

سالح لە لیریکێکیدا دەڵێ:

ساقی مەیخانەم
من هەر لە ئەزەل ساقی مەیخانەم
سەنعان و تەرسای کلیسەخانەم
لە دەردی کشان یەکتای یەکانەم



ساتیعەن لە من بۆی عەبیر و میشک
چون نەهەنگ موحیت سەهبا مکم خشک
کیتمانم لەسەر پری ئەغیارن
شاهیدی قسەم (اولو الابصار)ن
سەید لە باتین زات باقییەن
لە زاهیر مینا و سەهبا و ساقیەن

واتاکەی:

مەیگێڕی مەیخانەم
من هەر لە ئەزەل مەیگێڕی مەیخانەم
سەنعان و کچە گاوری کلیسەخانەم
لە دەردی کەشان تاک و تەنیا و یەکانەم
عەبیر و میسک بۆنیان لە من وەردەگرن
وەک نەهەنگی ئۆقیانووسی مەی وشک دەکەمەوە
قسە شاردنەوەم لەبەر دوژمنانە
شاهیدی قسەم خەڵکی ڕۆشنبیرن (اولو الابصار)
سەید لە ناوەوە زاتێکی هەمیشەییە
بەڕووکەش سوراحی و مەی و مەیگێڕە

وەک لەم دێرانەدا دەردەکەوێ شاعیر لەو ڕۆژەوە کە گیانی خوڵقاوە ساقی مەیخانە بووە، پێش ئەوەی ئەو گیانە بچێتە ناو لەشییەوە. گیانی شاعیر نەمر و هەمیشەیی و زیندووە، کە لە قاڵبی ئێستایدا خۆی دەجلوێنێ دووبارە بۆتەوە مەیگێڕ و مەی و جامی مەی.

لە لیریکێکی دیکەیدا سالح دەڵێ:

یاران سەرمەستم
لە سەبووکێشان دایم سەرمەستم
ساقی مەیخانە و ساغیر پەرستم
شێخ سەنعان ئاسا زوننار وەدەستم

***

زەمزەمەی ئەزکار سۆفیانی ساف
پڕ کەردەن عالەم لە قاف تا وە قاف
گشت مەست و مەخموور مەیخانە یارن
سەرمەست لە نەشا جامی سەرشارن

***

لە ڕەقس وەحدەت وەجد سۆفی سووز
شەوی یەڵدا بی وە ڕۆژی نەورووز

واتاکەی:

یاران سەرمەستم
لە سوراحی مەی هەمیشە سەرمەستم
مەیگێڕی مەیخانەم سوراحی دەپەرستم
وەک شێخی سەنعان زوننار لە دەستم دایە

***

شۆڕشی تەهلیلەی سۆفیانی پاک
گێتی پڕ کردووە لە قافەوە تا قاف
هەموویان مەست و سەرخۆشی مەیخانەی یارن
سەرخۆشن لە نەشوەی جامی سەر لێوان

***

لە سەما و وەجدی سۆفی پڕ لە سۆز
شەوی یەڵدا بووە بەڕۆژی نەورۆز

لەم شیعرەدا ساڵح باس لە مەستی و سەرخۆشی هەمیشەیی دەکا، ئەوە دەگەیەنێ کە ساقی مەیخانەیە، لەگەڵ دەروێش و موریدان لە کۆڕی زیکر و تەهلیلەی دەروێشاندا لە هەموو گێتی، لەوسەر تا ئەوسەری گشتیان سەرمەست و سەرخۆشن. سەما و دڵداری دەروێشانی پڕ لە سۆز بێ کۆتاییە وەک شەوی یەڵدا و ڕۆژی نەورۆز. بێ گومان شەوی یەڵدا بەڵگەی درێژترین شەوی ساڵە لە پاییزدا دەبێ و ڕۆژی نەورۆزیش بەڵگەی خۆشترین ڕۆژی ساڵە لە بەهاردا دەبێ.

لە لیریکێکی دیکەیدا ساڵح بەئاشکرا باس لەوە دەکا دڵداری مەست و سەرخۆشی کردووە، لە شیعرەکەیدا دەڵێ:



من لە عیشق یار
مەست و مەخموورم من لە عیشق یار
وەقتە هەڵگرم پەردە لە ڕووی کار
بێ حیجاب و خەلق فاش بکەم ئەسرار
بنمانوم پیشان راز نیهانی
هەرچ هەست لە پشت پەردەی پەنهانی
پەردە و پەردەدار ئەلگرم یەکجا
فاش بکم ئەسرار وە خەلق خودا
مەعلووم بووت پیشان نوکتەی حەقیقەت
کەس نەکی ئینکار ئەهلی تەریقەت
تاکە فاریغ بوون لە گێج گەردوون
تەکیە دەن وە لوتف دەهەندەی بێ چوون

***

سەید ساڵح ژ سر وەحدەت ئاگا هەن
گفتە ئوو کەلام عەبد عەلی شاهەن

واتاکەی:

من لە عیشقی یار
مەست و مەخموورم من لە عیشقی یار
وەختە هەڵگرم پەردە لە ڕووی کار
پەردە لەسەر هەموو نهێنییێک هەڵگرم و ئاشکرایان بکەم
هەموو ڕازێکی نهێنی ئاشکرا بکەم
هەرچی لە پشت پەردەی نهێنی هەیە
پەردە و پەردەدار بەیەکجار هەڵگرم
هەموو نهێنییەکانی خوڵقاندنی خودا
بۆ ئەوەی نوکتەی حەقیقەتت بۆ ئاشکرا بێ
بۆ ئەوەی کەس ئینکاری ئەهلی تەریقەت نەکا
تا ئەو کاتەی لە خراپەی گەردوون ڕزگاریان دەبێ

بەسۆزی خوای گەورەی بێ وێنە

***

سەید ساڵح ئاگاداری نهێنییەکانی وەحدەتە
قسەی ئەو قسەی عەبدی عەلی شایە

لە ئەنجامی تەوژمی دڵداری ساڵح لە هۆش خۆی چووە و مەست و سەرخۆش بووە و بیری ون کردووە. پیاو لەو کاتەی شێت و شەیدا دەبێ هەموو نهێنییێک ئاشکرا دەکا. هەرچی لە پشت پەردە و لە ناو دڵدا هەیە دەیهێنێتە دەرەوە و نهێنی هەموو کەسانێک دەخاتە ڕوو.

لەم شیعرەدا جارێکی دیکەش ساڵح باوەڕە گشتییەکانی خۆی دەردەبڕێ، بەلای ئەووەوە ئەگەر تەریقەت (سۆفیزم) نەبێ ڕاستی (حەقیقەت) نادۆزرێتەوە. بێ گومان ئەمە فەلسەفەی سۆفیزمی کۆزمۆسییە. فەلسەفەی سۆفیزمی ئیسلامی ئەوەیە «شەریعەت» قانوون و دەستوور بەبنج دادەنێ و سۆفیزم دەکاتە ڕێگە بۆ گەیشتن بە«حەقیقەت» ، بێ گومان ئەمەیان لەگەڵ سروشتی سۆفیزمی کۆزمۆسی ناگونجێ.

## عەلی وێنەی کردگارە

لە سەرانسەری دیوانی شیعریدا ساڵح ستایشی ئیمامی عەلی دەکا و بەسەریدا هەڵدەڵێ. ئەوە ڕاستە شاعیر لە بیروباوەڕدا وەک شیعەییێکی دوازدە ئیمامی خۆی دەنوێنێ، بەڵام لە زۆر جێگە لە بیروباوەڕی یارسانانی ئەهلی حەق نزیک دەبێتەوە، ئەوانەی لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام باوەڕیان بەوە بوو بەپێی تیۆری دۆنا دۆن گیانی کردگار جێگەی خۆی لە لەشی ئیمامی عەلی دۆزیوەتەوە، جا لێرەدا ساڵح ئەگەر باوەڕی بەو تیۆرییە بووبێ تەنیا بۆ عەلی بەکارهێناوە، باس لەو ئەولیایانەی یارسان ناکا لە دوای عەلی لە کوردستاندا بەتایبەتی لە هەورامان کە هەموویان کورد بوون. هەرچۆنێ بێ ئەگەر باوەڕیشی بەتیۆرییەکانی یارسانان نەبووبێ هەندێ جار وەک شیعەییێک بۆ عەلی بەکارهێناوە.

لە شیعرێکیدا شاعیر لەم لایەنەوە دەڵێ:

شای کەرەمداران
یا عەلی هانا شای کەرەمداران



فەرد فەریاد ڕەس دەرماندەکاران
حەکیم حازیق شافی بیماران

***

یا عەلی هانا تای بێ هەمتایی
غەیر لە تو نیەن گرەی گوشایی
قادری قەییووم بێ چەندوچوونی
خالیقی ئەلفاز (کن فیکون)ی

***

ساحێب کەرەمی موشکیل گوشایی
زات موقەددەس تای بێ هەمتایی
تو ساقی کەوسەر شەرابەن تەهوور
تو زینەت بەخشای کەواکیب لە نوور
باعیسی ئیجاد کەون و مەکانی
مورەببی عالەم سرری سوبحانی
تو مالیکولمولک مەلەکووتەنی
تو جامیعی جەمع جەبەرووتەنی

***

حەقیقەت خالیق ئەرز و سەمایی
بیلا شوبهـ و شەک تای بێ هەمتایی
خودا و پێغەمبەر سەنا خوانتن
قورئان تەمامی وەسف شانتن

واتاکەی:

شای کەرەمداران
یا عەلی هانا شای کەرەمداران
ئەی تاکی فریای خەڵکی دەکەوی دەرمانی دەردانی
دانای گەورە و دەرمانی نەخۆشانی

***

یا عەلی هانا تۆ کەسێکی بێ هاوتای

جگە لە تۆ کەس دامەزرێنەری خۆشی نییە
بەتوانا و مەزنی بێ چەندوچوونی
تۆ وشەت خوڵقاندووە (کن فیکون)ی

***

خاوەن کەرەمی گیروگرفت جێبەجێ دەکەی
زاتی پیرۆزی تاکی بێ هاوتای
تۆ مەیگێڕی شەرابی کەوسەری پاکی
تۆ ئەستێرەکانت بەنوور ڕازاندۆتەوە
تۆ هۆی دروستبوونی گەردوون و جێگەی (مکان)
بەخێوکەری عالەم و نهێنییەکانی خودای
تۆ خاوەنی هەبوون و نەبوونی
تۆ کۆکەرەوەی هەموو هێز و توانایێکی

***

بەڕاستی خالیقی ئەرز و ئاسمانی
بێ گومانی تاکی بێ هاوتای
خودا و پێغەمبەر ستایشت دەکەن
قورئان بەتەواوی وەسفی کردەوەی چاکی تۆیە

لەم شیعرانەدا ساڵح هەندێ سیفەتی داوەتە عەلی هەرگیز ئەم سیفەتانە بۆ پێغەمبەرانیش بەکار نەهاتوون، وەکو: سارێژکەرەوەی برینی هەموو نەخۆشێک، بەتوانا و هێز و بێ چەندوچوون و خاوەنی (کون فەیەکوون) کە تەنیا بۆ خودایە، کەوسەر دەداتە بەهەشتییان، ڕووناکی بەخشیوەتە ئەستێرەکان، جێگە و کاتی دروست کردووە، ئەرز و ئاسمانی خوڵقاندووە، خودا و پێغەمبەر ستایشی دەکەن، هەموو قورئان بۆ مەدح و ستایشی ئەوە و گەلێ سیفەتی دیکە.

لایەنانی ئایینی ئیسلام بەهەموو ئایینزاکانییەوە لە ڕووی سۆفیزمەوە تەماشای ئەم بیروڕایانە دەکەن لە داهێنانی شیعردا لەبەر ئەوە بەدەرچوونی دانانێن لە ڕێ و ڕەوشتی ئیسلامەتی کە لە شەریعەتدا خۆی دەنوێنێ.

هەر لەم بابەتەوە ساڵح لە لیریکێکی دیکەیدا دەڵێ:



عەلی یار من
تا شاه مەردان عەلی یار من
ئومێد و ئیڵتاف هەشت و چاری من
مەولای خافیقەین نیگەهداری من
ئیمامی مەسجید و ساقی مەیخانە
روهبانی دێر و خودای بوتخانە
خانەزادی حەرەم یەکتای یەکانە
خانە و خانەزاد هەم صاحیبخانە

***

عەلی با حەق و حەق با عەلییەن
قەلبی من میرئات سەیەنجەلییەن
سینەی بێ کینەم تەماشاخانەست
کلیسا و مەسجید دێر و مەیخانەست

واتاکەی:

عەلی یاری منە
شاهی مەردان عەلی یاری منە
ئومێد و خۆشی من و هەشت و چواری منە
گەورەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و پارێزەری منە
ئیمامی مزگەوت و مەیگێڕی مەیخانە
ڕوهبانی دێر و خودای بوتخانە
گەورەی بنەماڵە و تاکییەکانە
ماڵی هەیە و لە ماڵ بووە و خاوەن ماڵە

***

عەلی حەقە حەق عەلییە
دڵی من ئاوێنەیە وێنەی دەداتەوە
سنگم بێ ڕق و کینم تەماشاخانەیە
کلیسە و مزگەوت دێر و مەیخانەیە

لەم دێرانەدا شاعیر دەڵێ عەلی کە ناوی شای مەردانیشە یاری منە، بۆ من ئومێدە و

ڕەمزی چوارده مەعسوومەکەیە، کردگاری ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوایە، ئیمامی مزگەوت و مەیگێڕی مەیخانە و ڕەبەنی دێر و بوتی بوتخانەیە، خاوەنی حەرەم و یەکتای بێ هاوتایە، خۆی ماڵ و حاڵە، خاوەنی ماڵە، عەلی ڕاستییە، ڕاستی عەلییە. ساڵح دڵی دەکا بەئاوێنە، سنگی دەکا بەتەماشاخانە (شانۆ)، تێیدا وێنەی کلیسە و مزگەوت و دێر و مەیخانە دەگیرێ. وەک ئاشکرایە ئەو سیفەتانەی شاعیر دەداتە پاڵ عەلی هەموویان بۆ کردگار بەکار دەهێنرێن.

لە شیعرێکی دیکەیدا شاعیر زیاتر عەلی لە سیفاتی کردگار نزیک دەکاتەوە، یا بەتەواوی دەیکا بەئادەمزادێکی سووپەرمانی بێ کەموکووڕی:

عەلی کافییەن عەلی شافییەن
عەلی سۆفییەن عەلی سافییەن
عەلی عادیلەن عەلی ئەعدەلەن
عەلی کامیلەن عەلی ئەکمەلەن
عەلی تاهیرەن عەلی ئەتهەرەن
عەلی زاهیرەن عەلی ئەزهەرەن
عەلی فانییەن عەلی باقییەن
عەلی ساغیرەن عەلی ساقییەن
عەلی قازییەن عەلی ڕازییەن
عەلی موزاریع عەلی مازییەن
عەلی مەسمووعەن عەلی سامیعەن
عەلی مەجمووعەن عەلی جامیعەن
عەلی باتینەن عەلی زاهیرەن
عەلی حازیرەن عەلی نازیرەن

واتاکەی:

عەلی کافییە عەلی شافییە
عەلی سۆفییە عەلی پاکە
عەلی یەکسانە عەلی یەکسانترە
عەلی کامیلە عەلی کامیلترە
عەلی پاکە عەلی پاکترە



عەلی دیارە عەلی دیارترە
عەلی لەناودەچێ عەلی هەر دەمێنێ
عەلی بادەیە عەلی مەیگێڕە
عەلی قازییە عەلی ڕازییە
عەلی وەرزێرە عەلی پێشووە
عەلی گوێ لێ گیراوە عەلی گوێگرە
عەلی کۆکراوەیە عەلی کۆ دەکاتەوە
عەلی باتینە عەلی زاهیرە
عەلی حازرە عەلی بینەرە

ئەو سیفەتانەی شاعیری کورد ساڵح داویەتییە عەلی وەک ڕەنگدانەوەیێکی بیروباوەڕی ئایینزای شیعەی موسوڵمان و ئایینی یارسان بەزمانی کوردی بووە بەمایەی دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی کوردی، بەو مانایەی بەرهەمی ڕەنگدانەوەی ژیانی ئادەمزادە و ئەو کاتە بەبەرز و پێشکەوتوو و ڕەنگین دەکەوێتە بەرچاو کە هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتبێتەوە، یەکێ لەو لایەنانە ئایین و سۆفیزمە بەهەموو ئایینزا و لق و پۆپەکانیانەوە.

### دلبەری جوانێکی زەمینییە

بەڕاستی شیعری ساڵح بەگشتی لە گولاّوی سۆفیزم بەولاوە هیچ جۆرە بۆنێکی دیکە ناپژێنێ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ وێنەی شیعری لای شاعیر هەیە خەیاڵی ڕۆمانتیکییانەی ئادەمزاد لە دوای خوێندنەوەی ئەو شیعرانە دەچێتە لای کیژێکی شۆخ و شەنگ:

دلبەر تو دینم
تو دای وەغارەت ئیمان و دینم
لەجار حوسنت من خوشە چینم
چون دزدی راهزەن های لە کەمینم
جوان بیم لە عیشق تو پیرم کەردی
وە زنجیری زولف ئەسیرم کەردی

***

تیــری مــوژگــانان دیدەی خــومــاری
لە ڕیشـــەی جــەرگم تو کــردی کــاری
مـەسـتـیم لە نەشـئـەی مـەسـتی چمـانن
چمـــانت فــیـــتنەی ئاخـــر زەمـــانن
کی وات مـن مـەخـمـوور جـامی شـەرابم
دوو دیدەی مــەســتت کــەردەن خــەرابم
خــودا داد لە دەست چاوڕەش چاوڕەشــان
خۆش خووخۆش لەهجە شیرین مەهوەشان

***

مـن وەکـــــــــو بـچـم ڕوو وەکـێ بـارم
وە هەر جــا مـــەچم هەر گـــرفـــتـــارم
سـەید سـاڵح تو دۆست شـاهی مـەردانی
بی چی خـەواتیـر ڕیش بار عـیـســانی

واتاکەی:

دلبەر تۆ ئایینمی
تۆ لەناوت برد ئیمان و ئایینم
لە پێش چرای جوانیت گوڵەوەچنی دەکەم
وەک دزی ڕێگر خۆم لە مارغەناوە (کەمین)
لاو بووم عیشقی تۆ پیری کردم
بەزنجیری زولف دیلت کردم

***

تیری موژگان و چاوی خومار
کاری لە ناخی جەرگی کردم
مەستم لە نەشئەی مەستی چاوانت
چاوانت فیتنەی ئاخر زەمانن
کێ دەڵێ من سەرخۆشی جامی شەرابم
دوو چاوی مەستت ماڵی وێران کردم



خودایە داد و فیغان لە دەست چاوڕەش و چاوڕەشان
خۆش خوو خۆشن لەهجە جوان و شیرین

***

من بۆ کوێ بچم ڕوو لە کێ بکەم
بۆ هەر لایێک بچم هەر گرفتارم
سەید ساڵح تۆ دۆستی شای مەردانی
لەبەرچی کەوتوویتە ژێر باری عیسیان

لەم شیعرانەدا شاعیر بەشێوازێکی کلاسیکییانەی ڕۆژهەڵات وەسفێکی ڕووکەشی ئەندامە جوانەکانی دلبەرێک دەکا خۆی لە کەنیشکێکی خانومان دەنوێنێ. بەڵام لە دوا دێری شیعرەکە ساڵح وازان دەکا لە ڕاستی دوورکەوتۆتەوە، بۆیە خۆی تاوانبار دەکا و بەخۆی دەڵێ: سەید ساڵح تۆ دۆستی عەلی شای مەردانی لەبەرچی عاسی دەبی و ڕێی ڕاست ون دەکەی.

لە لیریکێکی دیکەیدا شاعیر دەڵێ:

دینم و چاو
جـــــەمـــــالی دلبـــــەر دینـم و چاو
بێ حـیـجـاب لە پشت بێ پەردە لە ناو
هەم لـە بێـــــداری هەم لە دلـەخـــــاو
لازم نەدارۆ ســـبـــووت و شـــاهیـــد
مـن خـوددامی دین و خـودای واحـیـد

***

ســینە بێ کـینەم مـەملوو لە نوور بی
ڕەفـعـی زولمەت بی تەجـەللی تووڕ بی

***

ئەگــەر مــوخـــالیف دینی مـــوبینی
(لــکــم دیـــنــکــم ولـــي دیـــنـــي)

واتاکەی:

ئایینم و چاو
جوانی دلبەر ئایینم و چاو

بێ پەردە لە پشتەوە بێ پەردە لە ناوەوە
هەم لە بێداری و هەم لە خەودا
پێویست بەبەڵگە و شایەد ناکا
من خزمەتکاری ئایین و خودای تاک و تەنیام

***

سنگی بێ کینم پڕ لە ڕووناکییە
تاریکی لەناودەبا وەک تەجەللی شاخی تووڕ

***

ئەگەر لە دژی ئایینی ڕاستی
ئێوە ئایینی خۆتان هەیە منیش ئایینی خۆم

لەم لیریکەدا هەندێ لایەنی دیکە لە بەرهەمی شیعری ساڵح ئاشکرا دەبێ. لەوانە جوانی دلبەر دەکا بەئایین و چاو، واتە بیروباوەڕ و دیاردە (مەتریال)، یا تیۆری و پراکتیک لە تەمومژی شیعری دڵداری کلاسیکی نزیک دەبێتەوە. کە بیر لە نهێنی یا پشت پەردە دەکاتەوە، لە خەودا بێ یا لە بێداری دەتوانێ لێیان تێ بگا. ئەم پێویستی بەبەڵگە و شایەد نییە. خۆی بەخزمەتکاری ئایین و خودای تاک و تەنیا دەزانێ. هەروەها دەڵێ: سنگی پاک و بێ گەرد و پڕ لە ڕووناکی، تاریکی لەناودەبا، چونکە ڕووناکی شاخی تووڕی سینایە (شاخی حۆریب)، هەرکەسێکیش ئەگەر بیر لەوە بکاتەوە یەکێک لەسەر ئایینی ڕاست نییە پێی دەڵێ «لکم دينكم ولي ديني» واتە ئایینی خۆتان بۆ خۆتان، منیش ئایینم هەیە.

### کێوی ئەبدالان

ژمارەی کێوی پیرۆز لە کوردستاندا زۆرە. ئەشکەوتەکانیان لە ڕۆژگارانی کۆنی کۆنەوە لە پێشانا جێی ژیانی ئادەمزاد بوون، لە پاشانا بوون بەپەرستگای ئەو تیرە و هۆزانەی شاخەکانیان کردبوو بەکردگاری خۆیان لەوانە پیرەمەگروون و پیرمەم و بابا عەبداڵ (باوەیال) و هی دیکە.

کێوی ئەبدالان و هەموو کێوە پیرۆزەکانی دیکە بەدرێژایی مێژوو جێی عیبادەت و ڕیازەتی پیاوانی ئایین و موریدانی تەریقەت بوو. بەتایبەتی شاعیرانی گۆرانزەمین یەکێکی وەکو ساڵح ئەم شاخەی کردووە بەداڵدە و کونجی بیرکردنەوە و گەڕان بەشوێن



نهێنییەکانی ئایین و سۆفیزم. شاعیر لەم لایەنەوە دەڵێ:

میرزام ئەبدالان
یاهوو مەکێشم وێنەی ئەبدالان
دەور دەم شار وەشا مالان وەمالان
یەک یەک پەیدا کەم لە ئەهلی حالان
یەک ساعەت سوحبەت یارانی گیانی
بەهتەر لە تەخت و تاجی کەیانی

***

بف کەم لە نەفیر لە کۆی نەجد هوو
پری دبوو ودەد وەحشیانی کوو
بنیشم لە بان چەشمەی سەراوان
بف کەم لە نەفیر لەسەر کلاوان
بایەد یەک چللە بکێشم لە نوو
ویم کەم وە مۆئنیس وحشیانی کوو

***

قوللەی کووهی دل بکەم وە مەنزل
تختە بووس بخەم لە پای قاپی دل

***

تا حەق جیلوەکەی لە تالار دل
شاهنشینی دل بکەی وە مەنزل
سەید ساڵح ئەمجار بوو بنیش و شاد
غەمان یەکایەک کل بدیم وە باد

واتاکەی:

میرزام ئەبدالان
یاهوو دەکێشم وێنەی ئەبدالان
دەڕۆم شارە و شار و ماڵە و ماڵ
لە دوای ئەهلی حاڵ دەگەڕێم (دەروێش)

کاتێک لەگەڵ یارانی گیانی بەگیانی
چاکترە لە تەخت و تاراجی شەهنشاهانی کەیانییان

***

فوو لە شەیپوور بکەم لە کێوی نەجد
هەموو دڕندەکانی کێو کۆ دەبنەوە
لە قەراغ سەرچاوەی ئاوان دابنیشم
فوو لە شەیپوور بکەم لەسەر کلاوان
پێویستە سەرلەنوو چللەیێکی دیکە بکێشم
بۆ ئەوەی دڕندەکانی کێو بکەم بەهاودەم

***

پێویستە ناخی کێوی دڵ بکەم بەمەنزل
تەختە بووس لە بەردەرگای دڵی دابنێم

***

تا حەق پیشان بدەی لە ناو باڵەخانەی دڵ
شانشینی ناو دڵ بکەی بەمەنزڵ
ئەوجا سەید ساڵح بەشادی دەژی
غەم بەجارێک دەداتە بەر با

شاعیر شاخی ئەبدالان بەجێگەیێکی پیرۆز دادەنێ چونکە یەکێکە لەو شوێنانەی تێیدا لە حەقیقەت گەڕاوە. هەموو ژیانی گەڕان بووە لە حەقیقەت، شارە و شار و ماڵە و ماڵ لەم گێتییەدا لە گەشت بووە، لە دوای یاران گەڕاوە، کاتژمێرێک کۆبوونەوە لەگەڵ یاران گەورەتر و بەنرخترە لە تەخت و تاجی شاهەنشاهانی کەیانی ئەفسانەیی. ساڵح نەیارانی کۆ نەکردۆتەوە و لەگەڵیان دانەنیشتووە بەڵکو لە شەیپووری داوە و دێو و درنجی شاخانی کۆ کردۆتەوە بۆ ئەوەی هەموو لە دەوری کانی و ئاوەکانی شاخی ئەبدال کۆ ببنەوە و چللە بگرن (ڕۆژانی ڕیازەتی سۆفییان) لە پێناوی ئەوەی «ڕاستی» لە ناو کۆشک و سەرای دڵ بدۆزنەوە و شانشینی ناو دڵ ببێ بەماڵیان ئەو کاتە سەید ساڵح شاد دەبێ و هەموو غەمێک بەبەر با دەدا.

شاعیرێکی دیکەی گۆرانزەمین غولام ڕەزا ئەرکەوازی (١٧٧٥-١٨٤٠) یادگار و



بیرەوەری لەگەڵ ئەم شاخە پیرۆزەدا زۆرە، کردوویەتییە پەرستگا و شیعری ستایشی بەسەر هەڵداوە.

***

میر محەمەد ساڵح حەسەنی نیعمەتوڵڵاهی کرماشانی وەک پەیکەرێکی ئەدەبی بەرچاو دەکەوێتە ڕوو لە ناوچەکانی گۆرانزەمینی کوردستان. زمانی شیعری لە بنجدا دیالێکتی گۆرانییە بەڵام تێکەڵاوە، بەواتاییێکی دیکە کەوتۆتە ژێر کاریگەری دیالێکتە هاوسێکانی تری زمانی کوردی وەکو کرمانجی باشوور و لوڕی و دیالێکتە بچووکەکانی هەرێمی گەورەی ئوستانەکانی کرماشان و کوردستان (سنە).

لە بابەت کێش و قافیەوە شیعری ساڵح وەکو زۆربەی هەرە زۆری شیعری شاعیرانی گۆرانزەمین خۆماڵین و لەسەر بنچینەی دە سیلابی و جووت قافیە (مەسنەوی) دامەزراون. زمانی ساکار و ئاسانە، بەڵام زاراوەی ئایین و سۆفیزم زۆر بەکار دێنێ. بەڕووکەش و بەو جۆرەی کە بەئەلفوبێی عەرەبی شیعری دەنووسرێنەوە وا دەکەونە بەرچاو وشەی فارسی زۆر بەکارهێنا بێ، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە فارسیزم لە بەکارهێنانی وشە و لێکسیکۆن لە شیعری ساڵح کەم دەکەوێتە ڕوو، زیاد لەسەر ئەوەش شاعیر شانازی بەوە کردووە کە کوردە، ئەمەش لە سەرانسەری دیوانیدا دەردەکەوێ. بەڕاستی ئەو وەکو شاعیرێکی مەلەوان لە زەریای سۆفیزم و گیرۆدەی ئایینی ئیسلام (ئایینزای شیعەی دوازدە ئیمامی) ئەگەر ئاوڕی لە نەتەوە و قەومییەتی خۆ نەدابایەوە کەس گلەیی لێ نەدەکرد، بەم کردەوەیەی خۆی خۆشەویستتر کردووە لە لای هەموو نەوەکانی نەتەوەی کورد.

## بەشی دوازدەم

# شێخ ڕەزا

## ١٨٣٧ - ١٩١٠

## ژیان و شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

### ژیانی شاعیر

### لە دایکبوون و سەردەمی خوێندنی

شێخ ڕەزا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی شێخ ئەحمەد تاڵەبانی کوڕی مەلا مەحموودی زەنگنەیە. لە ساڵی ١٨٣٧ لە گوندی قرخ نزیک شارۆچکەی چەمچەماڵ لە دایکبووە، لەو سەردەمەدا ئەو گوندە سەر بەناوچەی بازیان بووە. شاعیر ناوی ڕاستەقینەی خۆی «ڕەزا»ی وەک نازناوی شیعری بەکارهێناوە. هەندێ جار «لامیع»یشی بەکارهێناوە، ڕەنگە ئەمە زیاتر لە سەرەتای دەستپێکردنی شیعر دانانی بووبێ، جار بەجاریش «شێخ ڕەزا»ی وەک نازناو بەکارهێناوە.

شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی شێخ ڕەزا لە نەوەی مەلا مەحموودی زەنگنەیە، ئەم بنەماڵەیە بەبنەچە سەید نین، لەبەر ئەوە کە بوون بەشێخی تەریقەتی سۆفیزم شێخی بەرماڵیان پێ وتراوە. لە سەردەمی لە دایکبوونی شێخ ڕەزا باوکی لە نێوان گوندی قرخ و کەرکووک دەژیا. سەرەتای خوێندنی لای شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی بووە، شێخ غەفووری مامیشی لەو قۆناغەدا وانەی زانستییە ئیسلامییەکان و زمانی عەرەبی پێ وتووە.

سەید محەمەد بلاغ و حاجی سەعید ئەفەندی حیلمی زادە لە مامۆستایانی ئەو ڕۆژگارە بوون زانستییەکانی زمانی عەرەبییان فێر کردووە. بۆ تەواوکردنی خوێندنی حوجرەی مزگەوت ڕووی کردۆتە کۆیە، لەوێ لە لای مەلا ئەسعەدی جەلی زادە قۆناغی فەقێیەتی بردۆتە سەر. لەو کاتەدا ناسیاوی لەگەڵ کەیفی جوانڕۆیی پەیدا دەکا، هەردووکیان فەقێی مەلا ئەسعەد دەبن. ماوەیێکیش شێخ ڕەزا لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی خوێندوویەتی.

شێخ عەلی برا گەورەی شێخ ڕەزا هێشتا شێخ عەبدولڕەحمانی باوکیان لە ژیاندا دەبێ



بەجۆرێک پەروەردەی دەکا لە ڕووی ڕەوشت و ڕۆشنبیرییەوە لە دوای خۆی شێخ ڕەزا ببێ بەپوستنشینی تەریقەتی قادری و تەکیەی شاری کەرکووکیان بەرێوە ببا.

لە دوای پێویستییەکانی بەمەلا بوون، هەوەسی بینینی ئەستەموڵ دەکەوێتە خەیاڵییەوە. لە ساڵی ١٨٥٦ کە بڕیاریدا بچێتە ئەستەموڵ باوکی مابوو. نزیکەی دوو ساڵ لەو شارە گەورە و پێشکەوتووە مایەوە. هەرچەندە زانیارییێکی ئەوتۆ لە ناوەوە نییە لە بابەت گەشتەکەی ئەستەموڵی شاعیر، بەڵام بێ گومان لەو گەشتەدا چاوی کراوەتەوە، گەلێ شت فێر بووە، زۆر کەسی ناسیوە لە شاعیر و ڕۆشنبیرانی پایتەختی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی عوسمانی. لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆ کەرکووک لە نێوان مووسڵ و هەولێر هەواڵی مردنی باوکی دەبیستێ لە ساڵی ١٨٥٨. ئەوەی پێویستە لێرەدا ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە شێخ ڕەزا تا ئەو کاتە شیعری داشۆرین (هەجوو) و کراوەی (ئیرۆتیک) نەوتبوو.

بەهۆی مردنی شێخ عەبدولڕەحمانی سەرۆکی بنەماڵە و مورشیدی تەریقەت برا گەورەی شێخ ڕەزا لە جێی باوکی دادەنیشێ، گوندەکانی قرخ و تاڵەبان بۆ شێخ ڕەزا دادەنرێ، شێخ عەلیش هەندێ ئاقاری دەست دەکەوێ وەکو قەرەحەسەن و لەیلان و یەحیاوا و زەویوزاری پشت تەکیە. شێخ ڕەزا ئارەزووی ئەوە بوو لەمانەشدا وەکو شێخ عەلی بەشی تێدا بێ، کە ئەمەی بۆ نەچووە سەر، ئیتر ژیانی دەروێشی و تەکیە قورس بوو لە لای، بۆیە ناتەبایی کەوتە نێوان برایان شێخ عەلی و شێخ ڕەزا. زیاتریش دەست و پێوەندی شێخ عەلی دەوریان هەبوو لە هەڵگیرساندنی ئاگری ئەو ناخۆشییە، چونکە نەیارانی شێخ ڕەزا زۆر بوون و لە زمانی دەترسان وەک لە هەندێ شیعری شێخ ڕەزا ڕەنگی داوەتەوە.

هۆی گرنگتریش هەبوو بۆ دروستبوونی ئەم ناخۆشییە لە نێوان هەردوو برا. ئێمە لە نەریتی دەرەبەگی لای خۆمان گەیشتبووین، ئەوەش دەزانین لە دوای مردنی شێخ عەبدولڕەحمان، شێخ عەلی میراتی باوکیانی بەیەکسانی لە نێوان خۆی و شێخ ڕەزا دابەش نەکردبوو، جگە لەوەی شێخ عەلی وەکو کوڕە گەورەی باوکی جێی ئەوی گرت بووەوە و لە سەرۆکایەتی تەریقەتی قادری لە کەرکووک. هەرچۆنێ بێ ئەو کردارە ناهەموارە بەدڵی شێخ ڕەزا نەبووە کە لە ئەنجامی نەریتی دەرەبەگییەوە کەوتۆتە ناوەوە، بەم جۆرە شێخ ڕەزا بوو بەقوربانی ئەو نەریتە. کەچی بێ گومان شاعیر هۆی نالەباری ژیانی دەگەڕێنێتەوە بۆ «قەدەر، چارەنووس» یا کەمی پیاوی باش و دڵسۆز لە ناو کۆمەڵدا.

ساغ لە دنیادا نەماوە گەر قسەی ساغت دەوێ
بێ هەزارت پێ پیشان دەم گەر قورمساغت دەوێ

ئەو ناخۆشییەی نێوان هەردوو برا دەبێتە هۆی ئەوەی شێخ ڕەزا لە کەرکووک بار بکا.

## ژیانی کۆیەی

لەو کاتەدا شێخ غەفووری مامی مورشیدی تەکیەی کۆیە دەبێ. ئیتر شێخ ڕەزا ڕوو دەکاتە ئەوێ بەمەبەسی ئەوەی پارە لە مامی وەربگرێ و گەشتی ئەستەموولی پێ بکا. لە پێشانا مامی پێشوازییێکی گەرمی دەکا، هەموو ئارەزووەکانی دەهێنێتە دی، تا دەگاتە ئەوەی بەڵێنی دەداتێ کچی خۆی لێ مارە بکا. ئەم خۆشییە تەمەنی درێژ نەبووە، لە پاشانا ناخۆشی دەکەوێتە نێوانیانەوە، تا دەگاتە ئەوەی شێخ ڕەزا بەهێزترین و کراوەترین شیعری داشۆرین بنووسێ لە دژی غەفووری مامی و ڕەشیدی ئامۆزای.

لەو گەشتەیدا شێخ ڕەزا شەش مانگ لە کۆیە دەمێنێتەوە، ئینجا دەگەڕێتەوە کەرکووک و ماوەیێک لە ژیانی دەباتە سەر و دووبارە هەوەسی چوونە ئەستەموولی دەکەوێتە سەر.

## گەشتی دووەمی بۆ ئەستەمووڵ

لە ساڵی ١٨٦٦ شێخ ڕەزا دووبارە ڕوو دەکاتەوە ئەستەمووڵ و ئەمجارەیان ماوەی شەش حەوت ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە، لەم بابەتەوە هەندێ زانیاری لە ناوەوە هەیە نویشکی ئەوەیە، شێخ ڕەزا لە ئەستەمووڵ ناسیاوی لەگەڵ هەندێ لە گەورە پیاوان پەیدا دەکا، لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا پێوەندی بەخەڵکی چینەکانی سەرەوە و خوارەوەی کۆمەڵی ئادەمزادی ئەوێ بووە، دەوڵەمەند و هەژار. لەوانە لە یووسف کامیل پاشا (١٨٠٥ - ١٨٧٦) زۆر نزیک بووە. ئەم زاتە لە کاتی خۆیدا سەرەک وەزیران (سەدری ئەعزەم) بووە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سولتان عەبدولعەزیز لە ساڵی ١٨٦٢، هەروەها ئەدەب دۆستێکی دەوڵەمەند بووە. باڵەخانەییێکی گەورەی بۆ شاعیر و نووسەرە بێ کەس و دەستکورتەکان داناوە بەناوی «دارولکامیل»ەوە، شێخ ڕەزا ماوەیێک لەم یانەیەدا ژیاوە.

لەو ڕۆژانەدا ئەحمەد پاشای بابان لە دوای ڕووخانی میرنشین لە ئەستەمووڵ دەژی. دۆستی شێخ ڕەزا بووە، پێوەندییان لەگەڵ یەکتری خۆش بووە، بەتایبەتی لەو سەردەمانەی ئەحمەد پاشا لە ئەستەمووڵ بووە، چونکە بەهۆی نەخۆشییەوە ماوەیێک لە پاریس ژیاوە، هەروەها عەیامێکیش والی دەوڵەتی عوسمانی بووە لە یەمەن. شێخ ڕەزا شیعرێکی بەناوبانگی هەیە لە ستایشی ئەحمەد پاشا.



شاعیری ئەم ماوەیە دۆستایەتی لەگەڵ گەلێ لە پیاوە گەورەکانی عوسمانی بووە، لەوانە سوبحی پاشای کوڕی سامی پاشا (١٨١٨ - ١٨٨٦)، ئەم کابرایە چەند جارێک بووە بەوەزیر، جگە لەوە نووسەر بووە و کتێبی بڵاوکراوەی هەیە.

جگە لەمانە شێخ ڕەزا دۆستایەتی لەگەڵ دوو شاعیری کورد بووە، محەمەد میهری کەرکووکی و خەیالی هەولێری ئەمانە لە دانیشتوانی شاری ئەستەمووڵ بوون. لە ناو هاوڕێیانی ئەستەموولی ئەمین فەیزی جێگەی تایبەتی لە ناو دڵ و دەروونی شێخ ڕەزا بووە، یەکێکە لەو دەگمەنانەی کە شێخ تەنیا ستایشی کردوون و نەکەوتوونەتە داوی داشۆرینییەوە، بەرامبەر بەمە ئەمین فەیزی لە کتێبی «ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد» بایەخی زۆری بەشێخ ڕەزا و شیعری داوە.

وەک وتراوە شێخ ڕەزا پێوەندی بەهەموو توێژەکانی کۆمەڵی ئەستەمووڵ بووە لە شاعیرانەوە بۆ وەزیران تا دەگاتە خەڵکی ناو بازاڕ، لەوانە لە مستەفا فازیل پاشا (١٨٢٩ - ١٨٧٥) نزیک بووە، ئەمە کوڕی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشای میسر بوو، هەروەها عالی پاشای (١٨١٥ - ١٨٧١) سەرەک وەزیرانی ناسیوە، لە دوای مردنی ئەو مەحموود نەدیم پاشا (١٨١٨ - ١٨٨٣) بووە بەسەرەک وەزیران.

شێخ ڕەزا شیعرێک لە ستایش و پێداهەڵدانی سوڵتان عەبدولعەزیز دەنووسێ، ناوی مەحموود نەدیم لە شیعرەکەدا دەهێنێ، بەئومێدی ئەوەی شیعرەکەی بۆ بگەیەنێتە دەستی سوڵتان.

لە ماوەی ژیانی شێخ ڕەزا لە ئەستەمووڵ ناسرەدین شای قاجاری ئێران گەشتی ئەستەمووڵ دەکا، شێخ ڕەزا لێی نزیک دەبێتەوە و شیعرێک لە ستایشیدا دەنووسێ، لە ئەنجامی ئەمە شا شاعیر خەڵات دەکا. لە ناو هەموو ئەو خەڵکانەی شێخ ڕەزا ناسیونی وەک شاعیر مەقامی نامیق کەمالی ناودار لە هەموویان بەرزتر بووە. شێخ ڕەزا کۆڕی لەگەڵدا بەستووە، گوێی لە شیعری گرتووە و شیعری خۆشی بۆ خوێندۆتەوە.

لە ژیانی ئەستەموولی شێخ ڕەزا ناسیاوی لەگەڵ زۆر کەس پەیدا کردووە، بەشیعر ستایشی کردوون، لە پاشانا لەگەڵیان تێکچووە و دایشۆریوون. لە ماوەی ژیانی ئەستەموولی هەندێ جێ گەڕاوە، بەهۆی سەرەک وەزیرانەوە حەجی کردووە، لە حەج بەڕێگەی میسر گەڕاوەتەوە، لە گەشتی دیکەیدا چاوی بەیەمەن کەوتووە، دوور نییە لەو سەردەمە بووبێ کە ئەحمەد پاشای بابان والی یەمەن بووە، هەروەها سوریا گەڕاوە، شاری حەلەبی دیوە.

شێخ ڕەزا لە ساڵی ١٨٧٤ بەیەکجاری ئەستەموولی بەجێهێشتووە و گەڕاوەتەوە کەرکوک.

## دوا ژیانی شێخ ڕەزا لە کەرکووک

وەک لە دۆستی بەڕێزم موکەڕەم تاڵەبانیم بیستووە و لە کتێبەکەشدا لە بابەت شێخ ڕەزاوە نووسیویەتی، دەڵێ: دیوەخانی شێخ ڕەزا لە ژوورێک و هەیوانێک پێکهاتبوو لە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک. شیعری شێخ لەسەر دیواری ژوورەکە بەنووکی قەڵەم هەڵکەندرا بوو لە لایەن خۆیەوە و دۆستانییەوە، لە دوای سپیکردنەوەی دیواری ژوورەکە هەموو شیعرەکان لەناوچوون!

لەو ماوەیەدا دەسەڵاتی عوسمانی مانگانەیێکی بۆ بڕیبووەوە. هەروەها لە دەوروبەری کەرکووک خۆی خەریکی کاری کشتوکاڵیش کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ژیانی ئەم قۆناغەی کەرکووکی ئاسان نەبوو، لەبەر ئەوە خۆی لە کاربەدەستان و ناودارانی ئەو سەردەمە نزیک کردبووەوە. لەوانە عوسمان پاشای جاف و مەحموود پاشای جاف، شیعری ستایشی بۆ یووسف مەزهەر پاشای والی کەرکووک نووسیوە. پیشەی شێخ ڕەزا تەنیا ستایش و پێداهەڵدان نەبووە، بەڵکو لەگەڵ زۆر کەس تێکچووە، تەنانەت ئەوانەی ستایشی کردوون بەتایبەتی مووچەخۆری دەوڵەت و گەلێ کەسی دیکەش. بەگشتی ئەو کەسانەی خزمەتی شێخ ڕەزایان کردووە ستایشی کردوون، ئەوانەی خزمەتیان نەکردووە دایشۆریوون.

شێخ ڕەزا بەحسێبی کۆمەڵایەتی پێویست بوو بەناو و ناوبانگ و دەوڵەمەندی لە چینی سەرەوە بێ، ئەگەر مەسەلە دەوڵەمەندی بێ لەمەیان بێ بەش بووە، سامانی باوکی بۆ شێخ عەلی برای ماوەتەوە. وەکو دەردەکەوێ شێخانی هەموو تەریقەتەکانی سۆفیزم بەکۆشش و دەست و بازووی خۆیان دەوڵەمەند نەدەبوون بەڵکو دەسەڵاتی عوسمانی تەکیە و خانەقای بۆیان بینا دەکرد، زەویوزار و دێهاتیان پێشکێش دەکردن بۆ بەڕێوەبردنی تەکیە و خانەقاکانیان، جگە لەوە دیاری و سەوقاتی دەوڵەمەندانیان بۆ دەچوو. بەڵام شێخ ڕەزا بەشی هەرە زۆری ژیانی لەم جۆرە شێخایەتییە بێ بەش بوو. لەم لایەنەوە وەکو هەموو مەلاییێک یا مورشیدی تەریقەت حوجرەییێکی لە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک هەبوو، بەڵام شێخی گەورە نەبوو، بەڵکو زۆربەی ژیانی چەوساوە بوو، بۆیە وەکو لە هەندێ لە شیعرەکانیدا دەردەکەوێ خۆی بەهەژار و بێ دەسەڵات حسێب دەکرد. بەم جۆرە شۆڕشێکی ئەدەبی نایەوە، مایەی ئەو شۆڕشە جنێو بوو، شاعیر توانی ئەم جنێوە لە



قاڵبی جوانکاری (ئیستێتیکی)دا بڕێژێ، بەمە بوو بەشاعیرێکی بەرز و داهێنەر.

گیروگرفتی ژیان تەنگی بەشێخ ڕەزا هەڵچنی بوو، ژیانی کەرکووکی خۆش و ئاسان نەبوو، لەبەر ئەوە بڕیاریدا بەیەکجاری کەرکووک بەجێ بێڵێ و ڕوو بکاتە بەغدا.

## دوا قۆناغی ژیانی لە بەغدا

شێخ ڕەزا لە ساڵی ١٩٠٠ لە کەرکووک دەردەچێ و ڕوو دەکاتە بەغدا و دەیکا بەمەڵبەندی ژیانی هەمیشەیی. بنەماڵەی تاڵەبانی لە بەغدا لە گەڕەکی مەیدان لە بابولموعەزەم تەکیەیێکی بچووک و پەڕپووتیان بووە. شێخ عەلی شێخ ڕەزا دەنێرێ بۆ ئەوەی تەکیەی ئەوێیان بەڕێوە ببا. لەو کاتەی شێخ ڕەزا چووە بۆ بەغدا تەکیەکە تەعمیرکراوە و لە ژێر ئیرشادی شێخ ڕەزا ئاوەدان بۆتەوە. ئەو خانووەی تەکیە بووە، هەر لەو کاتەدا ماڵی شێخ و مزگەوتیش بووە.

لەگەڵ نیشتەجێبوونی شێخ ڕەزا لە بەغدا ئاشنایەتی لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵک و بنەماڵە پەیدا کردووە، لەوانە حەمدی بەگی بابان و سەلیم بەگی بابان و مفتی زەهاوی و جەمیل سدقی زەهاوی و سەید مەحموودی گەیلانی و ئیبراهیم پاچەچی و عیسا ئەفەندی جەمیل زادە و عەتا ئەلخەتیب و بنەماڵەی نەقیب و بنەماڵەی عەبدولغەنی شارەبانی و هی دیکە.

شێخ ڕەزا لەسەر ڕێ و ڕەوشتی تەریقەتی قادری تەکیەی بەغدایانی بەڕێوە دەبرد، لەم لایەنەوە دەڵێ: ئێمە تەکیەمان ناشارینەوە وەکو نەقشبەندییان. لەمەدا مەبەسی ئەوەیە هەندێ ڕێ و ڕەسمی تەریقەت بەتایبەتی زیکر و تەهلیلەی دەروێشان لە لای قادرییان ئاشکرایە، کەچی لە لای نەقشبەندییان نهێنییە.

ژیانی شێخ ڕەزا لە بەغدا وشک نەبووە، برادەری زۆر بووە، هاتوچۆیان کردووە، ئەویش سەری لێ داون. زیارەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی زۆر بووە، لە چایخانەکانی بەغدا دانیشتووە.

لە دوا ساڵانی ژیانیدا شێخ ڕەزا تووشی نەخۆشییێک بووە لە هەردوو پێی خستووە، هەروەها دەڵێن بەنەخۆشی زەحیری لە ڕۆژی ٢٠ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٠ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە بەغدا نێژراوە.

## شیعری شێخ ڕەزا لە ڕووی ڕوخسارەوە

شیعری شێخ ڕەزا بەقەوارە بچووکە، بەناوەڕۆک گەورەیە، کەم شاعیر وەک ئەو دەبینرێ شیعری لە گشت مەبەس و بابەتەکانی کلاسیکی وتبێ. شاعیر هەموو دیالێکتە گەورە و بچووکەکانی زمانی کوردی زانیوە، کێشی شیعری سوار بووە، هەڵە لە قافیەیدا نەبووە.

هەندێ لە چاپەکانی دیوانی شێخ ڕەزا:

تا ئێستا بایەخێکی زۆر بەبەرهەمی شێخ ڕەزا دراوە لە ڕووی بڵاوکردنەوەی دیوان و لێکۆڵینەوە لە شیعری. هەندێ لەو سەرچاوە و کەرەستانە لێرەدا دەستنیشان دەکرێن.

١- ئەمین فەیزی لە کتێبی ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد لە ئەستەموولْ. لە ساڵی **١٩٢١** هەندێ شیعری بڵاوکردۆتەوە.

٢- دیوانی شیعری لە ساڵی **١٩٣٥** بۆ یەکەمین جار لە لایەن کوردی مەریوانییەوە لە بەغدا بڵاوکراوەتەوە.

٣- دیوانی شیعری لە ساڵی **١٩٤٦** لە بەغدا لە لایەن عەلی تاڵەبانییەوە بڵاوکراوەتەوە.

٤- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ئامادەکردنی ناسری ئیبراهیمی، ستۆکهۆڵم، **١٩٩٣**.

٥- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ئامادەکردنی چالاک تاڵەبانی، سلێمانی، **١٩٩٩**.

٦- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ئامادەکردنی ئومێد کاکەڕەش، سلێمانی، **١٩٩٩**.

٧- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ئامادەکردنی شوکور مستەفا، هەولێر، **٢٠٠٠**.

لێکۆڵینەوەی زۆر لە شیعری شێخ ڕەزادا کراوە، لەوانە نووسینێکی سی. جەی. ئەدمۆندس لە ساڵی **١٩٣٥** بەئینگلیزی بڵاوکراوەتەوە و لە لایەن تۆفیق وەهبییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لە بەغدا لە ساڵی **١٩٤٣** لە گۆواری دەنگی گێتی تازەدا بڵاوکراوەتەوە؛ هەروەها ئەحمەد تاقانە کتێبی «شێخ ڕەزای تاڵەبانی کەڵەشاعیری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست»ی لە ساڵی **١٩٩٩** لە هەولێر بڵاوی کردۆتەوە، ئینجا موکەڕەم تاڵەبانی کتێبی «شێخ ڕەزای تاڵەبانی- ژیانی، پەروەردەی، بیروباوەڕی و شیعری» لە ساڵی **٢٠٠١** لە هەولێر بڵاوی کردۆتەوە. ئەم دوو کتێبەی دوایی چاکترین لێکۆڵینەوەن لە بابەت ژیان و شیعری شێخ ڕەزا کە تا ئێستا بڵاوکراونەتەوە.

دەتوانین وێنەیێکی ڕاستەقینەی ڕوخساری شیعری شێخ ڕەزا لەم دیاردە و تێبینییانەی خوارەوە ببینین.

ئەو زمانانەی شیعری پێ وتوون:



شاعیر بەچوار زمان شیعری وتووە: کوردی و تورکی و فارسی و عەرەبی، لە هەر چوار زماندا پلەی شیعری گەیشتۆتە ئەوپەڕی نموونەی بەرزی بەرهەمی شیعری کلاسیکی ئەو زەمانانە.

ڕاستە شیعری بەزمانی عەرەبی کەمە، بەڵام ئەوەی لە بەردەستدایە بەڵگەی ئەوەیە ئەگەر دانانی شیعری بەعەرەبی بکردایە پیشە بەرهەمی شیعری ئەو زمانەی لە پێشەوە دەبوو، هەرچی شیعرە تورکییەکانیشن ئەمانە دەمێکە لە گێتی ئەدەبیاتی زمانی تورکی وەرگیراون و چوونەتە ناو مێژووی ئەدەبی تورکییەوە.

شیعرە فارسییەکانیشی لە نێوەندی ئەدەبی فارسی پێشوازی کراون و پێویستە بچنە ناو مێژووی ئەدەبیانەوە. ئێمەی کورد شانازی بەوەوە دەکەین شاعیرێکی وەکو شێخ ڕەزای کورد نەژاد لە دەرگاییێکی گەورەوە بچێتە مەملەکەتی شیعری تورکی عوسمانی و فارسییەوە.

دەمێنێتەوە بەشی ئێمەی کورد کە شیعرە کوردییەکانی شێخ ڕەزایە. ئێمە لەم ماوەیەدا تەنیا بایەخ بەم شیعرانە دەدەین، چونکە ئەم شیعرە کوردییانەن دەچنە ناو مێژووی ئەدەبەکەمانەوە. بەڵام ئەوە هەیە هەموو شیعری شێخ ڕەزا بەهەر زمانێک هۆنیبێتییەوە ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی کوردەوارییە، هەروەها تەعبیر لە کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و نەتەوە هاوسێکانی کوردیش دەکا. شیعرە ناکوردییەکانی شێخ ڕەزا سەرچاوەیێکی گرنگە بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی لە مێژوو و ژیانی کۆمەلایەتی و سایکۆلۆجی و فۆلکلۆر و ئەتنۆگرافیا و لایەنەکانی دیکەی کۆمەڵی کوردەواری.

## شێوازی ئاسانی پڕ لە هونەر

زمانی شیعری شێخ ڕەزا ئاسانە، وشە و تەعبیری قورسی کلاسیکی هەیە، لە ڕەوانبێژیدا هاوتای نییە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێچەوانەی ئەمە دیاردەیێکی گرنگە لە شیعری شێخ ڕەزادا، واتە زیاتر هۆگری زمانی میللی سەر زار و ئیدیۆم و قسەی نەستەقی ناو خەڵکە. توانای بەکارهێنانی وشەی دیالێکتەکانی ناوچەیی زمانی کوردی لە شیعریدا بەهێزە، ئەمە تەنیا دیالێکتەکانی زمانی کوردی ناگرێتەوە، بەڵکو هەموو شێوازەکانی زمانانی تورکی و فارسی و عەرەبیش دەگرێتەوە، ئەمە لە هەندێ لە شیعرە کوردییەکانیدا دەکەوێتە بەرچاو کە لە بابەتی مولەممەعن یا بەڕستە و تەعبیری ئەو زمانانە تێکهەڵکێش کراون.

## کێشی شیعری شێخ ڕەزا

بەگشتی شێخ ڕەزا بەحرەکانی عەرووز لە شیعریدا بەکار دێنێ، وەکو هەموو شاعیرانی دیکەی کلاسیکی کورد، بەشی هەرە زۆری شیعری لەسەر بەحرەکانی هەزەج و ڕەمەلن، هەروەها بەحرەکانی موزاریع و موجتەس و خەفیف و ڕەجەز و سەریعیشی بەکارهێناوە.

## قافیەی شیعری شێخ ڕەزا

شێخ ڕەزا دەنگە قورسەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی نەکردووە بەقافیە، بەزۆری دەنگە سووک و ئاسانەکانی بەکارهێناوە. لە سەرانسەری شیعری شێخ لە قافیەدا ئەم دەنگانە دەبینرێن: ا ب ت ح د ر ز س ش غ ق ک م ن و ه ی ێ. لێرەدا ئەوە دەردەکەوێ شاعیر لە نیوەی زیاتری ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی لە قافیەی شیعریدا بەکاری هێناون.

## ژانرەکانی شیعری شێخ ڕەزا

شاعیر لە هەموو ژانر و بابەتەکانی شیعری کوردی نەوتووە لە ڕووی ڕوخسارەوە، بەڵام ژانرە گرنگەکانی شیعری کلاسیکی لە ناو بەرهەمی شیعریدا دەبینرێن وەکو لە لای خوارەوە پیشان دراون:

١- تاک (فەرد): بریتییە لە دێرە شیعرێک لە دوو نیوە دێر پێکهاتووە، بەزۆری قافیەی هەردوو نیوە دێر وەک یەک دەبن (ا ا)، هەندێ تاکیش هەیە هەردوو نیوە دێرەکە وەک یەک نابن (ا ب). ئەم بابەتە شیعرە بۆ وەرامی پرسیارێکی کورت بەکار دەهێنرێ، هەروەها هەڵوێستێک پێویستی بەسەرنجێکی کورت هەبێ، ئەمە لای شێخ ڕەزا یا لە قسەی نەستەق و پەندی پێشینان وەردەگیرێ، یا داهێنانی شاعیرە و لە پاشانا دەبێ بەقسەی نەستەق. شێخ ڕەزا لە هەموو شاعیرانی دیکەی پێش خۆی و پاش خۆی زیاتر تاکی هەیە ژمارەیان دەگاتە دەوروبەری سەد و چل.

٢- چوارین: بریتییە لە دوو دێرە شیعری کلاسیکی. بەزۆری لە قافیەی چواریندا نیوە دێری یەکەم و دووەم و چوارەم لەسەر دەنگێک دەبن، بەڵام قافیەی نیوە دێری سێیەم لەسەر دەنگێکی دیکە دەبێ (ا ا ب ا)، هەندێ جاریش هەر چوار نیوە دێر شیعرەکە لەسەر یەک قافیە دەبن (ا ا ا ا)، بەڵام شێخ ڕەزا ئەگەرچی بەزۆری ئەم سیستێمەی بەکارهێناوە لە چوارینەکانیدا، کەچی سیستێمی دیکەشی داهێناوە لە قافیەی چوارینەکانیدا، وەکو (ا ب ا ب)، (ا ب ج ا)، (ا ب ب ب)، ئەمە لە شیعریدا جۆرە ڕەوانییێکی لە مۆسیقا و ڕیتم دروست کردووە.



شێخ ڕەزا چوارینی زۆرە، ژمارەیان دەگاتە دەوروبەری چل دانە. ئەم بابەتە شیعرەی بۆ ناوەڕۆکێکی کورتی دڵداری و کۆمەڵایەتی و فەلسەفی و دانایی بەکارهێناوە. شاعیر زیاد لەسەر ئەمانە چوارینی بۆ داشۆرین و کراوەش (ئیرۆتێک) بەکارهێناوە.

٣- پارچە (قطعة): بەو شیعرە دەوترێ کە لە سێ دێر تا پێنج دێر پێکهاتووە، قافیەی وەکو غەزەل و قەسیدەی ئاسایی دەبێ، نیوە دێری یەکەم و دووەمی دێری یەکەم لەسەر یەک قافیە دەبن (ا ا)، هەموو نیوە دێرە دووەمەکانی پارچەکە وەک قافیەی نیوە دێری یەکەم و دووەم دەبن. شاعیر لەم بابەتە شیعرەی زۆرە.

٤- غەزەل و قەسیدە: هەموو شیعرێک لە حەوت دێرە شیعرەوە تا دوازدە دێر، هەندێ کەس تا هەژدەی دەبەن، لە ڕووی ڕوخسارەوە غەزەلی پێ دەڵێن، نەک لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، چونکە غەزەل مانای ئەڤین و دڵداریش دەگەیەنێ. ئەگەر ژمارەی دێری غەزەل لە هەژدە تێپەڕ بکا «قەسیدە»ی پێ دەوترێ. ئەم بابەتە شیعرانە لای شێخ ڕەزا بەرچاو دەکەون و بنج و بناوانی شیعری کوردی کلاسیکی پێک دێنن.

٥- پێنج خشتەکی: لە دیوانی شێخ ڕەزادا بابەتی پێنج خشتەکی کەمە. ئەوەی لە ناوەوەیە غەزەلێکی حافزی شیرازی کردووە بەپێنج خشتەکی، واتە هەر دێرێکی حافز کە بەفارسییە سێ نیوە دێر شیعری کوردی خستۆتە سەر نیوە دێری یەکەمی هەموو غەزەلەکەی حافز، هەروەها شیعرێکی مستەفا بەگی کوردیشی کردووە بەپێنج خشتەکی.

٦- مولەممەع: شێخ ڕەزا بەناوی ئەوەی هەر چوار زمانی کوردی و تورکی و فارسی و عەرەبی زانیوە، کۆمەڵێک دێرە شیعر و ڕستە و تەعبیری بەم زمانانە خستۆتە ناو شیعرە کوردییەکانییەوە، هەندێ جار دێری تەواوی بەم زمانانە هێناوە، هەندێ جاریش ڕستە و تەعبیری زمانەکانی کردووە بەناواخنی شیعرە کوردییەکەی، لەم حاڵەتەدا تەزمینیشی پێ دەوترێ.

***

هەناسەی شیعری شێخ ڕەزا بەگشتی درێژ نەبوو، چونکە بەشی زۆری بەرهەمی شیعری لەپڕ بۆی هاتبوون و وەرامی هەڵوێست و مەسەلەیێکی لەناکاو بوون، لەبەرئەوە زۆربەی ئەو شیعرانە دەچنە ناو شیعری لیریکییەوە، هەروەها لەبەر بچووکی قەوارەیان گەلێکیان ونبوون. پێویستە ئەوەمان لەیاد بێ، ژووری شێخ ڕەزا لە تەکیەی کەرکوکیان کە پێش نیشتەجێبوونی لە بەغدا تێیدا ژیا بوو و شیعری لەسەر دیواری ژوورەکە هەڵکەندرا بوو، بەسپیکردنەوەی دیوارەی ژوورەکە شیعرەکان لەناوچوون، ئەمە کارەساتێکی گەورەبوو لە ئەدەبی کوردیدا.

دروستی کردووە بۆ کاکەییان کە ئێمە ئەیانناسین. لێرەدا سەرخۆشێک یا حەشیشەخۆرێک دەتوانی لە گێتی ڕاستی و حەقیقەتدا دیمەنێکی وا ببینێ. سەرەڕای ئەوەش شێخ ڕەزا جنێوی وا بەکەسە پیرۆزەکانی کاکەییان دەدا وەک دایە ڕێزوار و سەید براکە و بابا یادگار بەپێی دەستووری کۆمەڵایەتی لە هیچ مەڵبەندێکی ژیانی سەر ڕووی ئەم زەوییە کارێکی بەجێ نییە، بەڵام ئەگەر هونەروەرێک بەخەیاڵ وێنەیێکی وا بکێشێ زۆر کەس بەداهێنانی هونەری بۆی لە قەڵەم دەدەن.

پێویستە ئەوە بزانرێ خەڵکی کاکەیی لە داشۆرینەکانی شێخ ڕەزا بێ دەنگ نەبوون. لە ناو ئەوانەدا هاوچەرخی شێخ ڕەزا شاعیری ناودار خەلیل منەوەر چەند پارچە شیعرێکی هەیە لە داشۆرینی شێخ ڕەزا وەک وەرامدانەوەیێک بۆ داشۆرینەکانی بەرامبەر بەکاکەییان. ئەم زانیارییانە لەو بەشەی بۆ خەلیل منەوەر تەرخان کراوە لەم کتێبەدا دەکەونە بەرچاو.

– ٨ –

شێخ ڕەزا لە شیعرێکیدا بەرۆکی مووچەخۆرێکی عوسمانی گرتووە کە کارگێڕی دارایی شاری کەرکووک بووە، بەڵام خەڵکی هەولێر بووە:

مالّ مودیری کە خەڵقی هەولێرە
هەر وەکو مووییی خایە بێ خێرە
سوورەت و سیرەتی لە پیاو ناچێ
ئەو قورمساغە مێیە یا نێرە
من بەمەخفی کە چووم و تێی فکریم
بەزمی غەوغایە مەقعەدی کێرە
دیم حوسێن کردی قەتلی فەتاح
وەکو یوونس کە دەس بەشمشێرە
حەرەمی موحتەرەمی لەعلی خان
خەرمەنی عیسمەتی گەرایی کێرە
ڕاوی ڕێوی هەموو لە بۆ کەوڵە
گورگ لە بۆ بەرخە دێتە ناو بێرە
بەحری ئاوەدانی مەزرەعەیی فەرجی
جووتە گون جۆگەیە، کێریش ئاودێرە



وتم ئەی بێ حەیا تۆ ناترسی
لە خودای ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە
وتی یا شێخ ئەمان مەکە مەنعی
ئەهلی قوونیان بەقوونی ئەو فێرە
نییە باکم گەر ئەو خەبیسە بلێ
ئەوە ئەشعاری (لامیع)ە کوێرە

ئەم شیعرە کورتە بۆ داشۆرینی کارگێڕی دارایی شاری کەرکووک دانراوە. شاعیر هەندێ کەس و ڕووداوی ئاخنیوەتە ناو شیعرەکەوە. حوسێن ناوێ دەیەوێ فەتاح ناوێک بکوژێ. یوونس دەست بەشمشێر وەستاوە. لەعلی خانی حەرەمی کارگێڕی دارایی ناولنگی کردۆتەوە بۆ هەموو کەسێک، هەموو خەڵکی گوندی قوونیانی دەشتی هەولێر بەقوونی ماڵ مودیری فێرن. شێخ ڕەزا ئەم هەموو ڕووداوە تراجیدی و کۆمیدییانەی لەم شیعرەدا کۆ کردۆتەوە.

– ٩ –

لە شیعرێکیدا شێخ ڕەزا بەم جۆرە شێخێکی تەریقەت دەشۆرێنێ:

شێخ کە هام سوحبەتی شامار و نەدیمی حەمە بێ
شێخ کە دۆستی مچە ڕێژاوی و ئەحمەد جەمە بێ
شێخ لەبەر جەلبی دڵ و ئایشە کوڕانیی ژنەکەی
شیر بکێشێت و لە ڕووی والیدە دەستەوقەمە بێ
شێخ کە قودسییەتی پیرانی تەریقەت لە کنی
هەموو ئەفسانە و ئەفسوون، هەموو گاڵتە و گەمە بێ
شێخ کە گەووادی وەکو خادیمی سوججادە لە لای
سەییدی حوڕ لە سولالەی عەلی و فاتیمە بێ
شێخ کە قەسری حەرەمی گەیییە مەقاماتی عولا
سەر بڵند کات و بلێ، شێخ ئەمە و قەسر ئەمە بێ
شێخ ئەوا گوێ هونەری بردەوە، کەشکەک سەڵەوات
شێخ ئەوا جێی پدەری گرتەوە، دەستی بەمە بێ

هەموو هەڵسوکەوتی ئەم شیعرە ئەوە دەگەیەنێ شێخ ڕەزا بۆ داشۆرینی شێخ عەلی برای

وتبێ. شاعیر ناوی چەند بۆرەپیاو و ڕەش و ڕووتی دەوروبەری تەکیە دێنێ، ئینجا پێچەوانەی ئەمانە خادیمی سوججادەی بەناوبانگ دێنێتە ڕیزی ئەم گومناوانەوە. لە دواییدا دەڵێ ئەو شێخە شایانی ئەوە نییە لە جێ باوکی دابنیشێ، واتە شێخ عەلی لە جێی شێخ عەبدولڕەحمانی خالیسی باوکیان دابنیشێ. شێخ ڕەزا کۆتایی شیعرەکەی بەقسەیێکی نەستەقی ناو خەڵک دێنێ «دەستی بەمە بێ» ئەمە بۆ یەکێکی گەمژەی بێ دەسەلاتی لێ نەهاتوو بەکار دەهێنرێ.

- ١٠ -

لە داشۆرینی شاری کەرکووک شێخ ڕەزا دەڵێ:

بەم حاڵە ئەگەر جارێکی تر بچمەوە کەرکووک
مەعلوومە بەمەردی نەڕواوە لەسەرم تووک
بۆچ بچمەوە کەرکووکی قورمساغ کە لەگەڵ من
ئەهلی هەموو ناسازە وەکی ئاوی حەماموک
پێم خۆشە لەبەر جەوری برا و لۆمەیی ئەقوام
سەد جار لە غەریبی بکەوم موفلیس و مەفلووک
ڕۆژێ بەموورادی منیش ئەلبەت دەگەڕێ خەرخ
ئەم میچە قەراری نییە، گاهێ جگە گەهـ بووک
شاهی کەنەبێ ڕادەبوێرین بەگەدایی
بۆ ئەهلی قەناعەت لە پلاو خۆشترە داندووک
شەش مانگە زیاتر کە لە پاش مەرگی پدەر من
مەغدوورم و مەزڵووم و جەفا دیدە و مەهتووک
تاساکینی کۆی مامە غەفوورم وەکو فەعفوور
کیسەم پڕە داییم لە زەڕ و لیرەیی مەسکووک
پابەندی خەلاییق نییە تەبعم وەکو خەڵکی
بێ کولفەتم و ڕەندم و سەییاحم و سالووک
من خواجەیی ئەحرارم و ئامێزشی دونیا
هێشتاکە نەمی کردووەتە بەندەیی مەملووک
وەک (لامیع)ی شاعیر نییە ئێستێ لە جیهاندا
شیرین سوخەن و قانیع و خۆش تەبع و (ڕەزا) سووک



لەم داشۆرینەدا شێخ ڕەزا مەبەسی لە کەرکووک وەک شار نییە، بەڵکو ئەو کەرکووکییانەی ئازاریان پێ گەیاندووە، لە شیعرەکەدا بۆ حاڵی پەرێشانی خۆی دەلاوێنێتەوە بەتایبەتی لەدوای مردنی باوکی و داگیرکردنی سامانی بنەماڵە لە لایەن شێخ عەلی برایەوە. هەروەها ئەوە دەردەبڕێ و دەڵێ لەو سەردەمەی لە کۆیە بووە لە سایەی مامە غەفوورییەوە نەحەسابووەوە بەلام ژیانی ئاسوودە و باشتر بووە لەو ڕۆژگارەی پاش مردنی باوکی کە لە کەرکووک دەژیا.

لە قافیەی شیعرەکە ئەوە دەردەکەوێ شاعیر وشەکانی «حەمامۆک» و «داندۆک»ی گۆڕیوە، لەبەر کێش و ئاوازی قافیەی شیعرەکە کردوویانیەتییە «حەمامووک» و «داندووک»، بۆ ئەوەی لەگەڵ دەنگی قافیەی شیعرەکە بگونجێن.

- ١١ -

لە بابەت داشۆرینی شاری سنەوە شێخ ڕەزا دەڵێ:

سوپەری ئەهلی سنە بۆ شەڕی بێگانە تنە
خۆ بەخۆ شەڕ دەکەن و ئەسلەحەیان هەر بەتنە
ڕقی هەڵسا سنەیی دێ لە سلێمانی ئەدا
ئافەرین ئەهلی سنە ئەم ڕقەتان هەر لە کنە
ئەهلی ئێمە کە چووە شاری سنە، حوکمە، ئەکا
بەدوو شاهی و قەرەپوولێ ژنی کامیان مەزنە

شێخ ڕەزا یادی قۆشمەیی دوو شاری خوشک سلێمانی و سنە دەکاتەوە. هەندێ وشەی ناوچەیی لە دیالێکتی ئەردەلانی بەکار دێنێ، لە پێناوی بەهێزکردنی شیعرەکە لە ڕووی هونەرییەوە. ئەو سیفەتەی بۆ ژنانی هەموو ئەو شارانەی دایشۆربوون بەکاری هێناوە بۆ شاری سنەش بەکاری دێنێ کە ژنیان ئامادەن بێ دڵی خۆیان نەکەن لە هەموو کاتێکدا.

- ١٢ -

شێخ ڕەزا هەندێ جار شیعری داشۆرین بۆ مەبەسی ناگزووری کۆمەڵ بەکار دێنێ، لە شیعرێکیدا دەڵێ:

خەبەر چوو بۆ میرە سوورە
قوربان شێخ ساڵح مەغدوورە

خۆشی خۆشی پێ کەوت وتی
ئاگرەسوورە لە خۆم دوورە
کەسی فەقیری بێ چارە
گەر عەیبی هەبێ مەنشوورە
دەوڵەمەندی ساحیب پارە
سەد عەیبی هەبێ مەستوورە
ئەگەر ئاگر لە ماڵی چێ
دەڵێن ئاگر نییە نوورە
نە نوورەیلێ نە موورەیلێ
شاپلینەیلێ دەرقوونەیلێ
قسەی جوولەکەی مەشهوورە

شاعیر لێرەدا باس لە هەژار و دەوڵەمەندی کۆمەڵ دەکا. ڕاستی نەماوە، خوم شێواوە، هەڵەی دەوڵەمەند ڕاستییە چونکە هەڵە ناکا، ڕاستی هەژار هەڵەیە چونکە ڕاستی لە لا نییە.

ئەم شیعرە لیریکییەی شێخ ڕەزا لە ڕووی ڕوخسارەوە هەوڵیداوە هەندێ نوێگەری لەم شیعرەدا بخاتە ڕوو. دە نیوە دێری یەکەمی شیعرەکە یەکێتی قافیەی تێدایە. دێر و نیوێکی دوایی واتە سێ نیوە دێر، ئەوانیش دوو نیوە دێریان قافیەیێکی هەیە و دوا نیوە دێر شیعر لەسەر قافیەی گشتی شیعرەکەیە. جگە لەوە شیعرەکە هەمووی لەسەر بنج و بناوانی سێزدە نیوە دێر شیعر ڕێکخراوە کە دەکاتە دوازدە دێر و نیو. ئەمە دیاردەیێکی نوێیە لە شیعری کوردیدا.

- ١٣ -

شێخ ڕەزا کۆمەڵێک چوارین و تاکی هەیە وەک برووسکە بەرامبەر بەکەسێک یا ڕووداوێک دەری دەبڕێ، لەوانە:

بابکەم هەجوی حیماری ڕەگی جەرگی ببڕم
هەر وەکو چاوی نەشۆرا و کوزی دایکی بدڕم
شەهوەتم هاتۆتە جونبوش وەکو دەریایی عومان
لازمە ماچەکەرێ میسلی حیماری بکرم



حیماری ناوی هەمزە حیماری بووە، یەکێک بووە لە سەردەمی ژیانی شێخ ڕەزا لە کۆیە ئەویش وەک شاعیرێک کەوتۆتە شەڕەجنێو، وا دەردەکەوێ هەمزە حیماری لایەنی کەیفی گرتووە لە دژی شێخ ڕەزا.

لە تاکێکی دیکەشیدا شێخ ڕەزا هەر لە بارەی ئەم شاعیرەوە دەڵێ:

ئاوازی تڕی، بۆنی تسی هەمزە حیماری
ئافاقی هەموو گرتووە وەک هەوری بەهاری

ئەمە وەرامی قسەیێک یا هەڵوێستێکی دیارکراوی هەمزە حیماری نییە بەرامبەر بەشێخ ڕەزا، بەڵکو تووڕەبوونێکە لە شێخ ڕەزاوە بەم جۆرە کەوتۆتە داشۆرینی. ئەم قسەیەی شاعیر دەشێ بەهەموو کەسێک بوترێ خەتای هەبێ یا نا.

***

لە چوارینێکی دیکەیدا دەڵێ:

تۆ خۆت مەیلی جنێوبازی دەکەی شێخ ساڵح
بۆ دەکەی سەرزەنشی من کە ڕەزا هەجاوە؟
غایەتی بەندە جنێوم بەدوو سێ کەس داوە
تۆ هەتا ئێستا بەقوربان، بەهەزارت داوە

ئەمە داشۆرینێکە شاعیر بۆ شێخ ساڵحی داناوە، وەستایانە بەڵگەی ڕەوانبێژی بەکار دێنێ و دەڵێ ئەگەر من جنێوم بەدوو سێ کەس دابێ، تۆ جنێوت بەهەزار کەس داوە، دیارە مەبەسی جنێو نییە بەڵکو گانی بەهەزار کەس داوە.

***

کەسێکی بەدبەخت چۆن وێراویەتی بەرامبەر بەشێخ ڕەزا بوەستێ و داوای شاعیری بکا:

تۆیچ لێمان بووگی بەشاعیر ئەی حەرامزادەی سنە
بۆ چە شانێ ناخەفێنی، مەسرەفی چەس ئەو تنە
عیززەت ئاهەنگی لەکوێ بوو ئەی کوڕی وەستا شەفێ
وردە ئاهەنگێ کە فەرمووت ها وەلا وەستا ژنە

لەم چوارینەدا شێخ ڕەزا ڕستە و تەعبیری دیالێکتی میللی ئەردەلانی بەکار دێنێ بۆ داشۆرینی ئەو کەسەی داوای شاعیری کردووە، مەبەسی بنچینەیی شاعیر ئەوە بووە

لێکسیکۆنی ئەو دیالێکتە بەکار بێنێ بۆ ئەوەی هەوایێکی کۆمیدی پێکەنیناوی بدا بەشیعرەکەی.

***

شاعیر مەبەسی ئەوە بووە دەنگی «ز» بکا بەقافیە، ئەم دەنگە بۆی هەیە ناوی دەنگیش دروست بکا وەکو «ویزەویز»، «ڤیزەڤیز»، «گیزەگیز» بەم ڕەنگە شێخ ڕەزا مەلا عەزیزێکی دۆزیوەتەوە:

هەر کەسێ ناوی مەلا عەزیزە
داییم بن گونی هەر گیزەگیزە
بەخۆی گەوواد و ژنەکەی حیزە
خواردنی گووە و شەربەتی میزە

شاعیر ئەو مەلا عەزیزە دیاری ناکا، چونکە مەبەسی هەموو عەزیز ناوێکە بۆ ئەوەی سەرنجی خوێنەر ڕابکێشێ بۆ ئەو ڕەوانبێژییەی لە ئاواز و ڕیتمی دەنگی «ز»ێوە دروست دەبێ.

***

شێخ ڕەزا شاری کەرکووکی خۆشویستووە وەکو شارانی دیکەی کە ئاشنایەتی لەگەڵیاندا بوو، بەڵام بۆ کەرکووک تەنیا بەوە نەوەستاوە وەک ناوەڕۆک دایشۆرێنێ، بەڵکو وەک ڕوخساریش مانای «کافەکان»ی بەم جۆرە لێک دەداتەوە:

کافی کلک و کافی کوون و کافی کەر تێکەڵ کرا
ئیسم و ناو و شۆرەتی کەرکووکی لێ تێکەڵ کرا

لەم دێرەدا هەرسێ «کاف»ی کەرکووک کۆ دەکاتەوە کە لە شتی ناشیرینی وەک «کلک» و «کوون» و «کەر»دا هەیە و ناوی کەرکووکی لێ پەیدا بووە. شاعیر لەم تاکەدا زیاتر سەرکەوتنی ڕەوانبێژی مەبەسە بەوەی لەم دێرە شیعرەدا چواردە جار دەنگی «ک» بەکارهاتووە کەچی خۆی لە پازدە وشە پێکهاتووە.

***

زانیاری کەوتۆتە ناوەوە ئەوە دەگەیەنێ شێخ ڕەزا شیعرێکی لە داشۆرینی مەحوی داناوە لە یەکێ لە دەسنووسەکانی نەجمەدین مەلا دۆزراوەتەوە، بەڵام ئەوەی ئاشکرا نییە ئەوەیە شیعرەکە هەمووی دەست نەکەوتووە، تەنیا دێرێکی نەبێ، وا هەست دەکرێ شیعرەکە بەئانقەست دیزەبەدەرخۆ نەکرابێ لە پێناوی ئەوەی ناوی مەحوی پێ نەزڕێ، ئەو دێرەی لە



شیعرەکە ماوەتەوە ئەمەیە:

کووپە هەیئەت، ڕوو قەرە، سینەک سیفەت دینارپەرست
ئەسکەمل مل، مەشرەب ئۆغلان کاری پاپازی دەکا

لەم داشۆرینەیدا شێخ ڕەزا هەندێ زاراوەی کاغەزی قومار بەکار دێنێ بۆ وەسفی مەحوی، لە بابەت ڕەوشتییەوە بەهەتیوباز ناوی دەبا و بەپاپازی دیانانی دەچوێنێ. شاعیر دوو وشەی تورکی لەم شیعرەدا بەکارهێناوە «قەرە» و «ئۆغلان» یەکەمیان (ڕەش) و دووەمیان (کوڕ، هەتیو، منداڵی حیز) دەگەیەنن.

***

شاعیرێکی دیکەی کورد زێوەر ئەویش لە داوی هێرشە داشۆرینەکانی شێخ ڕەزا ڕزگاری نەبووە، وا باوە ئەو شیعرەی شاعیر حەوت دێر بووە، ئەویش تەنیا دێرێکی ماوەتەوە:

لە بۆ مەغبووری و لێڵی دوو سێ تێلام لە زێوەر دا
وەکو شەخسێ کەچەند کێری لەسەر چەشمەی قوزێ وەردا

دیارە ئەم شیعرە بۆ داشۆرینی زێوەر دانراوە، بەڵام دەکرێ بەشێوەیێکی دیکە بنووسرێتەوە، ئەو کاتە لە زێوەر دوور دەکەوێتەوە و دەبێتە تابلۆیێکی هونەری و مانای بەرز و جوان دەدا بەدەستەوە:

لە بۆ مەغبووری و لێڵی دوو سێ تێلام لە زێ وەردا
وەکو شەخسێ کەچەند کێری لەسەر چەشمەی قوزێ وەردا

لێرەدا شاعیر دوو وێنە لەگەڵ یەکتریدا بەراوورد دەکا، دەکرێ مەبەسی شاعیر هەردوو مانا بێ، ئەمە و شیعرەکە بەداشۆرینی زێوەریش لێک بدرێتەوە.

***

شێخ ڕەزا ژیرانە لە تابلۆییێکی کاریکاتۆریدا دەڵێ:

داخیلی فەرجە لەسەر قنگ کێر بەگون دەعوا دەکا
نانی کون ماسی دەخوات و پاسی جرتاوا دەکا

کونەماسی و جرتاوا ناوی دوو ئاواییین، دوور نییە نیوە دێری دووەمی ئەم تاکە قسەی نەستەق یا پەندی پێشینانێکی کوردی بێ شێخ ڕەزا بەکاری هێناوە، یا لە دوای وتنی ئەو بووبێ بەقسەی نەستەق. ناوی ئاواییە کەمەکە «کونە ماسی»یە، لەبەر کێشی شیعرەکە شێخ ڕەزا کردوویەتی بە«کون ماسی».

لە تاکێکی یەکجار بەناوبانگیدا شێخ ڕەزا دەڵێ:

چونکە شاعیر زۆر بووە لەم عەسرەدا
بۆتە حەشری نێرەکەر لەم حوجرەدا

لەم شیعرەدا شێخ ڕەزا لە حەقیقەتی شیعر دەدوێ، شیعر زادەی بیری داهێنەرانەی شاعیرە، بەحسێب دەبێ شیعری ڕەسەن کەم بێ، بەڵام شاعیر لە ڕۆژگاری ژیانی شێخ ڕەزادا زۆر بووە، مانای ئەوەیە شیعری باش کەم بووە. زۆری شاعیر لە هەموو سەردەمێکدا تەنیا لە کۆمەڵی کوردەواریدا نییە، لە هەموو کۆمەڵێکدا بەزۆری لە دواکەوتووەکاندا، زۆربەی مێردمندالآن مەشقی شیعر وتن دەکەن، بەڵام چەندیان دەبن بەشاعیری ڕاستەقینە! ئەم شیعرەی لە هەموو هەڵوێستێکی ناشاعیری و دوور لە داهێنان بەبەڵگە دەهێنرێتەوە.

***

شێخ ڕەزا بەم جۆرە وەسفی شاری سلێمانی دەکا:

هەر مەتاعێ کە تەڵەب کەی لە سلێمانیدا
هەیە ئیللا کوزی بیکر و کونی ناموستەعمەل

ناکرێ هیچ کەسێکی خەڵکی سلێمانی یا هیچ کوردێک لەم شیعرەی شێخ ڕەزا تووڕە بێ، چونکە ناڕاستییێکە قسەی جوانی خستۆتە ناو قاڵبی داهێنانەوە.

***

لە کامە قۆناغی مێژوو و کۆمەڵی میللەتان هەموو شتێک بەدڵی شاعیر و هونەروەران بووە! شێخ ڕەزا ڕوو دەکاتە خەڵکی سەردەمی خۆی و لە بابەت ئەولادی ئەو کاتەوە پێیان دەڵێ:

تڕی ئەولادی ئەم عەسرە بەکێرم
کە من مردم مەگەر گو بکا بەخێرم

ئەولادی هەر دەور و زەمانێک ئەگەر کەڵکیان نەبێ ناتوانن بەشتی بەکەڵک خێر بۆ دایک و باوکیان بکەن پیسایی نەبێ، ئەویش بۆ هەموو شتێک بشێ بۆ خێر ناشێ.

***

لە بابەت ڕیایی شێخی تەریقەتەوە شێخ ڕەزا دەڵێ:



لازمە بۆ شێخ سبەینان گورگەخەو
تا بڵێن شێخ عابیدە نانوێ بەشەو

مەبەسی شاعیر ئەوەیە، شێخ وا پیشان بدا بەدرێژایی شەو خەریکی عیبادەتە، کەچی ئەمە ڕاست نییە، بەڵکو بەشەو دەخەوێ و بەیانیانیش زوو هەڵناستێ. بەڵام بۆ خەڵکی وا ڕوونی دەکەنەوە بەدرێژایی شەو عیبادەت دەکا، بۆیە بەیانیان پێویستی بەگورگەخەوێک هەیە.

***

شێخ ڕەزا بەم جۆرە وەسفی خەڵکی کۆیە دەکا:

هەر کەسێ ئەسڵ و میزاجی فیتنەیی و بەدگۆییە
دەستی حیزیشی هەبێ ئەمجا بەتەحقیق کۆییە

شاعیر بۆ کۆیە مەسەلەی زۆر فراوان کردووە، مەبەسی ئەوەیە، هەر کەسێک لە هەر کوێیێک بێ ئەو ڕەوشتەی هەبێ کۆییە، واتە هەموو کۆیە ئەو ڕەوشتەیان هەیە، بەڵام نە کۆیی و نە هیچ کوردێک بەم شیعرەی شێخ ڕەزا گرژ نابێ.

***

لە تاکێکی دیکەیدا دەڵێ:

گیر نەبوو دەستم لەبەر لووسی بەسمتی خڕتەوە
زۆر نەما بوو گەردنم بشکێ بەگون خۆم گرتەوە

ئەم شیعرە هێڵکارییێکی کاریکاتۆری بەشێخ ڕەزا پێشکێشی هونەروەری دەکا بۆ ئەوەی وێنەی بکێشێ.

***

لە شیعرێکی دیکەیدا بۆ ئەو مەبەسەی پێشوو، ئەم تاکە دەڵێ:

گەر لە ناموست ئەترسی های وەتەنگی تننەوە
وەختی بۆ تەکیە ئەچی دەس بگرە پشتی قنگتەوە

لێرەدا شاعیر پەرستگاییێکی وەکو تەکیە ناپارێزێ و دەیکا بەمەڵبەندی هەتیوبازی. بێ گومان مەبەسی ناڕەسەنی تیۆرییەکانی سۆفیزم نییە، بەڵکو هەندێ لەو شێخانەی کە پێویستە ڕەوشتیان بەپێچەوانەی ئەوە بێ کە هەیانە، بۆیە خەڵکەکە هان دەدا ئاگاداری خۆیان بن کە ڕوو دەکەنە تەکیە.

له شیعرێکی دیکەیدا شاعیر یاری ڕەوانبێژی بەوشە و ڕستەی شیعرەکە دەکا:

ماڵی مفتی لەمبەرە مەعلوومە قازیش لەوبەرە
من فەقیرم، کێ دەزانێ لەمبەرم یا لەوبەرم

مەبەسی شێخ ڕەزا ئەوە نییە ماڵی خۆی دیار بکا لە کامە بەرە، بەڵکو بێ دەسەڵاتێکە نازانێ سواری مفتی ببێ یا قازی!.

***

شێخ ڕەزا لە پەنای یەک دوو مووچەخۆری دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی، جنێو بەهەموو کردەوەییێکی ئەو دەسەڵاتە دەدا:

قازی ڕەئیسی ئەووەڵ تۆش موددەعی عومـوومی
ئەم کارە چۆن سەر ئەگرێ لەعنەت لە بابی ڕۆمی

مەبەسی شێخ ڕەزا ئەوە نییە بڵێ دەسەڵاتی عوسمانی قازی و موددەعی عموومی خراپی دەستنیشان کردووە، بەڵکو هەموو کارێکی خراپی ناو کۆمەڵ لە ئەنجامی خراپەی ئەو دەسەڵاتەوەیە.

***

شێخ ڕەزا واز لەو شارانە ناهێنێ کە تیایاندا ژیاوە، کۆیە و بەغدا و سلێمانی و کەرکووک. لە بابەت کەرکووکەوە دەڵێ:

مەکەن باوەڕ بەقەولی داکی خۆگێکانی کەرکووکی
ئەگەر خەڵتێ بکەن وابزانە گا قۆڕانی کەر کۆکی

نرخی شیعر لای شێخ ڕەزا لە جوانکاریدایە، هەڵوێست تراجیدی بێ یا کۆمیدی گرنگ نییە، لە هەردووکیاندا مەبەس هەر یەکێکە، چونکە جوانکارییەکە لە قۆڕانی مانگا و کۆکینی کەر بەرچاو دەکەوێ.

***

شێخ ڕەزا تووشی ڕەشبینی بووە لە کردەوەی خراپ، وا دەزانێ ساغ لە ناو کۆمەڵدا بەدەگمەن دەست دەکەوێ:

ساغ لە دنیادا نەماوە گەر قسەی ساغت دەوێ
بێ هەزارت پێ نیشان دەم گەر قورمساغت دەوێ



شاعیر باس لە وەزعی ناهەمواری کۆمەڵ دەکا، مەبەسی ئەوە نییە کە پیاوی چاک لە کۆمەڵدا نییە، بەڵکو دەڵێ پیاوی خراپ زۆرە.

***

عومەر ناوێک خراپەی لەگەڵ شێخ ڕەزادا کردووە، ئەوەندە ڕق و کینی لەو عومەرە بوو عومەرە گەورەکەی کوڕی خەتابیشی داگرتووە، تەنیا لەبەر ئەوەی ئەویش ناوی عومەر بووە:

عومەرم دی، عومەری پێشووتریش گەر وابێ
گەردنی شیعە دوو سەد دەفعە لەسەب ئازا بێ

شاعیر ڕقی لە هەموو ناو عومەرێک بۆتەوە، تا گەیشتۆتە خەلیفەی دووەمی ڕاشیدین، گەردنی شیعەی ئازاد کردووە لەو قسە ناشیرینانەی بەو پیاوە گەورەیەی کۆمەڵی ئیسلام دەڵێن.

***

شێخ ڕەزا بەم جۆرە مفتی زەهاوی و پیرۆز خانی ژنی دادەشۆرێنێ:

حەیزی کوزی حیز و دزی فەیرووزە گوواوی
مەعجوونی خەنە و وەسمەیە بۆ ڕیشی زەهاوی

وەک دیارە ئەم داشۆرینە گەیشتۆتە پلەیێک لە ڕووی قسەی ناشیرین و داهێنانی جوانکارییەوە لە دوای ئەودا پلەیێکی دیکە نییە، کەچی لە پێش ئەوە بەرەو ڕووی ستایشێکی شێخ ڕەزا بووینەوە لە پێدا هەڵدانی زەهاوی وتووە، لەوێشدا مێشکی زەهاوی گەیاندۆتە لوتکە و هیچ مێشێک نییە خۆی لە قەرەی ئەو بدا.

**مولەممەع**

شیعری مولەممەع لە دیوانی شێخ ڕەزادا بەرچاو دەکەوێ، لە شیعری کوردی خۆیدا شاعیر زمانەکانی تورکی و فارسی و عەرەبی بەکارهێناوە. لەم ماوەیەدا ئاماژە بەپارچەیێکی دەکرێ، بەچوار زمان وتوویەتی:

گزر دوائر أقلامی ارقه سنده دوات
مدار أهل قلمدر مدیر تحریرات
نگفتمت کە حذرکن تبغ ناطقەام
فإنَّ ناطقتی آفةٌ من الآفات

لەبەر عەباکە جەبەم کردی ئەی فەقیری خودا
ئەوە عەباکەتە کێرم بەقنگی خۆت و عەبات

ئەم پارچەیە سێ دێرە شیعرە، واتە شەش نیوە دێر شیعر. نیوە دێرەکانی یەکەم و دووەم بەزمانی تورکین، نیوە دێری سێیەم فارسییە، نیوە دێری چوارەم عەرەبییە، نیوە دێری پێنجەم و شەشەم کوردین. لە دوای وەرگێڕانی نیوە دێرە ناکوردییەکان پارچە شیعرەکە بەم جۆرە خۆی دەنوێنێ:

قوتووی مەرەکەبی (مەرکەبوانی) لە دەوری جغزەکانی قەڵەم دەسووڕێتەوە
با شکاتبێ موتەسەڕیف سورگەی خاوەن قەڵەمە
پێم نەوتی وریا بە! لە تیغی زمانم بترسە
زمانی من بەڵاییکە لە بەڵایان
لەبەر عەباکە جەبەم کردی ئەی فەقیری خودا
ئەوە عەباکەتە کێرم بەقنگی خۆت و عەبات

مەبەسی شێخ ڕەزا لە قوتووی قەڵەم یا قەڵەمدان قوونی مودیری تەحریراتە، هەروەها مەبەسی لە قەڵەم کێرە.

## پێنج خشتەکی

هونەری پێنج خشتەکی لە دیوانی شێخ ڕەزادا بەرچاو دەکەوێ، بەڵام بایەخێکی زۆری پێ نەداوە و ژمارەیان کەمە.

- ١ -

دیارە مستەفا بەگی کوردی لەو شاعیرە دەگمەنە کوردییانەیە کە شێخ ڕەزا ڕای لێ بووە و وەک شاعیرێکی گەورە ناسیویەتی، لەبەر ئەوە یەکێ لە غەزەلەکانی کردووە بەپێنج خشتەکی:

دڵی بردم بەناز و عیشوە دیسان شۆخی عەییارێ
فریبی دام بەسیحری چاوی خۆی مەحبووبی سەحارێ
لە هیجرانا تەقم کرد ئەی ڕەفیقان کوا مەدەد کارێ
(ئەمان مردم عیلاجێ سا لە ڕێی پێغەمبەرا چارێ
ویساڵ، یا قەتل و تەسکین، لە هەرسێ بۆم بکەن کارێ)
بەدەوری نێرگسی مەستی کەسێ نەیماوە مەیلی مەی
لە بۆ شەهدی لەبی لەعلی دەناڵێنێ دڵم وەک نەی
لە تابی ئاتەشی عەشقی بکەم داد و فیغان تا کەی
(ئەوەندە سووتاوم ئەسڵا تابی فەریادم نەما سا دەی
ڕەفیقان نیوە سووتن ئێوە، نامەرد عەرزە هاوارێ)
لە ڕێگەی عەشقدا نایانە پێم زنجیری مەجنوونی
لە دەستم چوو ڕومووزی دانش و فەهمی فلاتوونی
وەکو شەخسێ کە زاری کا لە جەوری دوژمنی خوێنی
(لە کونجی سینە دەنگی ئای و ئۆی دڵ دێ بەمەحزوونی
وێران بێ نەمدی ساتێ لێی نەیێ ناڵەی بریندارێ)
کە چاوی ساحیری دەستی بە بەغەمزە و ناز و ئیما کرد
مەتاعی عەقڵ و هۆش و دەرکەمی تاراج و یەغما کرد
کەسێ نەیگوت درێغا کێ ئەتۆی وا شێت و شەیدا کرد
(ئەلای هەر کەس دەچم مەنعم دەکا خۆت بۆچی ڕسوا کرد
درێغ کوا حاڵ زانێ ڕەببی تووشم بێنی بیمارێ)
گوتم وەک سوورمەیە بۆ چاوی عاشق خاکەکەی ژێر پێت
لە ئولکەی حوسندا گەر لافی شاهی لێ بدەی لێت دێت
گوتی مەیخانە بێ داییم بەیادی چاوی مەستم جێت
(سەبا یارانی مەجلیس گەر هەواڵی من بپرسن لێت
بڵێ کێشاویەتییە مەیخانە چاوی بێچووە عەییارێ)
سەری جەنگی هەیە داییم لەگەڵ من چەرخی دون پەروەر
نە بەختم یار، نە چەرخم یاوەر و، نە تالعم ڕەهبەر
ئەوەندە بێ ڕەحم و ساحێب کینەیە دەرحەق بەمن دلبەر
(لە نەزعا پێی دەڵێم قوربان جەفا بەسیە، دەڵێ کافر
ئەرێ چیت دیگە تۆ سەگ مەرگ کارم ماوە پێت جارێ)
نەماوە ڕەونەقی بازاڕی عەقڵ و دانش و وردی
بەپوولێ نایکڕم لەم عەسرەدا عیلمی ئەبی وەردی

له ئەشـعـاری (ڕەزا) پەیدایە ئاساری جەوانمەردی
(دوڕ و یاقووت دەبارێ لەم کەلامە شیرنەی (کوردی)
خودا سا کوا لە دنیادا قەدر زانێ، خریدارێ)

بێ گومان ئەم پێنج خشتەکییە دەنکە مرواریێکە لەو ملوانکە نایابەی بەجوانترین بەردی بەنرخ نەخشێنراوە. ئەو ملوانکەیە گەردنی ئەدەبی کوردی ڕازاندۆتەوە. ئەو پێنج خشتەکییانەی کەوتوونەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە هەموویان لە پلەیێکی بەرزی هونەریدا نین، چونکە پێویستە ئەو دوو شاعیرەی پێنج خشتەکی دروست دەکەن پلەی شاعیرییان وەکو یەک بێ یا لە یەکترییەوە نزیک بن.

ئەم پێنج خشتەکییە بەرهەمی خەیاڵ و چێژ و ئیلهامی دوو شاعیری گەورەیە، مستەفا بەگی کوردی و شێخ ڕەزا، ئەمانە هەردووکیان ئەگەر پلەی شاعیرییان وەکو یەکیش نەبێ لە یەکترییەوە نزیکن.

- ٢ -

شێخ ڕەزا غەزەلێکی حافزی شیرازی کردووە بەپێنج خشتەکی بەزمانی کوردی. سێ نیوە دێرە زیادەکەی شێخ ڕەزا بەناوەڕۆک داشۆرینی مەلا مەعرووفی کاتبی مەحکەمەی بیدایەتە:

مەعرووفی بێ دیرایەت گووت کردە ناو بیدایەت
چیت پێ بڵێم قورمساغ هەردوو گونم بەدایەت
گونمی بەتڕ شەهید کرد کێرم ئەکا ریعایەت
(زان یار دلنوازم شکر یست با شکایت
گر نکتەدان عشقی خوش بشنو این حکایت)
مەعرووف کە حیزی وەک خۆی نەبوو لە نەسڵی ئادەم
ئازاری مەقعەدی بوو، بۆم ڕاکشا لەسەر دەم
مردم ئەوەندە سوار بم، خۆم کوشت ئەوەندە پیا دەم
(بی مزد بود و منت هر خدمتی کە کردم
یا رب مباد کس را مخدوم بی عنایت)
خاشاکی دەوری دوبری لێم بوون بەماری هەیجا
کێرم بەسەد مەشەقەت ڕۆیی گونم نەگونجا



لێرم لە پەشمی پاشی دانەی گونی ترنجا
(در زلف پر شکنجش ای دل مپیچ کانجا
سرها بریدە بینی بی جرم و بی حنایت)
ڕووم کردە سەمتی سمتی، یەعنی مەکانی مەعهوود
ئەرزێکی پڕ نەجاسەت دەشتێکی شەهوەت ئالوود
ڕانیم فەرەس چەپ و ڕاست ڕێگەم نەبردە مەقسوود
(ازهر طرف کە راندم جز وحشتم نیفزود
زینهار از این بیابان وین راه بی نهایت)
دەرمانە سمتی ئەمما نەرمانە وەک بەری دەست
کاروانی کێر بەناویا دەڕوا هەمیشە سەربەست
هەر مەنزڵێکی سەد میل هەر میلە سێ سەد و شەست
(این راهرا نهایت صورت کجا توان بست
کش صد هزار منزل بیش است از بدایت)
باوکی پیاوی چاک بوو دایکیشی زۆر موقەددەس
خۆی پوشت و داکی خۆگێ هەتا خودا بڵێ بەس
بۆ نەختی ئاوی شەهوەت جەرگی بووە بەقەقنەس
(رندان تشنە لب را آبی نمی دهد کس
گویا ولی شناسان رفتند ازین ولایت)

ئەم پێنج خشتەکییەی شێخ ڕەزا بەزمانی کوردی لەسەر غەزەلێکی فارسی حافزی شیرازییە، بەمەبەسی داشۆرینی مەلا مەعرووف کوڕی مەلا عەبدوڵڵای خدری زەنگنە هۆنراوەتەوە. ئەمە کاتبی دادگای بیدایەت بووە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانییان.

مەلا مەعرووف لە شێخ عەلی تاڵەبانی برا گەورەی شێخ ڕەزا نزیک بووە. زۆربەی ئەو کەسانەی جنێوی شێخ ڕەزایان بەرکەوتووە دۆست و هاوڕێی شێخ عەلی برا گەورەی شێخ ڕەزا و شێخ غەفووری مامی بوون، بۆیە کەوتوونەتە بەر زمانی شاعیر، ئەگەر نا ئەو کەسانە هیچ جۆرە ناخۆشییێکیان لەگەڵ شێخ ڕەزادا نەبووە، بۆیە کە شیعری داشۆرین و ستایشی (هەجوو و مەدح)ی بۆ مفتی زەهاوی هۆنیوەتەوە هەر لەو کاتەدا کە ئەم غەزەلەی حافزی شیرازی کردووە بەپێنج خشتەکی بۆ داشۆرینی مەعرووفی کاتبی بیدایەت، لە دواییدا شیعری ستایشی بۆ نووسیوە لەسەر کێش و قافیەی شیعرە داشۆرینەکە:

مـەعـرووفی پڕ دیرایەت گـوڵی باغی هیـدایەت
چیت پێ بڵێم چاوەکەم، ڕەحمەت لە باب و دایەت

بەڕاستی باسکردنی ئەم پێنج خشتەکییە لەم ماوەیەدا لەبەر دوو مەبەس بوو، یەکێکیان وەک بابەتێک لە هونەرە گرنگەکانی شیعر لە بەرهەمی شێخ ڕەزادا، ئەویتریان وەک نموونەیێک لە داشۆرینەکانی شاعیر.

ئەگەر ئەم پێنج خشتەکییە بەزمانی کوردی نەبووایە، لەو کاتەی غەزەلەکەی حافزی شیرازی بەزمانی فارسییە و هیچ پێوەندییێکی بەناوەڕۆکی ئەم کتێبەوە نییە، بەهیچ جۆرێ ئەم بیروڕایانە لێرەدا تۆمار نەدەکران، لەبەر ئەوە دێرە فارسییەکانی ئەم پێنج خشتەکییە وەرناگێڕێنە سەر زمانی کوردی چونکە مەبەس تەنیا ئەو دێرە کوردییانەیە کە شێخ ڕەزا خستووینەتییە سەر دێرە فارسییەکانی حافزی شیرازی.

### شێخ ڕەزا و هەڵهێنەکەی غەزەلی حافز

لە دیوانی شێخ ڕەزادا شیعرێک هەیە بەفارسی دانراوە و ناوی پێنج خشتەکی لێ نراوە. لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا ئەوە باوە گۆیا شاعیر لەو شیعرەدا موعەممایێکی حافزی شیرازی هەڵهێناوە، شیعرەکە پێوەندی بەئیمامی عەلی و حەسەن و حوسێنی کوڕەکانییەوە هەیە. بەڵام ئەوی ڕاستی بێ مەسەلەکە بەم جۆرەیە:

لە کاتی خۆیدا ویسالی شیرازی (١٧٧٩ - ١٨٤٥) شیعرێکی بەزمانی فارسی هۆنیوەتەوە، لە دە دێر پێکهاتووە، وەستایانە دێرە شیعرە موعەمماکەی حافزی شیرازی تێیدا کردۆتەوە و هەڵیهێناوە. شێخ ڕەزا هاتووە هەشت دێری لە شیعرەکە وەرگرتووە، واتە هەشت پێنج خشتەکی دروست کردووە، سێ نیوە دێری یەکەم شێخ ڕەزا دایناوە، دوو نیوە دێری هەموو پێنج خشتەکییەکان لە غەزەلەکەی ویساڵ وەرگیراون، واتە ناوی پێنج خشتەکییەکە پێویستە بەم جۆرە بێ «پێنج خشتەکی شێخ ڕەزا لەسەر غەزەلێکی ویسالی شیرازی».

کردنەوەی موعەمماکە هەمووی لە ناو غەزەلەکەی ویسالی شیرازی دایە، بەڵام لەبەر ئەوەی شیعرەکە وەک پێنجینێک بەهی شێخ ڕەزا ناسراوە و دوو دێری پشتگوێ خراوە و نەکراوە بەپێنج خشتەکی و ناوی ویسالیشی تێدا ون بووە، کردنەوەی موعەمماکە و دۆزینەوەی ڕەمزەکانی حافز خراونەتە پاڵ شێخ ڕەزای ئێمەوە.

بەڕاستی مەسەلەییێکە سەر تێیدا سوڕ دەمێنێ، ئێمە نازانین لەبەر چی تەنیا هەشت



دێری ئەو شیعرە کراوە بەپێنج خشتەکی لەو کاتەی خۆی دە دێرە. هەروەها ئاڵوگۆڕی وشە و ڕستە کراوە، لە هەندێ جێگە شێوێنراوە. ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەین ئەمە لە کردەوەی شێخ ڕەزا ناکا، چونکە شێخ قسەی جوانی ئەوەندە زۆرە پێویستی بەوە نییە داهێنانێکی ویسالی شیرازی بکا بەهی خۆی. بەهەموو جۆرێک ساغکردنەوەی ئەم مەسەلەیە، یا مەسەلەکە بەگشتی ناکەوێتە سەرشانی ئێمە، چونکە ئێمە خەریکی بەرهەمە کوردییەکانی شێخ ڕەزاین. ئەم پێنج خشتەکییە هیچ پێوەندییێکی بەئەدەبی کوردییەوە نییە لەبەر ئەوەی زمانی هەردوو شاعیر لەم پێنج خشتەکییەدا فارسییە.

***

شێخ ڕەزا یەکێکە لە گەورە شاعیرانی سەرانسەری قۆناغەکانی ئەدەبی کوردی. قوتابخانەی شیعری کوردی لە باشووری کوردستان بەبەرهەمی ئەو پەرەی سەندووە و نوێ بۆتەوە و دەوڵەمەند بووە. لە هەموو مەبەس و هونەر و ناوەڕۆک و ڕوخساری ئەدەبی کلاسیکی سەرکەوتوو بووە. شێخ ڕەزا شیعری داشۆرین و کراوەی (ئیرۆتیک) بەشێوەییێکی هونەری بەرز هێناوەتە ناو شیعری باشووری کوردستانەوە.

شێخ ڕەزا یەکێک بوو لەو شاعیرانەی لە شتی بچووک، لە جنێوی بازاڕی، لە قسەی بێ مانا بەرهەمی هونەری گەورەی دروست دەکرد. گەلێ لایەنەکانی گیانی و مەتریالیی کۆمەڵی کوردەواری لە شیعری شێخ ڕەزادا دەدۆزرێتەوە.

ئەو شاعیرە مەزنە یەکێک بووە لەو شاعیرانەی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا سنووری شیعری کۆن و تازەیان لە ئەدەبی کوردیدا دیار کردووە.

# بەشی چواردەم

## وەفایی

**١٨٤٤ - ١٩٠٢**

### ژیانی

شاعیری ئەم ماوەیە ناوی عەبدولڕەحیم کوڕی مەلا غەفوور کوڕی مەلا نەسڕوڵڵایە، لە ناو خەڵکی بەمیرزا عەبدولڕەحیم ناوبانگی دەرکردووە. نازناوی شیعری وەفایی بووە. عەبدولڕەحیم لە شاری سابڵاغ (مەهاباد) لە ساڵی ١٨٤٤ لە دایکبووە. خوێندنی سەرەتایی و بەرنامەی حوجرەی مزگەوتی لە زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی لە مەهاباد تەواو کردووە و هەر لەوێش ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، بەڵام لە ناو خەڵکی بەمەلا نەناسراوە و تەنیا میرزایان پێ وتووە. هیچ بەڵگەیێک بەدەستەوە نییە مەلایەتی کردبێ، بەڵام قوتابخانەی تایبەتی خۆی هەبووە و وانەی بەمنداڵان وتووە و پێی ژیاوە. وەفایی فیزی زل بووە، زەکات و سەرفترەی وەرنەگرتووە، ڕاتبەی فەقێیانی قوبووڵ نەکردووە.

شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری شیعری وەفایی بەدڵ بووە، لەو ڕێگەیەوە ناسیویەتی، خۆشی ویستووە لەبەر ئەوە لێی نزیک بۆتەوە. ماوەیێکی درێژ لای ژیاوە، شیعری بۆ خوێندۆتەوە، سکرتێرییەتی نووسینی بۆ کردووە و کاروباری خوێندەواری بۆ بەڕێوە بردووە.

وەک لە ژیانی شاعیر دەردەکەوێ چوونە حەج لە لای جۆرە هەوەسێک بووە لەوانەیە بەهۆی هەڵوێستی بەرامبەر ئایین و حەزکردن بەگەشت ئەم هەوەسەی لا دروست بووبێ. لە دوا گەشتیدا بۆ سلێمانی لە ساڵی ١٩٠٠ وا دەردەکەوێ ماوەیێک تێیدا ژیاوە و لە ساڵی ١٩٠٢ حەجی سێیەمی کردووە. قسەی واش هەیە لە ساڵی ١٨٩٨ لەگەڵ شێخ سەعیدی حەفید چووە بۆ ئەستەموول و لەوێوە لەگەڵی ڕووی کردۆتە وڵاتی حیجاز. هەر چۆنێ بێ وەفایی لەگەڵ کاروانی شێخ سەعیدی حەفید و سەید ئەحمەدی خانەقا و شێخ مستەفای شێخ عەبدولسەمەدی قازی و حاجی تۆفیقی پیرەمێرد چووە بۆ حەج، ئەگەر هەمووشیان لەو کاروانەدا نەبووبن لە ڕێگەی گەڕانەوە ئەو کەسانە پێکەوە گەڕاونەتەوە.

لە سارای عەرەبستان لە سەردەمی گەڕانەوەی ئەو حاجیانە وەفایی تووشی نەخۆشی



زەحیری دەبێ، مەرگ ماوەی نادا و ئەنجام لەو وڵاتە دوورەدا کۆچی دوایی دەکا و لە ناو لمی بادیەی عیراق یا بیابانی شام لە لایەن هەواڵەکانییەوە لە ساڵی ١٩٠٢ دوور لە نیشتمان بەخاک دەسپێررێ. پیرەمێرد دەڵێ: بەدەستی خۆم لە بیابان وەفاییم ناشتووە.

وەفایی سەردەمی منداڵی و مێردمنداڵی لە مەڵبەندی خۆی مەهاباد بردۆتە سەر. لەم ماوەیەدا خەریکی وەرگرتنی زانستی و زانیاری بووە. لە دوای ئەوە لە جێگەیێک ئۆقرەی نەگرتووە لە هەکاری وڵاتی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری و شاری سلێمانی ژیاوە. چوونە حەجیشی لەو سەردەمانەدا کاتی زۆری ژیانی شاعیری بۆ خۆی بردووە.

## شیعری وەفایی

### ڕوخساری شیعری وەفایی

ئەم زانیارییانەی خوارەوە گرنگترین خاسیەتەکانی شیعری وەفایی ڕوون دەکەنەوە لە بابەت ڕوخسارەوە:

١- کێشی شیعری وەفایی لەسەر بەحرەکانی عەرووز دەڕۆن. ئەگەر ژمارەی کێشەکان لەگەڵ ئەوانەی شاعیرانی دیکەی کلاسیکی کوردی بەکاریان هێناون بەراووردیان بکەین دەبینین لای وەفایی بەژمارە زۆرن وەکو: هەزەج، ڕەمەل، ڕەجەز، موزاریع، بەسیت، موجتەس، سەریع و موتەقاریب.

لە ڕووی قافیەشەوە بێ گومان وەکو شیعری شاعیرانی دیکە لەسەر بنچینەی یەکێتی قافیە دامەزراون. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ شیعر لە دیوانی وەفاییدا بەرچاو دەکەون لەسەر کێشی خۆماڵی (سیلابی) هۆنراونەتەوە.

٢- بەشی هەرە زۆری شیعری وەفایی لە غەزەل و قەسیدە پێکهاتووە، ئەمانەش بەپێی زۆری و کەمی ژمارەیان دیار دەکرێن، جگە لە غەزەل و قەسیدە. بابەت و ژانرەکانی دیکەی شیعری کوردی لە لای وەفایی دەبینرێن، وەک لەمەودوا ڕوون دەکرێنەوە.

٣- پێنجین: وەفایی یەکێکە لەو شاعیرە کلاسیکییانەی پێش جەنگی یەکەمی گێتی لە ژیاندا بوون بایەخیان بەم بابەتە شیعرە داوە، لە ناو دیوانیدا ژمارەیێکی زۆر لە پێنجین دەبینرێن. لە بنجدا پارچەی غەزەل (لیریک) بریتییە لە کۆمەڵێک کۆپلە (بەند) هەریەکەیان لە پێنج نیوە دێر شیعر پێک دێ، چوار نیوە دێری هەر پێنجینێک لەسەر یەک قافیە دەبێ و دێری پێنجەمی هەموو پێنجینەکان لەسەر قافیەیێکی دیکە دەبێ (ا ا ا ا ب...). لە دیوانی وەفاییدا ئەم جۆرە پێنجینانەی لای خوارەوە بەرچاو دەکەون:

(أ)– شاعیر پێنجینێک بەزمانی کوردی دادەنێ، بەڵام شێوەی مولەممەع دەداتە پێنجینەکەی بەوەی هەموو نیوە دێرە شیعری گشت پێنجینەکان بەفارسی دەهۆنێتەوە.

پێنجینی یەکەمی ئەمەی لای خوارەوەیە:

غەمزە و نیگەه و ڕوو لە خەمی زولفی دوو تادا
وەک نەشئە لە مەی، زوهرە لە نێو شامی سیادا
تۆی جیلوە دەکەی یا نا مەلایک لە سەمادا
خەندەی گوڵە وا عەتری لە شەبنم لە سەبادا
(یا خود ز شکر خندە عرق کردە لبانت)
«یا بەهۆی زەردەخەنەی شیرینتەوە لێوت عارەقی کردووە»

لە پێنجینی دواییدا شاعیر دەڵێ:

بۆ قەتلی (وەفایی) کە بەدڵ لەو گوڵی خەندان
فەرموویە برۆ نێرگسی سەرمەست بەموژگان
قوربانی نیگاهی بوو بەغەمزێکی دڵ و جان
نەمدیوە دوو نیشانە بەتیرێکی لە ئینسان
(قربان شوم ای ترک باین تیر و کمانت)
«ئەی جوان قوربانی ئەو تیر و کەوانەت دەبم»

(ب)– لە پێنجینێکی دیکەی شەش بەندی، لە هەموو بەندەکاندا نیوە دێری پێنجەم دووبارە و سێ بارە دەبێتەوە.

بەندی یەکەمی بەم جۆرەیە:

گوڵێکم بوو لە دونیادا شکۆفەی باغی ڕەعنایی
لە داغی پەرچەمی شێوام لە نێو بازاڕی ڕیسوایی
وەکو بولبول بەڕووح و دڵ شەو و ڕۆژ بوومە سەودایی
هەموو عومری عەزیزم چوو لە ڕێی خەندەیێک بەخۆڕایی
بەجارێ ماڵی وێرانم ئەویشم چوو ئەمیشم چوو

بەندی دوایی بەم شێوەیە هاتووە:

خوداوەندا! خوداوەندا! پەشیمانم پەشیمانم
بەکاری ئاخیرەت نایێم عەجەب ئاڵوودە دامانم



بەباری مەعسییەت شەرمندەم و چاو پڕ لە گریانم
نە دینم بوو، نە دونیا گەر نەکێشی خەت بەدیوانم
بەجارێ ماڵی وێرانم ئەویشم چوو ئەمیشم چوو

ئەوەی لەم پارچە پێنجینەدا دەبینرێ ئەوەیە نیوە دێری دوایی لە هەموو پێنجینەکاندا دووبارە بۆتەوە.

(ج)– پێنجینێکی دیکەی وەفایی بریتییە لە پێنج بەند وەکو پێنجینی پێشوو هۆنراوەتەوە، نیوە دێری دوایی لە هەموو پێنجینەکاندا دووبارە دەبنەوە.

بەندی یەکەمی بەم جۆرەیە:

ڕۆژی تەرەب و کەیف و دەمی جووتە کوتانە
بەو دەستەیی جۆنیوە پەری بۆتە نیشانە
دەستی بەمە توند گرتووە گەرمی قەوەتانە
نێوکی نەکەوێ یا ڕەبی بەم بارە گرانە
جانی منە جوونی دەکەتێ عوزر و بەهانە

بەندی دوایی بەم شێوەیە:

هەر لەحزە لە خەندەی دەمی وەک حوقەیی یاقووت
شەککەر دەوەرێ، گوڵ دەڕژا، غونچە دەپشکووت
سەر تا بەقەدەم ڕووحی (وەفایی) لە غەمان سووت
ناڵەی دڵی زاری گەیییە عالەمی لاهووت
جانی منە جوونی دەکەتێ عوزر و بەهانە

(د)– هەموو پێنجینەکانی دیکەی دیوانی وەفایی ئاساییین لەو دەستوورانە نەچوونەتە دەرەوە کە بۆ پێنجین و پێنج خشتەکی دانراون.

٤– مولەممەع: وەفایی بۆ دانانی مولەممەع زمانانی فارسی و عەرەبی بەکار دێنێ لە شیعرە کوردییەکانیدا، کۆمەڵێک شیعری لەم بابەتەی هەیە، هەروەها هەندێ جار شیعری کوردی بەتەعبیری فارسی و عەرەبی ناواخن دەکا ئەمە تێکهەڵکێش (تەزمین)ی پێ دەڵێن نەوەکو مولەممەع.

## ناوەڕۆكی شیعری وەفایی

بەرهەمی شیعری وەفایی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە خەریکی ئەم مەبەسانەی لای خوارەوەیە:

١- شیعری دڵداری و وەسفی سروشت لە لای وەفایی چوونەتە ناو یەکەوە، بەزۆری سروشت وەک هەوێنێک بۆ دڵداری بەکار دێنێ.

٢- وەسف و دڵداری وەک دوو مەبەسی سەرەکی لە شیعری کلاسیکیدا لە لای وەفایی هەریەکەیان سەربەخۆیی خۆی پاراستووە. شاعیر لە وەسفی سروشتدا خەریکی هەموو کەژەکانی ساڵە بەڵام زیاتر دیمەنی بەهار و گوڵ و گوڵزاری لا دەبینرێ.

٣- پێداهەڵدان و شانازی لە شیعری وەفاییدا بەشی زۆری بەر شێخی خۆی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری کەوتووە. ناوی بە«غەوسی دووەم» دەبا، بەوەی غەوسی یەکەم شێخ عەبدولقادری گەیلانییە.

٤- وەفایی شیعری لاواندنەوە و ماتەمنامەی هەیە، ئەمەشی بەزۆری بۆ شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری هۆنیوەتەوە.

٥- ئاماژەکردن بۆ هەندێ دیاردەی کۆمەڵایەتی لە دیوانی وەفاییدا هەستی پێ دەکرێ.

٦- بڕێک دیمەنی قۆشمە و پێکەنین و خەیاڵ پڵاو لە بەرهەمی شاعیردا بەرچاو دەکەوێ.

## گوڵستانی شیعری وەفایی

### بەهارستانی نەورۆز

وەفایی لە شیعرێکی بەهاریدا گوڵی هەموو کوردستانی کۆکردۆتەوە، بێ گومان ئەم گوڵانە هەموویان لە جێگەیێک و لە کاتێک کۆ نابنەوە، بەڵام شاعیر بۆی هەیە ناڵۆجیک بکا بەماقووڵ و هاوین و زستان پێکەوە کۆ بکاتەوە، داهێنان لەو کۆکردنەوەیە پەیدا دەبێ.

وەفایی بەنەورۆز دەست پێ دەکا، چونکە لە کەژی بەهاردایە لە نیشتمانی شاعیر. قەسیدەکەی بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

نەسیمی بادی نەورۆزی شەمیمی عەبهەری هێنا
بەریدی عاشقان دیسا پەیامی دلبەری هێنا
نەوید ئەی عاشقانی دڵ نیگار یار هاتە سەر خەندە
سەدایی بولبولان دیسا درەختی گوڵ بەری هێنا



مەگەر ڕووی کەوتە زولف و ڕووی حەبیبم بادی نەورۆزی
حەیاتێکی بەدونیا داوە بۆی گوڵ عەنبەری هێنا

لە دوای ئەمە شاعیر دیمەنی شەڕ و جەنگ دادەمەزرێنێ، گوڵی بەهار دەوری گرنگیان لەو جەنگە خۆشەی بەهاردا دەبێ، ئەگەر بشێ لە جەنگدا هەست بەخۆشی بکرێ.

شاعیر لەسەر شیعرەکەی دەڕوا:

بەفەتحی دڵ دەڵێی یار زولف و سینە و ڕووی وەدەرناوە
لە نەسرین و گوڵ و سونبول بەهار هات لەشکەری هێنا
دەڵێی چاوی منە هەوری بەهاری دەم بەدەم دەگری
دەڵێی ئاهی منە بەرقی درەخشان ئاوری هێنا
هەوا چوو پڕ بەدامانی دەرودەشتان گوڵی کێشا
سەبا هات پڕ بەجێبی کۆهساران عەنبەری هێنا
لە نێو بەزمی وەنەوشە و جۆ و کەناران لالە پەیدا بوو
بەتاریکی خدر بۆ چەشمە شای ئەسکەندەری هێنا
کە ئیسلامی بەهار فتوای جیهادی کافری دەیدا
سنۆبەر نێزە، گوڵشەن گورز و سۆسەن خەنجەری هێنا

گوڵ تەنیا چەک و سیلاحی بۆ ئەم جەنگە بەهارییە نەهێنا، بەڵکو قوماشی بەنرخی ئاوریشمینی هێنا و ئەم مێرغوزارە ڕەنگینەی دروست کرد، هەر پارچە زەوییێک، ڕەنگێک دەنوێنێ و بۆنێک دەپژێنێ. لەم لایەنەوە دەڵێ:

نیسار ئەفشان بەپا ئەندازی سوڵتانی بەهار هاتن
سەمەن دیبا، شەقایق ئەتلەس و گوڵ مەخمەری هێنا
لە شایی دارەگوڵ مەسنەدنشین بوو هاتە پشکووتن
چەمەن تەختی زومورڕود تەڵلی یاقووت ئەفسەری هێنا
لە بەزمی نێرگس و نەسرین بەدەفعی چاوەزاری گوڵ
وەنەوشە دەستە دەستە عوود و لالە مەجمەری هێنا

ئەوجا وەفایی وەسفی کەرەستەی مەیخانە و ئاواز و مۆسیقا دەکا، گوڵ و گوڵاڵە لەم کۆڕی عاشقانەدا مەست و سەرخۆش دەبن، لەم بابەتەوە دەڵێ:

له مەیخانەی چەمەن بەزم و تەرەبیان گرت قەدەح نۆشان
شەقایق بادە، زەنبەق شیشە، نێرگس ساغەری هێنا
لە چەهچەی ساز و نەغمەی عەندەلیبان سووت هەموو دونیا
سەدایی تارزەن، ئاوازی خۆش خوان، ئاوری هێنا
حیکایاتی غەریبەی پێیە بولبول جوملە خۆ کردی
دەڵێی چاپاری ئێران ڕۆژنامەی ئەختەری هێنا
بەشەوقی ڕوویی لالە و گوڵ لە باغاندا چراغانە
دەڵێی باغی جەنەت ئەم ساڵ بەری حوور و پەری هێنا
لە گوڵشەندا رەیاحین مەست و شادابی هەوای خۆشن
دەڵێی ڕیزوانە بۆ ئەهلی بەهەشتی کەوسەری هێنا
شکۆفە و گوڵ بەعیشوە و خەندە ئارامی دەروونیان دا
بەهار بۆ خەستەکانی خۆی چ شیر و شەککەری هێنا
بەزەرد و سوورەوە خەملیوە بۆ دامادی بولبول هات
وەرەق موعجیز، ئەرز گوڵگوونە، شەونم زێوەری هێنا

شاعیر بەم دێرانە کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

هەموو کەس چاوەڕوانی لێک دەکەن وەک سورمەیان دیبێ
مەگەر بایی سەبا خاکی گوزاری دلبەری هێنا
چ دلبەر! ئافتابی ماهڕوویان و شەکەر لێوان
کە خەندێکی لە سەحرا گوڵ لە دەریا گەوهەری هێنا
بەبێ شاباش سەر بەقسەی (وەفایی) گوڵ چرا نابێ
کە بولبول هەر زمانی هانی پەروانەش سەری هێنا

لە بەزم و ڕەزمی ئەم گێتییە جوانەدا هەموو کەس چاو لە یەکتری دەکەن، وەک بڵێی شنەبای شەماڵ خاکی بەرپێی دلبەری هێناوە، ئەو جوانانەی لێو شەکەرین و ڕوو مانگن، خەندەیان گوڵ لە مێرغوزار دێنی و گەوهەر لە زەریا دەست دەخا.

## وەسفی ئەندامە جوانەکانی یار

بەگشتی وەسفی ئەندامە جوانەکانی یار لە شیعری وەفایی گەلێ زۆرە. دلبەر کە بزە بڵاو دەکاتەوە، غونچەیە و پشکووتووە، زولفی کە لەسەر گەردن لادەچێ بەیانی دەدا و



سپییەتی گەردن دەردەکەوێ. چاو و برۆ و برژانگ وەک لەشکرێکن بۆ کوشتنی وەفایی خۆیان ئامادە کردووە، حەبەش و چین و هیند کینایەتی ڕەنگەکانی ئەو ئەندامانەن کە شاعیر ناوی هێناون.

وەفایی شیعرێکی تەرخان کردووە بۆ وەسفی ئەو ئەندامانە بەڵام بایەخی زۆری بەزولف داوە، لەم لایەنەوە گەلێ جار وشەی «زولف»ی لە شیعرەکەدا بەکارهێناوە. شیعرەکەی بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

لەژێر زولفی سیا ڕووی خستە دەر چاوی لە دنیا کرد
شەوی دی سوبحدەم گۆیا دەری مەیخانەیان وا کرد
بەئاب و ڕەنگ و ڕوو حووری بەزولف و کاکۆڵی غیلمان
گوڵاویان دا لە مەیخانە، غوباریان عەنبەرئاسا کرد
بەڕەنگی چاوی خۆی ساقی لە بالەب جامی مەی گێڕا
بەتەرزی زولفی خۆی موتریب دەمادەم چەنگ و نەی چاکرد
خەرامان شاهی خووبان هات، هیلاکی دین و ئیمان هات
بەزولف و ڕوویی تابان هات، کە کوفر و دینی یەغما کرد
لە جیلوەی قامەتی بەرزی، لە عیشوەی زولفی سەد تەرزی
زەمین و ئاسمان لەرزی، سوجوودی ڕووی دڵارا کرد
شەکەرخەندە گوڵی زاری، دڵی هێنامە هوشیاری
مەگەر گوڵ قەندی لێ باری، کەوا بیماری ئیحیا کرد
هەزار تا زولفی وەک سازێک، بەناز بوو نەغمە پەروازێک
کە هەر سازە بەئاوازێک دوو دنیای پڕ لە غەوغا کرد
لە عەکسی شۆخ و شەنگێکە، جیهان گوڵ گوڵ بەچەنگێکە
هەر ئەوراقی لە ڕەنگێکە، بەیانی حوسنی یەکتا کرد
وەنەوشە و گوڵ لە باغان بوو، لە باغان شەوچراغان بوو
مەگەر داروی نەساغان بوو، بەڕوودا زولفی تاتا کرد

لەم شیعرەدا ئاشکرایە ئەو ئەندامانەی وەفایی باسیان لێوە دەکا و کار و کردەوەیان دەخاتە ڕوو مەبەسی دیارکردنی جوانییانە.

شیعرەکە بەم دێرانە کۆتایی پێ دێنێ:

له تاتا زولفی شەوگاری، درەخشا نووری ڕوخساری
له هەر حەلقێکی سەد تاری، هەزار خورشیدی پەیدا کرد
غورووری حوسنی خۆی وا بوو، دەمی پڕ خەندە کرد و چوو
کە بۆ خۆی ڕازی خۆی فەرموو (وەفایی) بۆچی ڕسوا کرد
هەوا بۆنێکی چینی پەرچەمی کەوت و وەکێوان کەوت
سەبا عەترێکی غونچەی زاری هێنا ڕووی لە سەحرا کرد
نیشانێکی لە ئەنواری جەمالی خۆی بەشەم بەخشی
سەراسەر جانی پەروانەی پڕاز سووتان و سەودا کرد
نەسیمێکی لە باغی حوسنی خۆی هێنا بەگوڵ دادا
سەراپا بولبولی زاری پڕاز ناڵە و تەمەننا کرد
کەمان ئەبرۆیی پەیوەستی، بەغەمزەی چاوەکەی مەستی
کە دای تیرێکی سەر دەستی، لە جیسم و جانی ئاوا کرد
مەگەر مۆژگانی نەشتەر بوو، حەکیمی چاوی دلبەر بوو
کە خوێنی دڵمی پێ دەر بوو، نەخۆشی خۆی مودارا کرد
گوتم ئەی شۆخی چاوبەستم، خەراب و عاشق و مەستم
بەڕەحمەت بگرە ها دەستم، خوماری ئاشکارا کرد
دڵی دا دڵ شکستی خۆی، هەڵستا هات بەدەستی خۆی
بەجامێکی ئەلەستی خۆی (وەفایی) شێت و شەیدا کرد

تێکەڵاوی مەبەسەکانی شیعری کلاسیکی وەکو دڵداری و وەسف و شانازیکردن لەو شیعرەی وەفایی بەڕوونی دەردەکەوێ.

### ڕەوانبێژییە وشەییەکانی وەفایی

لە شیعرێکیدا وەفایی وەسفی جوانی دلبەر دەکا، سێزدە جار وشەی گوڵی بەکارهێناوە، جارێکیش «گوڵستان»، جگە لەوە وشەی گوڵی کردووە بەپاش قافیە، واتە نۆ جار وەک پاش قافیە، چوار جاریش لە ناو ڕستەی شیعرەکان، لە شیعرەکەیدا وەفایی دەڵێ:

قەد گوڵ و ڕوو گوڵ و دەمانی گوڵە
ڕاستە ئەمڕۆ گوڵە خەرمانی گوڵە



تا بەتاری زولفی کە شێواوە بەڕوو
سونبولستانی گوڵستانی گوڵە
ڕۆژ بەدەرناکەوێ تا سوبحی عوزار
هەڵ نەیێ شەو لە گریانی گوڵە
بۆ دڵی شیفتە بۆچی بگریم
بەستەیی چاو و زەنەخدانی گوڵە
زولفی تورکانە لەسەر عاریزی یار
ئەوە چەتری سەری سوڵتانی گوڵە
ڕوو بەمیحرابی برۆ پەرچەمی خاو
کافری تازە موسوڵمانی گوڵە
عەتری خەندەی گوڵی باغانە کە دێ
یا هەناسەی دەمی خەندانی گوڵە
غولغولەی شۆڕی (وەفایی) کە دەڵێی
بولبولی گۆشەیی بوستانی گوڵە

وەک دیارە وەفایی گوڵی هەڵبژاردووە بۆ هەموو ئەو بەراووردکارییە، بێ گومان مەبەستیش تەنیا گوڵەکە نییە. ڕاستە سوورەکەی لە هەموو ڕەنگەکانی دیکە زیاتر لە داهێنانی شیعریدا ڕەنگی داوەتەوە، بەڵام شاعیر مەبەسی بنە گوڵە بەهەموو گەڵاّ و لق و پۆپە کەسکەکانییەوە. هەندێ جار ئەگەر مەبەس تەنیا گوڵەکە خۆی بێ کە بەزۆری ڕەنگێکی هەیە و هەندێ جاریش دوو ڕەنگ ئەمەیان بەدەگمەن بەتەنیا دەبێتە سەرچاوەی بەراووردکردن و لە یەکتری چواندن.

لە شیعرێکی دیکەیدا وەفایی لەسەر گەمە ڕەوانبێژییەکانی بەردەوامە. بۆ داڕشتنی قاڵبی جوانی دلبەر سروشت دەورێکی گرنگی هەیە. بەمەبەسی دەربڕینی ئاوازی وشە بیست و سێ جار وشەی «چراغ»ی بەکارهێناوە، جگە لە وشەکانی «چل چراغ» و «شەوچراغ»یشی خستۆتە ناو ڕستەکانی شیعرەکەوە:

شەو لە خەودا من چراغ بووم دڵ چراغ بوو جان چراغ
ئەی لەبەر عەیشی شەوی دی جان چراغ جانان چراغ
گەه فریشتە، گەه پەری، گەه حووری عین، گاهێ مەلەک
گەه قەمەر، گەه موشتەری، گەه ڕۆژ، گەهێ ڕەخشان چراغ

ڕەنگ بەڕەنگ زولفی درەوشان دەم بەدەم ڕووی خۆی نواند
چل چراغ یا شەوچراغ بوو یا بەسەد ڕەنگان چراغ
ڕووی لە تاتا زولفی دەرخست هاتە سەر ڕووی مەرحەمەت
نەوبەهار بوو شەو بەهار بوو وا کە داییسان چراغ
ڕوو لە حەلقەی تاری زولفان دەم لە فرقەی پێکەنین
وەک لە کن کانی حەیاتی شەو هەزار تابان چراغ
ڕەونەقی هەفت ئاسمان و زینەتی ڕوویی زەمین
هەر وەکو بۆ شانشین و مەنزڵی شاهان چراغ
تابی سونبول، تابشی گوڵ نیم نیگاهی چاو خومار
نەشئە بەخشا جان فزا وەک شەو لە مەیخانان چراغ
عەکسی ڕووی ئارایشی زولف و خەت و خاڵان دەدا
وەک بەگوڵ گوڵشەن چراغ بێ سونبول و ڕەیحان چراغ

لەو دێرانەدا شاعیر هەوڵ دەدا تەعریفی «چرا» بکا و سەرنجی خەڵکی ڕابکێشێ بۆ هەموو ئەو کارەی چرا دەیکا، یا چرای بۆ بەکار دەهێنرێ. چرا حەوت ئاسمان و زەوی و باڵەخانەی شاهان و مەیخانەکان ڕووناک دەکاتەوە.

شاعیر لەسەر شیعرەکەی دەڕوا و بەم جۆرە کۆتایی پێ دێنێ:

شەوقی دا من ڕووی دەمن کرد دیم شەوم پێ بۆتە ڕۆژ
من دەسووتام، من عەجەب مام من چراغ بووم یان چراغ
دڵ لە لایێ، تەن لە لایێ، وەک نەیستان ئاوری گرت
مەسجید و دێر و کلیسا ماوە پڕ تابان چراغ
دار و بەرد وەک من دەسووتا، دەرنەما، ئەیوان نەما
زاهیر و باتین چراغ بوو، دەرچراغ ئەیوان چراغ
زولفی تۆ و ڕوخساری تۆیە، یا شەوم ڕۆژی ویساڵ
ڕوویی تۆ و باڵایی تۆیە، یا لە سەروستان چراغ
من ئەوا مەست و نەزان بووم بۆچ لە داغی باغی ڕووت
گوڵ وەکو بولبول دەسووتا تەرزی پەروانان چراغ
ناگەهان دلبەر نیهان بوو، بوو بەڕۆژی ڕەستەخێز
کەف زەنان مەیخوارە، وێران مەیکەدە، گریان چراغ



شەعشەعەی خورشید نیهان بوو، لاڵ و کەڕ بوو نیلوفەر
مات و خامۆش ما (وەفایی) وەک سەحەر گاهان چراغ

لەم دێرانەدا وەفایی داهێنانی هونەری سۆفیزمیانەی جوانی هەیە، وێنە شیعرییەکانی دەچنە ناو ناخی گیانی گێتی سۆفیزمەوە، نەک وەسفی ڕووکەش و خستنە ڕووی مێژوو و بەکارهێنانی زاراوە زانستی و فەلسەفییەکانی سۆفیزم. شاعیر دان بەوە دەنێ کە دەسووتا، بەڵام سەیری پێ دێ کە ماوە و لە ناو نەچووە، شاعیر دەزانێ کە خۆی چرایە بەناوی ئامێرەکە و فانۆسەکە، هەروەها چرایە بەمانای ڕووناکی، واتە دڵ و لەش. بەم جۆرە چرا دەبێتە گیان و جەستە، مزگەوت و دێر، بەرد و دار، زاهیر و باتین، بەمانای هەموو گەردوون دەگرێتەوە. ڕووناکی و چرا و ئاگر دەبێتە ڕەمز یا وێنەی کردگار. بەشێکی هەرە گرنگی ئەم گەردوونە یا کردگارە، یا ڕوخساری یارە، ژیانی پێکەوەیی و هەمیشەییە دڵدار و دلبەر دروستی دەکەن.

### ئایین و تەریقەتی دەروێشی

دیوانی وەفایی شیعری ئایینی تایبەتی نییە بچێتە ناو مەبەسی موناجات (ئیلاهییات) بۆ خودا و نەعت بۆ پێغەمبەر، بەڵکو کۆمەڵێک شیعری تێکەڵاوی هەیە دەتوانین بەنموونەی ئەو مەبەسانەیان دابنێین، هەروەها ئەمەی تێکەڵ بەستایشی سەرانی تەریقەتی کردووە و بەگشتی دەتوانرێ ئەم شیعرانە بەبەرهەمی ئایین بژمێررێن. لە قەسیدەیێکی درێژیدا وەفایی بەشێخی تەریقەت دەڵێ:

خودا بۆ خۆی دەزانێ مەنبەعی نووری خودایی بووی
درێغا نەخلی ئەیمەن، مەزهەری نووری تەجەللاکەم
نەسیمی فەیزی تۆ دین و دڵی دووبارە ئیحیا کرد
درێغا وەک مەسیحا باعیسی ئیحیایی مەوتاکەم
دەلیلی تالیبان بووی، بۆ خودا وەک ڕۆژ هوەیدایە
درێغا مورشیدی دەوران و خورشیدی هوەیداکەم
لە سایەی تۆ گەلێ کەس بوونە عاریف، ڕێی خودایان گرت
درێغا عاریفی ڕێگەی خودا و ئەهلی تەقواکەم
موریدانی دەری تۆم دی بەچاوی خۆم لە ئینس و جان
درێغا بۆ ئیمامی ئینس و جان مەولایی ئەولاکەم

ئینجا شێخ دەکا بەڕەمزی هەموو ئەو سۆفییانەی بەربەرەکانێ کران و ئازار دران و لە دوای سێدارە سەرکیان لە دەروازەی بەغدا هەڵواسرا.

لەبەرچاوی نەزانان ساحیر و زەندیق و کافر بووی
درێغا پیری بەستام، قوتبی خەرقان، غەوسی بەغداکەم
بەداوی دانە بۆ گیرا بەدەریای عیلمی ئەسماوە
لەبەر چی هاتە خوار ئادەم لەسەر فیردەوسی ئەعلاکەم
پەنای بۆچ بردە بەر دار ئەو کە دەیزانی دەبێ شەق بێ
نە ئاخیر ساحیبی ئایات و موعجیز بۆ زەکەریاکەم
لە سیرری نووری چاوانی عەجەب بێ نوور حیکمەت بوو
بلێ بۆچ پیری کەنعانی دەگریا، نووری عەیناکەم
سلێمان خاتەمی ون بوو لە قودرەت ماوە نەیفەرموو
بەلا سەخرەی بەئاو دادام بەلا ئاسەف لە دەریاکەم
کەلیم ئێستا نەبووبوو چەند هەزار مەعسووم لەسەرووی چوو
دەبێ جوابی چ بێ ڕۆژی جەزا گوستاخی مووساکەم
لەبەر قەومی موونافیق بوو دەبێ هەڵبێ کە دەیزانی
مەقامی خۆی وەکو ڕۆژ ڕوونە ڕووحوڵڵایی عیساکەم
سەحابەی بۆ شکا، بۆچ شەهید بوو گەوهەری پاکی
محەممەد باعیسی بوون، شاهی تاج و تەختی لەولاکەم
شەهیدی دەستی کافر بوون کە ئەکسەر ئەولیایی دین
جوابی موددەعی چ بدەم سکووت بێ حەددی ئینشاکەم
نە ئاو موختارە بڕوێنێ، نا ئاور تا بسووتێنێ
نە خاک چی پێیە بنوێنێ، ئەگەر سەد جاری بەرباکەم
عەدەم باری سەبەبکارە، وجودێکی هەقە دیارە
بۆ خۆی فەعال و موختارە خوداوەندی تەواناکەم
بەمینهاجی خەلیلی هەق، بەمیعراجی رەسوولوڵڵا
دەبێ هەر بێتە جێ ئەمر و ئیرادەی هەق تەعالاکەم

لەو شیعرەدا وەفایی یادی چەند پێغەمبەرێکی تەورات و ئینجیل و قورئانی کردۆتەوە، وەک ئادەم و یەعقووب و سلێمان و مووسا و عیسا و محەمەد. تێکەڵ کردنی ڕەمزەکانی شەریعەت (پێغەمبەران) و ڕەمزەکانی تەریقەت (شێخ و موریدان) و تەماشاکردنیان بەیەک چاو ئەنجامی لایەنی پراکتیکی سۆفیزمە کە لە «دەروێشیزم»دا خۆی دەنوێنێ، وەک دێرەکانی کۆتایی ئەم شیعرە دەردەکەوێ:

وەفایی بێ کەس و داماوە پابەندی تەلیسمێکە
مەدەد یا ڕووحی غەوسی ئەعزەم و شاهی بوخاراکەم
بەحەققی نووری موتڵەق، حەددی ئەمجەد، شاهی لەولاتان
ئیمامی یەسریب و قیبلەی مەلاییک، ماهی بەتحاکەم
بەحەققی چار یار و ئال و ئەولادی نەبیوڵڵا
بەئەنسارِ و موهاجیر قایدانی قیبلە گومڕاکەم
بەڕووحی خواجەگانی نەقشبەند و قیبلەگاهی خۆم
غەریب و جان سپاری کەعبە قوطبی دین و دنیاکەم
بەقووەی جازیبەی دڵتان (وەفایی) دەست و دامانە
چ نابێ گەر لە سایەی ئێوە قەتعی ماسیوالڵاکەم

لەم شیعرەدا وەفایی ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئەوانەی ئەندامی ڕێکخراوی تەریقەتەکانی دەروێشیزم لە لایەن نەیارانەوە بەربەرەکانێ دەکرێن تا دەگاتە ئەوەی لە سێدارەیان دەدەن و پێستیان دەگروون. بەڕاستی ئەم نەیارانە ئەهلی شەریعەتن، خەبات و چوونە مەیدانەکە لە پێشانا لە نێوان شەریعەت و تەریقەت بووە، لە پاشانا شەریعەت دەستی بەسەر تەریقەتدا داگرتووە و بۆ ئامانج و چاکەی خۆی بەکاری هێناوە.

ئینجا لەو شیعرانەدا ئەوە دەردەکەوێ وەفایی گوێی نەداوەتە ئەو دوژمنایەتییەی لە نێوان تەریقەتەکانی کوردستانی ئەو سەردەمە لە ناوەوە بوو وەک قادری و نەقشبەندی. شاعیر بەهەناسەیێکی سۆفیزمیانەی تیۆری موجەررەد تەماشای مەسەلەکەی کردووە، وەک چۆن تەریقەتەکان لە ڕۆژگارانی پەیدابوونیان ماوەی ژیانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و شاهی نەقشبەند لە ناوەوە بوون، نەک وەکو ئەو سەردەمانەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم چەندوچوون لە نێوان شێخ مارفی نۆدێ و شێخ خالیدی شارەزووری لە ناوەوە بوو.

لە پارچە شیعرێکی دیکەیدا وەفایی باس لە تەریقەتی قادری دەکا، سەید تەهای نەهری بەگەورەترین جێگری شێخ عەبدولقادری گەیلانی دەزانێ، لە شیعرەکەیدا دەڵێ:

سەد هەزار دڵ پێکەنی وەک گوڵ بەدەم بادی بەهەشت
یا هەناسەی جان فزای گوڵزاری غەوسی سانییە
جانشینی حەزرەتی غەوسولخەلایق قوتبی هەق
فەرعی تاها ئەسڵی یاسین نەوبەری گەیلانییە
ڕەوشەنی چاوی قولووبی عاریفە عەکسی دڵی
کێوی توور، مەزهەری نوورە، کلی سوبحانییە
پێی لە سەرشانی هەموو وەلییانە جەددی خۆی دەڵێ
جێی لەسەر چاوانە شاه و شانشینی سانییە

ئەم شیعرە بریتییە لە وەسفی تەریقەتی دەروێشی قادری و بەکارهێنانی هەندێ زاراوەی سۆفیزم، داهێنانی ئیستێتیکی تێدا نییە، بەراووردکردنی لەگەڵ مووسا پێغەمبەر و وتەکانی کێوی تووری سینا (حۆریب) شتێکی تازە نییە.

لەم لایەنەوە وەفایی قەسیدەیێکی درێژی شیعری هۆنیوەتەوە بۆ ستایشی سەید تاهای نەهری ناوبراو کە باوکی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییە، شاعیر نازناوی غەوسی سانی داوەتێ. وەفایی شیعرەکەی بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

سووتام بەنازی فیرقەتێ، ساقی کەرەم کە شەربەتێ
وەکو قەقنەس ئاورم کەتێ، یا غەوسی سانی هیممەتێ
ڕیشەی دڵم بەس پارەکە، موتریب دەستی بۆ تارەکە
بەیادی زولفی یارەکە، یا غەوسی سانی هیممەتێ
تۆ مەزهەری نووری خودای، تۆ مەنبەعی سیدق و سەفای
سەرداری کوللی ئەولیای، یا غەوسی سانی هیممەتێ

ئەوجا شاعیر لە پەژمردەیی حاڵی خۆی دەدوێ:

سەرگەشتەی چۆڵ و غوربەتم، شایانی ڕوحم و ڕەحمەتم
هەر چاوەڕێی یەک هیممەتم، یا غەوسی سانی هیممەتێ
نەفس و شەیتان دامەن کەشان، بۆ سەرکەشی ڕووی مەهوەشان
دەمانکێشن بەباوەشان، یا غەوسی سانی هیممەتێ
خاکی سەگانی دەرگەهم، خوا هندەی بێ جێگا و ڕەهم
چاو لە دەستی شاهەنشەهم، یا غەوسی سانی هیممەتێ



لە پاشانا شاعیر باس لە ونبوونی خۆی دەکا لە گێتی سۆفیزمی نادیاردا و دەڵێ:

دوو حەرفی ئەمرە کاف و نوون، زەحمەت نییە ڕۆژەوەبوون
ئەسبابی داناوە بێچوون، یا غەوسی سانی هیممەتێ
موتریب تۆ و تاری ڕووحانی، ساقی تۆ و جامی سوبحانی
تۆ و بەربەتێ، تۆ و شەربەتێ، یا غەوسی سانی هیممەتێ
وێڵی ولاتی بێ هۆشی، گێژی گێژاوی سەرخۆشی
ماسی سەراوی ئاتەشی، یا غەوسی سانی هیممەتێ

بەم شیعرانە وەفایی کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

بەدری سەنا بەرقی نەبوو، غەربی نەبوو شەرقی نەبوو
هەرچی هەبوو بەرقی نەبوو، یا غەوسی سانی هیممەتێ
شەوقی سەمای زەڕڕاتی ڕۆژ، بوو بەگوڵی باغاتی ڕۆژ
ڕۆژ هاتی من نەهاتی ڕۆژ، یا غەوسی سانی هیممەتێ
فەرمووی لە نێو بیرە خەوێ من قەلبی سووتاوم دەوێ
(وەفایی) با نەنوێ شەوێ، یا غەوسی سانی هیممەتێ

ئەگەر بنوارینە ئەم قەسیدەیە لە ڕووی کێشی عەرووزی و یەکێتی قافیەوە دەبینین لەسەر بەحری ڕەجەزی تەواو (مستفعلن – مستفعلن...) دانراوە. هەر دێرە شیعرێک لە هەشت جار (مستفعلن) پێکهاتووە، دوو (مستفعلن)ی دوایی نیوە دێری دووەم بریتییە لە ڕستەی «یا غەوسی سانی هیممەتێ»، لە هەموو دێرەکاندا دووبارە دەبێتەوە.

ئەگەر لە لایێکی دیکەوە تەماشای ئەم قەسیدە عەرووزییە ئیسلامەوییە بکرێ لە ڕووی ڕوخسارەوە دەکرێ بەشیعرێکی لیریکی خۆماڵی حسێب بکرێ و بەم پێیە دەتوانرێ دێرەکانی بەئەندازیاری شیعری خۆماڵی بنووسرێتەوە. بەم پێیە دەتوانرێ دێری یەکەمی شیعرەکە و هەموو دێرەکانی دیکە بەم جۆرە تۆمار بکرێ:

دێری یەکەم بەم جۆرە:

سووتام بەناری فیرقەتێ
ساقی کەرەم کە شەربەتێ
وەکو قەقنەس ئاورم کەتێ
یا غەوسی سانی هیممەتێ

دێری دوایی شیعرەکە بەم شێوەیەیە:

فەرمووی لە ناو بیرە خەوێ
من قەلبی سووتاوم دەوێ
(وەفایی) با نەنوێ شەوێ
یا غەوسی سانی هیممەتێ

ئەم کۆپلانە و هەموو دێرە شیعرەکانی قەسیدەکە بەپێی ئەم جۆرە تۆمارکردنە، هەر دێرە شیعری بریتییە لە هەشت سیلاب، دێری دوایی لە هەموو کۆپلەکاندا دووبارە دەبێتەوە. ئەوەی شایانی باسە ئەم کێشە لە شیعری میللی کوردی سەرزار (فۆلکلۆر) و شیعری نوێی چینی ڕۆشنبیری کورد و شیعری کلاسیکی کۆنی باکووری کوردستان فرە باوە و لە کێشە سووکەکانە، لەبەر ئەوە شیعری لەم چەشنە کێشە بەزۆری بۆ مەقام و بەستە و گۆرانی بەکار دەهێنرێ. شاعیرانی کلاسیکیی کوردستانی باکوور لەم جۆرە کێشەیان هەیە بەتایبەتی لای فەقێ تەیران یەکجار زۆرە.

## تارمایی ناوەرۆکی ئەمۆژگاری و کۆمەڵایەتی

وەفایی لە سەرانسەری بەرهەمی شیعری لە دیوانیدا پەنجەی بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و گیروگرفتەکانی درێژ نەکردووە. بەڵام لەو مەبەسانەی لە شیعریدا باسی لێیانەوە کردووە هەندێ تارمایی تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی و گرێی سایکۆلۆجی و پەند و ئامۆژگاری دەبینرێ، ئەویش وەک ڕوونکردنەوەیێکی مەبەسەکانی دڵداری و وەسف. بەم جۆرە مەسەلەی کۆمەڵایەتی لای شاعیر سەرەکی نییە. بایی ئەوەندە هەیە هەندێ لەو وێنە شیعرییانە بخرێنە ڕوو.

شاعیر لە شیعرێکیدا کە بۆ وەسفی بەهار و باڵندە بچووک و ژیکەڵە و جوان و گوڵپەرستەکان تەرخان کراوە دەڵێ:

بچۆ بۆ لای ڕوبای، بەسەر بەیادی بەقای
هەتا ئەتۆ بێ وەفای، بەخۆت مەکە ئیعتیبار
دەمێک نەفەس بکرەوە، وەدووی دڵی خۆت کەوە
بزانە ڕۆژە یا شەوە، خەوت نەیە هەستە کار
هەزار سەوم و سەڵات بێ، چاوت لە دووی زەکات بێ
خودات نییە حەیات بێ، قەت وانییە تۆبەکار



تف لە ڕەنگ و ڕەوانت، دەگەڵ فیعل و ژیانت
چی تێدا نییە دوکانت، چت بکڕێ خریدار
مومکینی سیرر و نیهان، هەم سوحوفن هەم بەیان
هەم کیتابن هەم زوبان، بەوەسفی پەروەردگار
قسە بیست و چوارە، هەر یەکێکیان بەکارە
ڕێگای خودای دیارە، بمرە ببە ڕستگار
لە خەو لە خۆوە هەستە، حەیات بێ هێندە بەستە
(وەفایی) گێژ و مەستە، دەنگە لە شار و بازاڕ

لەم شیعرە بەهارییەدا وەفایی دەچێتە ناو وەسفی سروشت، لە دوا دێرەکانیدا دەکەوێتە ئامۆژگاری و لەسەر ئەو باوەڕەیە پیاو دەبێ خاوەنی قسەی خۆی بێ، وەفای هەبێ، ڕۆژوو و نوێژ ئەوە ناگەیەنێ پیاو چاوی لە زەکات بێ، واتە سواڵ بکا، ئەمە کردەوەی کەسی تۆبەکار نییە.

لە پارچە لیریکێکیدا وەفایی باس لە بەختی خۆی دەکا لە گێتی دڵداریدا. بەلایەوە زۆربەی دیاردە جوان و خۆشەکانی ژیانی ئادەمزاد ماوەیان کەمە، زوو دێن و زوو دەڕۆن. لەم لایەنەوە دەڵێ:

بەبێ باکی دەمێکی هات و داغی کردم و ڕۆیی
دەبێ حاڵی چ بێ بولبول، بەهار زۆر پێ نەچوو ڕۆیی
نیگار هات دایە خەندە، کەوتە دنیا ئاه و ناڵەی من
بەهار هات غونچە پشکووت، دەنگی بولبول سووبەسوو ڕۆیی
فیراقم کرد لە پاش تۆ، هیچ حەیاتم پێ نەما قوربان
حەیاتی من کە تۆی مەعلوومە نامێنم کە تۆ ڕۆیی
لەسەر ماچێکی زاری خۆت کە نەتدا ڕەنگ نەبوو زیز بی
عەزیزم بێ وەفاییت کرد لەسەر هیچ و نەبوو ڕۆیی
خەرامان هات و چوو دڵبەر، (وەفایی) ما بەناکامی
درێغا عومری شیرینم چ زوو هات و چ زوو ڕۆیی

وەفایی لەم شیعرەدا ڕاستییێک دەردەخا کە دەڵێ، تەمەنی بەهار کورتە، بولبول لە جێییێک ئۆقرە ناگرێ، بزە لە لێوی دڵبەر فڕی، بەڵام زۆری نەخایاند خۆشەویست بێ وەفا دەرچوو، مەیلی کەم بوو، تەمەنی شاعیریش کورت بوو، زوو هات و زوو ڕۆیی.

له شیعرێکی دیکەیدا وەفایی له حاڵەتێکی سایکۆلۆجی هەڵقوڵیو خۆی تەجرید دەکا له ژیان، هەرچەند شیعرەکە هەوایێکی سۆفیزمی تێدایە، بەڵام ئاه و هەناسەی وێنەی ژیانێکی پڕ له ناخۆشی و ناسۆری ڕیالیزمییانەی ئادەمزاد دەکێشی، له شیعرەکەدا دەڵێ:

خۆشە ڕۆژێ له عالەم دەربەدەر بم
له نێو ئەوزاعی دینا بێ خەبەر بم
لەبەر بێ تاقەتی دێوانە ئاسا
له غەوواسانی دەریا بێ خەبەر بم
شەو و ڕۆژێ له چۆڵی هەر بەناڵە
حەریفی شەوڕەوی بایی سەحەر بم
نەزانێ هیچ کەس ناوونیشانم
ئەگەر عاقڵ ئەگەر ئاشفتە سەر بم
له هەر لا با بسووڕێنێ غوبارم
له هەر جێگایێ پێویستە سوپەر بم
چرا بێ هەڵکرێ جانا له نێو دڵ
له ڕووناکی دڵی یارم خەبەر بم
له بەرچاوی تەڕم سۆرانی برزێ
گەهێ بێ دایک و گەه بێ پدەر بم
خودا خۆم چۆن بسووتێنم بەجارێ
له دەرد و داخی ئەحواڵم بەدەر بم
شەوێ هەر تاکو ڕۆژێ هەر بناڵم
بەگریان دەست و دامانی سەحەر بم
چ ڕێگەی چارە نابینم (وەفایی)
مەگەر سەر تا قەدەم غەرقی نەزەر بم

شاعیر ئارەزووی ئەوەی هەیە له گێتی بچێتە دەرەوە، بێ ئاگا بێ له هەموو ڕووداوێکی ئادەمزاد، کەس ناوونیشانی نەزانێ. ئەگەر شاعیر نەیوتبایە پێویستە چرایێک له ناودڵیدا هەڵبکرێ بۆ ئەوەی ڕووناکی ناودڵی خۆشەویست ببینێ، ئەو کاتە بەتەواوی هیچ جۆرە شوێنەوارێکی تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی و حاڵەتی سایکۆلۆجی له ناوەوە نەدەبوو، شیعرەکە بوعدێکی دڵداری سۆفیزمیانەی وەردەگرت.



## ڕەنگدانەوەی شێوازی شیعری نالی و کوردی له شیعری وەفاییدا

وەفایی یەکێکە لەو شاعیرانەی نالی کارێکی گەورەی کردۆتە سەر بەرهەمی شیعری. هەندێ وێنەی هونەری له نالی وەردەگرێ و بەشێوازی خۆی دەیخاتە ڕوو، هەندێ جاری دیکە بەشیعر وێنەی نالی لێکدەداتەوە، جاری وەهاش هەیە وێنەیێکی نالی له ناو شێوازێکی قورسی خنکاوە و مانای داخراوە، وەفایی بەشێوازێکی ئاسان دایدەڕێژێتەوە و جێگۆڕکێ بەوشەکانی نالی دەکا. ئەو شیعرەی لێرەدا تۆمار دەکرێ نموونەی ڕەنگدانەوەی ئەم بیروڕایانەیە:

ڕۆژ تەرەب و وەقتی گوڵ و فەسڵی بەهارە
یاران گوڵەکەم کوا کە دەمی بۆس و کەنارە
گوڵزاری ئیرەم، سوورەتی غیلمان، قەد تووبا
گۆشەی چەمەن و ڕوویی گوڵ و پایی چنارە
بنوارە له نێو حەلقەیی زولفی سەری کوڵمی
دوو ڕۆژی درەخشانە له نێو دوو شەوی تارە
هەر لەحزە کە دێ پێدەکەنێ حەقمە کە بگریم
پشکووتنی گوڵ مایەیی بارانی بەهارە
بۆچی نەگریم کوشتەیی سەد غەمزە خەدەنگم
من یێک و نیزامی حەبەشی زادە هەزارە
بەو زولف و موژە مەمکوژە هەردەم بەجەفایێ
جارێ له تەنافم مەدە جارێ له قەنارە
بەو قامەتە حەیرانی شکۆفەی قەد و باڵام
قەد نارەوەنی باغی گوڵان باغی هەنارە
سووتاوم و شێواوم و سەودایی و مەستم
بەو عاریزە بەو پەرچەمە بەو چاوە خومارە
گوڵ دەستە، نیگەه مەستە، دەهەن پوستە، گوڵ ئەندام
زولفی کە هەموو داوی دڵی عاشقی زارە
بەو دوو مەمە زولف و روخی تۆ نۆبەری سەرون
هەر عەترە بەتا هەر گوڵ و نارنجە بەبارە

پرسیم چییە ئەو خاڵە لەسەر ئەو لەبە فەرمووی
جێی ماچی (وەفایی) ئەوە نیشانەیی پارە

خوێندنەوەی ئەم غەزەلە لە هەوای شیعری نالی دێنێتە ناو هۆشی خوێنەری شیعرەکەوە، یەکسەر لەو ڕاستییە دەگا ئەمە شیعرێکی مانا لە ڕوو و ئاسانە، هەندێ لە مانا داخراوەکانی نالی ئاشکرا دەکا و ڕوونیان دەکاتەوە. بۆ ئەم مەبەسە بەشێ لە وشە و ڕستە و لێکسیکۆنی نالی بەکار دێنێ. ماناکانی وەفایی لەگەڵ ئەوانەی نالی یەکێکن، ئەوەندە هەیە ئەوەی نالی داخراو و پڕ لە تەمومژە، ئەوەی وەفایی مانا لە ڕوو و بێ چەندوچوونە.

لە شیعرێکی دیکەیدا وەفایی کەوتۆتە ژێر کاریگەری شێوازی مستەفا بەگی کوردی، لەو شیعرەدا دەڵێ:

ئەلئەمان سەر تا قەدەم سووتام و جانانم نەهات
چاو لە سورمەی خاکی ڕێ بووم ڕاحەتی جانم نەهات
خاڵ و خەت گوڵزار و ڕەنگی شۆخی بێ باکم نەدی
زولف و ڕوو هیند و فەڕەنگی شاهی خووبانم نەهات
ئەی عەجەب گریام وەکو هەوری بەهاران و کەچی
پێکەنینی ئەو گوڵەی کاکۆڵ پەرێشانم نەهات
چاوی خوێنین غەرقی پەروین بوو لە بێ میهری گوڵم
مات و حەیرانم لەسەر چی ماهی تابانم نەهات
حەلقەیی زونناری زولفی بوو بەمیحرابی دوعام
تورکی کافرکێش و یاری ناموسوڵمانم نەهات
تەشنەلەب دێوانە بووم، سەرگەشتەیی زوڵماتی غەم
دلبەری بالا بڵاوم ئاوی حەیوانم نەهات
کەعبەیی ڕووحم، حەبیبی من عەجەب پەیدا نەبوو
قیبلەکەی دینم تەبیبی دەردی پەنهاهم نەهات
نەی سیفەت نالینمە، بولبول تەریقەت شینمە
شای شەکەر لێوان، گوڵ و ئەگریجە لەرزانم نەهات
بوو بەخوێن غونچەی دڵم، نەمدی هەوای خەندەی گوڵم
سووت دەر و ژوورم، سەدای بەرقی بەهارانم نەهات



چەند بەچەند گریام هەوای عیشقم لەسەر خاڵی نەبوو
غەرقی تۆفان بووم کەچی تەسکینی سووتانم نەهات
وەک (وەفایی) تابەکەی بگریم بناڵێنم بڵێم
ئەلئەمان سەر تا قەدەم سووتام و جانانم نەهات

لەم شیعرەدا وشە و ڕستەی مستەفا بەگی کوردی دەخوێندرێتەوە، لەیەکچوون لە نێوان ئەم شیعرە و شیعری کوردی «چێشتم ئەمڕۆ ژەهری مار و ڕووحی شیرینم نەهات» تەنیا لە کێش و قافیە و پاش قافیەدا نییە کە هەموویان سیفەتێکی هونەری دیاریکراو کۆیان دەکاتەوە ئەو یارەیە کە شاعیر خۆشی دەوێ. لێرەدا وەفایی کە وەسفی یارەکەی دەکا خەیاڵی خوێنەر بۆ ئەو یارە ناچێ مێیینە بێ، بەڵکو زیاتر ئەو سیفەتانەی بەکاری هێناون بۆ نێرینە دەشێن، ئەگەر وێنەیێکی وای کێشا بی شایانی مێیینە بێ، ئەو جۆرە وێنانە لە لایەن مستەفا بەگی کوردییەوە خۆشی بەکار هێنراون، بەڵام مەبەسی نێرینەیە و بوعدێکی سۆفیزمی داوەتێ. ئەم شیعرەی وەفایی لەوە دەکا بەئانقەست بەیادی مستەفا بەگی کوردی هۆنیبێتییەوە.

## کۆڕی نهێنی عاشقان

لە شیعرێکیدا وەفایی کۆڕێکی نهێنی ڕۆمانتیکییانەی پێکهێناوە ساقی و موتریب قارەمانی ئەو کۆڕەن، موناجات لەگەڵ ئەو دوو کەسە دەکا و بەحەقی پیری مەیخانە سوێندیان دەدا. لە شیعرەکەدا دەڵێ:

ئەلا ئەی ساقیی مەستان بەحەققی پیری مەیخانە
بەگەردش بێنە جامی مەی بەیادی چاوی جانانە
ئەمان ئەی موتریبی مەجلیس بەحەققی تاری ڕووحانی
بڵا بێ نەغمەکەی سازت کە ئاوی ئاوری هیجرانە
ئەتۆ ئەی ڕووحەکەم ساقی، ئەتۆ ئەی عومرەکەم موتریب
پەیا پەی لێدە چەنگ و نەی، دەما دەم بێنە پەیمانە
بەتیری غەمزە بملاوێنەوە زولفم لە گەردەن کە
بەسەر هاتوومە مەیدانت، بەدڵ بۆت بووم بەنیشانە
ئەگەر شەوقی جەمالی تۆ نییە، من مەست و حەیرانم
لەبەر چی بۆتە بولبول گوڵ، چرا بۆچ بۆتە پەروانە

لە شەوقی تۆیە سەرمەستە، بەزەوقی تۆیە پابەستە
ئەگەر عاریف لە کەعبەیدا، ئەگەر کافر لە بوتخانە

ئەو کۆڕەی شاعیر بەستوویەتی و لەم شیعرەدا باسی لێوە دەکا، بەڕاستی ئەگەر سەرپێیی و بەڕواڵەت تەماشا بکرێ، کۆبوونەوەییێکە دڵداران بەستوویانە، لە ژێر زەوییێکی نیوە تاریک کۆبوونەتەوە، ساقی بەمەی، موتریب بەگۆرانی و ئاواز مەستی کردوون، دلبەرەکەشیان پەریزادەییێکی قەشەنگە، کەچی ڕاستی مەسەلەکە ئەوە نییە، چونکە لە ڕۆژهەڵاتدا کۆڕی وا نابەسترێ بەتایبەتی ژنیشی تێدا بێ، بەڵکو ئەم دیمەنەی وەفایی دەبێ بەمانای سیمبۆلی لێک بدرێتەوە، دیاردەییێکی گیانییە نەک مەتریالی.

شاعیر بەم دێرانە کۆتایی بەپارچە غەزەلەکەی دێنێ:

لە شیرینی جەمالی تۆیە ڕۆژی ڕوونی لەیلایە
ئەگەر فەرهادی سەرگەردان، ئەگەر مەجنوونی دێوانە
دەمێکی مەست و بیمارم، دەمێک بێ هۆش و هوشیارم
چ کەس نازانێ دەردی من، مەگەر ئەو چاوە کاڵانە
دەهەر حەلقێکیدا سەد دڵ گرفتارە دەناڵێنێ
سەری زولفی پەرێشانت مەگەر زنجیری شاهانە
هەناسەی عاشقان با نەدگرێ بێ مروەتی تا کەی
بترسێ ئەی گوڵی نازک بەدەن لەو بایی زریانە
ئەگەر زولفت وەکو من عاشقی ڕووی تۆ نییە بۆچی
سەراپا تێکچووە کەوتۆتە بەرپێت دەست و دامانە
ترازا دوگمەکەی سینەی، بەیاری زولفی هات غەمزە
بەیان بەربوو لە لای چین، با خەبەر بن تیرەبارانە
(وەفایی) بوو گوڵێکی سەر و باڵا شێت و شەیدایە
وەکو قومری دەناڵێنێ، وەکو بولبول غەزەلخوانە

لێرەدا وەفایی دیمەنەکە لە قاڵبی مەتریالی دەردێنێ کە ناوی لەیلا و شیرین دەبا، ئەو دوو کیژەی مەجنوون و فەرهادیان سەرگەردان کردبوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەموو وێنە و ماناکانی دیکەی ئەم غەزەلە پێدا هەڵگوتن و ستایشە بەبەژن و باڵا و ئەندامانی لەشی دلبەر کە کچێکی زەمینییە و بوونی هەیە. شاعیر زۆری پێ خۆشە دوگمەی سنگی بترازێ



بۆ ئەوەی مەمکی دەربکەوێ، بەهەموو جۆرێک شاعیر هەوڵیداوە لەم شیعرەدا لە جوانێک بدوێ عاشقی بووە، کەچی سەری لێ شێواوە دەمێک عیشقەکەی دەکا بەحەقیقی و دەمێکی دیکە دەیکا بەمەجازی.

**شیرین تەشی دەڕێسێ:**

«شیرین تەشی دەڕێسێ» ناوی قەسیدەییێکی بەناوبانگی وەفاییە، لەسەر شێوەی پێنجین دایناوە. هەر پێنجینێک (کۆپلەییێک) لە پێنج نیوە دێر شیعر پێکهاتووە، هەموو دێرەکانی پێنجینی یەکەم لەسەر یەک قافیەن، بەڵام هەموو پێنجینەکانی دیکە، چوار نیوە دێری یەکەم یەک قافیەیان هەیە، کەچی دێری پێنجەم قافیەی جیاوازە (ا ا ا ا ب، ا ا ا ا ج...). شاعیر لەم پێنجینەیدا دەسکاری یا داهێنانێکی دیکەی کردووە. دێری پێنجەمی هەموو پێنجینەکانی کردۆتە دوو پارچە، پارچەی یەکەم قافیەی لەگەڵ چوار نیوە دێرە شیعری یەکەمی پێش خۆی ڕێک دەکەوێ، هەرچی پارچەی دووەمیشە کە ڕستەی «شیرین تەشی دەڕێسێ»یە لە هەموو پێنجینەکاندا دووبارە دەبێتەوە.

ئەو کچەی وەفایی ئەم شیعرەی بۆ داناوە کێیە؟ بێ گومان دەبێ ناوێکی خوازراوی خەیاڵی بێ و وەفایی کردبێتی بەبووکی شیعر. ئەم ناوەش بۆ یەکەمین جار نییە وەک ڕەمزێکی جوانی و دڵداری شاعیری کورد بەکاری دێنێ، بەڵکو لە نێو نەتەوە موسوڵمانەکانی هەموو ڕۆژهەڵات بووە بەبووکی شیعر. لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا هەواڵی وا لە ناوەوەیە ناوی ژنی وەفایی زارا یا سارا بووە.

لە بابەت ناوەڕۆکی شیعری «شیرین تەشی دەڕێسێ» بێ گومان شاعیر ئاگاداری «مەستوورە»ی ڕێبەر و مامۆستای خۆی نالی بووە، بەڵام بەهیچ جۆرێ لاسایی ئەوی نەکردۆتەوە لە وێنە و ماناکانی شیعرەکەیدا، بەڵکو مەستوورەکەی نالی بووە بەقەڵغانێک وەفایی خۆی پێ بپارێزێ و قسەی خەڵکی نەیەتە سەر. بەڕاستیش ئەگەر شیعرەکەی نالی نەبووایە باوەڕ ناکرێ وەفایی زاتی ئەوەی بکردایە شیعری کراوە (ئیرۆتیک)ی وا بهۆنێتەوە، جگە لەوە شیعرەکەی نالی لە ئەوەی وەفایی کراوەترە، هەر ئەوەش وەفایی هانداوە جورئەت بکا و شیعری وا بڵێ.

وەفایی قەسیدەکەی بەم پێنجینانە دەست پێ دەکا:

تاییێکی ڕیشەیی دڵ بەنووکی غەمزەدادا
دەستێکی بۆ سەما برد ڕووبەندی ماهی لادا

نافەی گوڵی بەدەرکەوت عەتری بەدەم سەبادا

باریک و لووس و نازک وەک زولفی خاوی بادا

وەک شاخی گوڵ بەلادا، شیرین تەشی دەڕێسێ

نووکی تەشی بەگەردوش چەرخێکە قوتبی پێوە

موجەرڕەب و بەداوی کە چەرخی کەوتە نێوە

وەک زوهرە دەستی کێشا کە بەندی قەوسی زیوە

ئەستێرە ماهی داگرت سابیت کرا بەپێوە

عەرەق بەڕوو بەڕێوە، شیرین تەشی دەڕێسێ

لەبانی عارەقی ڕشت لە پێکەنینی زاری

بەخەندە غونچە گوڵ بوو گوڵاوی لێ دەباری

وتم بفەرمووە سەر دوو چاوی من بەیاری

بەچاوی من ببینن تەلیسمی سیحرکاری

کە سەروی جۆیباری، شیرین تەشی دەڕێسێ

کە دەستی برد و هێنا بەدلبەری بەتادا

هێنایە چەرخە و گێڕای بەڕانی سافی دادا

عەیان بوو پەنجەیی ڕۆژ بەخەتتی ئیستیوادا

بەسوبحی سادیق نەنگووت زەنەب لە نێو سەمادا

حیرەت لە ماسیوادا، شیرین تەشی دەڕێسێ

کە هاتە چەرخە و بازی تەشی بەڕانی لووسی

دەکەوتە پایبۆسی دوو زولفی ئابەنووسی

زەنەب لە مانگەشەودا دەهاتە چاپلووسی

لەسەر بەیازی گەردەن بەخەتتی خۆش نووسی

مەبێتە پایبۆسی، شیرین تەشی دەڕێسێ

لەم دێرە شیعرانەدا وەفایی وێنەیێکی فۆتۆگرافی هەست بزوێن دروست دەکا. شیرین خانمە بەنازوفیزەوە دانیشتووە تەشی دەڕێسێ. وێنەی بزووتنەوەکانی دەست و پەنجەی دەکێشێ لە دەست بڵندکردن و بادانی تەشی و گلۆڵەکردنی ڕیسەکە دەدوێ، لێرەدا ڕانی شیرین دەوری گرنگی هەیە لە بادان و وەچەرخاندنی تەشییەکە لە کاتی هاتوچۆیدا لەسەر



ڕانی لووسی شیرین، ئەوجا دوو زولفی دەکەتنە سەر پێی و ماچیان دەکرد.

شاعیر لەسەر پێنجینەکەی دەڕوا و دەڵێ:

یەخەی کراسی لاچوو پشکووت بەهەردوو لێوان

گوڵ و شەکەر دەبارێ لە کووچەی باغی سێوان

زولفی برزاند و کولمی وەدەر دەکەوت لە نێوان

شەمس و قەمەر هەڵاتن، دوێنێ نوێژی شێوان

(وەفایی) کەوتە کێوان، شیرین تەشی دەڕێسێ

کە کەوتە چەرخە و گەردوش تەشی بەدەستی ڕەنگین

هەودای لە لێو و دەمدا خورشیدی سینە نەسرین

سەمای بەزوو زەنەبدا کەفولقەزیبی شیرین

گرتی خەتی مودارا شەفەق بەعەقدی پەروین

سیحرێکە بۆ دڵ و دین، شیرین تەشی دەڕێسێ

دوو زولفی چین بەچین کرد کە نافەیی خەتایە

دوو مەمکی خستە سەر لق هەناری دڵ گوشایە

بەخەندە چەرخێکی دا کە شەوق و نەشئە وایە

بەنوکتە پێی پیشان دام سەما لەسەر هەوایە

هەموو ئیشارە وایە، شیرین تەشی دەڕێسێ

بەعیشوە زولفی لادا لەسەر عوزار و زاری

دوگمە کراسی ترازا، بزووت هەوای بەهاری

کە شەو بەیانی بەردا گوڵ و وەنەوشە باری

سەودای بەعاشقان دا باغی گوڵ و هەناری

دنیایێک ئینتیزاری، شیرین تەشی دەڕێسێ

کە زولفی کەوتە سەر ڕوو هەموو خەتای بەچین دا

خەرامی تاووسانەی بەسەروی نازەنین دا

سەفیدەیی بەیانی بەباغی یاسەمین دا

فەنایی پڕ بەقا بوو دەمی لە پێکەنین دا

سەد ئافەتی لە دین دا، شیرین تەشی دەڕێسێ

لەم دێرانەدا وەفایی لە بزووتنەوە و سووڕان و وەرچەرخانی تەشی هەموو لەشی شیرینی جوان دێنێتە لەرزین. یەخەی کراسی لادەچێ دوو مەمکی دەردەکەوێ، زولفی گلۆڵەبووی لەسەر ڕوومەتی لادەکەوێ و ڕوخساری جوانی دەردەکەوێ. لای وەفایی کردەوەی تەشی وەک سیحری جادووکەرێک وایە، دەتوانێ تەلیسمی هەموو نهێنییەکانی لەشی شیرین بشکێنێ و جوانییان بخاتە ڕوو. ئەگەر دەست و پەنجەی شیرین و بزووتنەوە و وەرچەرخانی تەشی نەبێ ئەم هەموو کەنجینە جوانانەی شیرین دەرناکەون.

شاعیر لەسەر قەسیدەکەی دەڕوا و بەم پێنجینانە کۆتایی بەبەرهەمەکەی دێنێ:

سمی غەزالەیی چین لە نافەدا عەیانە
دەڵێی لە نیوەشەودا سفیدەیی بەیانە
قەدی گوڵ و دەمی گوڵ ئەوەی کە قووتی جانە
لە باغی یاسەمیندا شکۆفەیی گوڵانە
بەهاری بێ خەزانە، شیرین تەشی دەڕێسێ

شکۆفە وا هەڵستێ لە زێڕ و زیو حوبابێ
لە کەوسەری بەهەشتێ دەروونی پڕ کرابێ
خڕ و لەتیف و نازک بلووری خود نوما بێ
بەتەرزی درزی دەرزی لەخۆوە درزی دابێ
دیارە سەروی وابێ، شیرین تەشی دەڕێسێ

شەوێ لە بیرەخەودا جەمالی ویم بەدڵ دی
دوو چاوی مەست و کاڵم وەکو غەزالی سڵ دی
ئەگەرچی نەوبەهارم بەڕەنگی باغی گوڵ دی
هەناری نەورەسیدم شکاو و خاو و بڵ دی
گوڵم لە خاک و گڵ دی، شیرین تەشی دەڕێسێ

وتم چ بوو نەمامم بەخاڵ و خەت نەماوی
وەکو بەهاری سونبول بڵاو و تێک شکاوی
وتی گڵاوی سەگ بوو شکۆفە گوڵ گوڵاوی
بەگەردوش و سەماوە ستارەیی سەماوی
بەسەرچوو چاو و ڕاوی، شیرین تەشی دەڕێسێ



مەنعی مەکەن (وەفایی) کە خاوی دڵ بڵاوە
سەرێکە مەستی نازی دڵێکە بۆی نەماوە
بەداوی دڵ دڵی خۆی بەداوی زولفی داوە
دڵم حەقی بەدەستە فتوایی سەرمی داوە
کە ئەم غەزالە چاوە، شیرین تەشی دەڕێسێ

قوتووی لوئالییانە لە زیوی داڕژاوە
لەبالەبە لە حیکمەت لە شەهدی هەڵکراوە
لەبەر نەزاکەتی ڕۆژ ڕوواقی دادڕاوە
بەتەرزی درزی دەرزی لەخۆوە درزی داوە
بەمەی عەیان کراوە، شیرین تەشی دەڕێسێ

شیفای جەراحەتی دڵ تەشی نەبوو، کەی ڕستی
شەش پەڕەکەی کاکی خۆی، پڕ ئاو و پڕ بەمستی
هەتیوی کەللەشەق بوو بەداوی حیلە بەستی
لە تاوی هاتوچۆدا بەلێوی غونچە گەستی
بەڕووح و دڵ بەقەستی، شیرین تەشی دەڕێسێ

بەدڵ بەدیدە سۆسەن بەغونچە گوڵ یەرەق بوو
شەشپەڕەکەی (وەفایی) کولوفت و تیژ و ڕەق بوو
لە هاتوچۆی شەماڵی گوڵی وەرەق وەرەق بوو
بەعارەقی عورووقی کە سەرخۆشی عەرەق بوو
بەمەی چ موستەحەق بوو، شیرین تەشی دەڕێسێ

لەو دێرانەدا وەفایی دیاردەکانی سروشت و هەندێ شتومەکی مەتریالی بەکارهێناوە بۆ وەسفی ئەندامی مێیینەی شیرین. بڕێک لە وێنەکان ئەمانەن: نەخسی سمی مامزی چین لەسەر پەڕەی گوڵ یا لمی بیابان؛ غونچەیێک لە زێڕ و زیو دروست کرابێ و ئاوی کەوسەری بەهەشتی تێدا بی؛ شتێکی خڕوپڕ و دڵگیر و ناسک درزێکی وەکو کونی دەرزی تێدا بێ، قوتووێکی زیوینی لوئلوئـ پڕ لە هەنگوین کرابێ... هتد.

شاعیر تەنیا بەوە نەوەستاوە، وەسفی ئەندامی نێرینەی پیاویشی کردووە، لەمەشدا داهێنانی بەدەست هێناوە. هەڵبەت لێرەدا مەبەسی ئەوەی خۆیەتی. بەم پێیە لە هەنگامی مێبازی و ماچومووچدا، پیاو چۆک دەداتەوە و یاری لەگەڵ

هینەکەی شیرین دەکا ئەویش وەک غونچە دەمژێ.

لە خوێندنەوەی ئەم شیعرەدا مەستوورەی نالی دێتەوە یاد. خوێنەران سەربەستن لەوەی یەکێکیان لە ئەویتریان جوانتر بێ لە لایان، یا هەردووکیان جوان بن هەریەکەیان بەجۆرێک، بەڵام ڕاستییەکی دیکە لە ناوەوەیە، هەرچەندە لە یەک دوو شوێن وێنەکانی وەفایی لە هی نالی دەکەن، بەڵام بەگشتی وەفایی وەستایەتییەکی هونەری بەرزی لەم شیعرەدا نواندووە، گەلێ شتی تازەی خستۆتە ڕوو، گێتی ئەم جۆرە شیعرەی ئاوەدان کردووە. ئەگەر ئاوڕدانەوە لە نالی کارێکی بەجێ بێ دەبێ بوترێ نەک تەنیا لە مەستوورەکەیدا بەڵکو لە شیعردا بەگشتی مامۆستای هەموویانە، بەڵام گومان لەوەدا نییە شاعیرانی دیکەش بۆ سەردەمی خۆیان هەندێکیان گەیشتوونەتە پلەی نالی و ئەوەی ئەمانە وتویانە داهێنانی تازەیە و دیوانی شیعری کوردی پێیان ڕەنگین بووە.

## شیعری خۆماڵی سیلابی

لە دیوانی وەفاییدا کۆمەڵێک شیعر هەیە لەسەر کێشی خۆماڵی سیلابی دانراون. شاعیر ئەم شیعرانەی بۆ ئاوازی گۆرانی چڕین داناوە. ئەوەی لەو شیعرەدا بەدی دەکرێ ئەوەیە وشەی بێگانەی کەم بەکارهێناوە، ئەوەی بەکارهاتوون ئەو وشە عەرەبییانەن کە کورد لە قسەکردندا بەکاریان دێنێ و چوونەتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردییەوە. جگە لەوە ڕستە و تەعبیری میللی و زمانی قسەکردنی کوردی بەکارهێناوە، بەگشتی زمانی ئەم شیعرانەی لە زمانی ئەدەبی میللی نەنووسراوەوە (فۆلکلۆر)ەوە نزیکە.

لەم ماوەیەدا کۆمەڵێک نموونەی ئەو شیعرە میللییانەی وەفایی دەخرێتە ڕوو.

- ١ -

وەفایی پارچە شیعرێکی لەم بابەتەی هەیە دە سیلابییە، لە ڕووی قافیەوە شاعیر لە خاسیەتەکانی ئەم جۆرە شیعرە لایداوە، لەباتی ئەوەی شیعرەکەی لەسەر بنچینەی جووت قافیە (مەسنەوی) دابنێ، لەسەر یەکێتی قافیە دایناوە.

سەرەتای شیعرەکەی بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

نەخۆش و مەستی دوو چاوی کاڵم
حەقم بەدەستە ئەگەر بناڵم
بەغەمزەی چاوت بەخەندەی زارت
بردیان بەغارەت خەو و خەیاڵم



فەرمووت چلۆنی چ بڵێم عەزیزم
دوور لە زولفی تۆ، کافر بەحاڵم

بەم دێرانەش کۆتایی پێ دێنێ:

سەبا دەخیلم هەر تاکو ماوم
بڵێ بەزاری بڕۆ بەخاڵم
دەمێکی بابێ دەوای دڵم کا
بەچاوەکانی گەلێ بێ حاڵم
(وەفایی) چی دیت لەسەر بگێڕێ
نەما لەسەر تۆ نە سەر نە ماڵم

- ٢ -

شیعرێکی دیکەی وەفایی، لەسەر کێشی دە بڕگەیی خۆماڵی هۆنیویەتییەوە و لەسەر دەستووری یەکێتی قافیە بینای کردووە وەکو شیعرەکەی پێشوو.

لە سەرەتایدا دەڵێ:

ئەو چاوانە وا خوماری نازن
بەئیمانم ئیمانم دەخوازن
هاتە دەر وەک ڕۆژ شای شەکەرلێوان
غەمزەکە و ڕەمزی تورکی پێش تازن
دەستی هێنا دەر پێی لە سەمادا
چاو مەستی چاوبەستن یا سیحرسازن

بەم دێرانەش کۆتایی پێ دێنێ:

کەمەندی ئاسکان هاتوچۆی بازان
هەموو بۆ خاتر چاوەکەی بازن
قەفەسی بەدەنم تەنگ و تاریکە
باز دڵ و مورغ جان هەردوو پەروازن
(وەفایی) ناژی بەتاری زولفت
سەر تا پێ ئازای ماران گازن

- ٣ -

وەفایی شیعرێکی دیکەی لەسەر بنچینەی کۆپلە داناوە، هەر کۆپلەییێک چوارینێکە، لە پازدە چوارین پێکهاتووە، کێشی تێکەڵاوە لە نێوان نۆ و دە و یازدە سیلاب، لە ڕووی قافیەشەوە، چوارینی یەکەم لەسەر یەک قافیەیە، چوارینەکانی دیکە سێ دێری یەکەمیان لەسەر قافیەییێکە، بەڵام دێری چوارەمیان لە هەموو چوارینەکاندا لەسەر یەک قافیەیە.

هەندێ لە چوارینەکانی ئەم قەسیدەیە:

ئەمان موتریب بێ ساقی وابێ
ئەگەر مەی نابێ بۆ خۆی بابێ
کەسێ بێ هۆشی تەجەللا بێ
خەیاڵی نەشئەی بادەیی نابێ

***

هەتا نەبیە خاکی مەیخانە
مەڵێ ساقی بێنە پەیمانە
مەحاڵە بگاتە شەم پەروانە
مەگەر سەر تا پێ ئەو سووتا بێ

***

نەخۆشم کەوتووم دەردەدارم
وەک زولفی دلبەر بێ قەرارم
ڕووح لەسەر لێوم چاوەڕێی یارم
یار دەڵێن وا دێ تۆ بڵێی وابێ

***

یا خودا بەناڵەی دڵی ئێشان کەی
یا ڕەب بەیاهووی دەروێشان کەی
غەمی جەرگی من پەرێشان کەی
ڕووت لە نێو زولفت بۆ بڵاو نابێ

***



ئەگەر یار بێتە گۆشەی قەسرێ
دڵێکی دەم بەدەم ئاور نەگرێ
بەدیدارێکی سەد جار نەمرێ
دڵی وام ناوێ تووڕی سینا بێ

***

نە زولفی تۆم بۆچ بێ قەرارم
نە چاوی تۆم بۆچ وا بیمارم
عەجەب شێواوە سەر و کارم
دیارە دەردێ بێ دەوا بێ

***

دەڵێ گوڵ زارم گەردەن ئاسکم
وەنەوشە بسکم زیوین باسکم
بلا بزانێ چەند نەرم و ناسکم
ئەگەر ڕووح دێنێ (وەفایی) بابێ

ئەم بڕە شیعرەی وەفایی نموونەییێکی باشە بۆ شاعیرێکی کلاسیکی کوردی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم. ئەو نموونەیە دەبێتە بەڵگە بۆیە دەبێت بیر لەوە بکرێتەوە لەو ڕۆژگارەدا توانای ئەوە لە ناوەوە بووە بزووتنەوەییێکی شیعری پەیدا بێ بەکێش و قافیەی خۆماڵییەوە. هەرچۆنێ بێ ئەمە ڕێی لە پەرەسەندنی شیعری عەرووزی نەدەگرت. ئەم بڕە شیعرە میللییەی وەفایی بەڵگەی ئەوەیە نەیتوانیوە خۆی لە یەکێتی قافیەی شیعری عەرووزی ئیسلامەوی ڕزگار بکا.

***

وەفایی یەکێکە لەو شاعیرە گەورانەی قوتابخانەی شیعری ناوچەی سلێمانی کوردستانی باشووری نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمیان بۆ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم گواستەوە ناوچەی موکریان. شاعیر دەورێکی کاریگەری هەبووە لە دامەزراندن و پەرەسەندنی شیعری قوتابخانەی نالی لە موکریان. شیعری لە زۆربەی مەبەسەکانی کلاسیکی وتووە. شێوازی نووسینی ئاسانە، ڕستەی پڕ مانا و ڕوونە، مۆسیقای نەرمە، ئاوازی ڕەوانە.

وەفایی لە هەردوو بابەتە شیعری کوردی عەرووزی و کێشی خۆماڵی خەیاڵی بێ پایان بووە. شوێنەواری وشە و تەعبیر و لێکسیکۆنی دیالێکتی ناوچەی موکریانی هەوایێکی جوانکارییان لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە داوەتە شیعری.

وەفایی کەسایەتییێکی خاوەن باوەڕ و قسەی خۆی بووە. لە ژیانیدا نەیویستووە ببێ بەمەلا، لەبەر ئەوە لە ناو خەڵکی بەمیرزا عەبدولڕەحیمی وەفایی ناوی دەرکردووە. لە سەردەمی ژیانیدا یا دەبوو ببێتە مەلاییێکی لە ڕوو، یا دەبوو ببێ بەکۆلکەمەلای مردووشۆر، یەکەمیانی دەست نەکەوتووە و دووەمیشیانی نەویستووە.

وەفایی لە خاکی کوردستان کۆچی دوایی نەکردووە، لە ڕێی گەڕانەوەی حەج لە بیابانی عەرەبستان تووشی نەخۆشییێکی کتوپڕ بووە، هاوڕێکانی لەو بیابانەدا ناشتوویانە.

کورد قەرزاری ئەم فرزەندەی خۆیەتی، ئەگەر بوو بەخاوەنی خۆی پێویستە پەیکەرێکی یادگاری بۆ وەفایی دروست بکا.

## بەشی پازدەم

# قادر

**١٨٤٩ - ١٩١٠**

## ژیان و شیعری لیریکی

### ژیانی قادر

میرزا قادر یا عەبدولقادر (ئۆلقادر یا ئەولقادر لە کۆمەڵی گۆرانەکاندا) کوڕی کوێخا محەمەدی پاوەییە. لە ساڵی ١٨٤٩ لە شاری پاوەی هەورامانی لهۆن لە دایک بووە. ناوی خۆی کە قادرە وەک نازناو لە شیعریدا بەکاری هێناوە. خوێندنی لە مەڵبەندی زێدەگانی باب و باپیرانی بووە. عەودالی زانیاری بووە، لە هەموو جێیێک بۆی گەڕاوە و لە هەموو سەرچاوەیێکیش وەریگرتووە، تا گەیشتۆتە پلەیێکی دیار لە خوێندەواری و ڕۆشنبیریدا، هەر لەبەر ئەوەش میرزای پێ وتراوە. ڕەوشتی عەشرەتگەری کارێکی گەورەی کردۆتە سەر ژیانی و لە ئەنجامدا تووشی تەنگوچەڵەمەی کردووە و ناچار بووە مەڵبەندی خۆی بەجێ بهێڵێ و ماوەیێکی ژیانی لە کاشتەر بباتە سەر. هەر لەوێشەوە نامەشیعرییەکەی کە بەناوی «شەماڵ» بووە بۆ دلبەرە نازەنینەکەی خۆی پەریزاد ناو ناردووە.

قادر ماوەی دوو ساڵێک لە قەڵای جوانڕۆ نووسەری (سکرتێری) دیوانی محەمەد بەگی جوانڕۆیی بووە. ماوەیێکیش لە کرماشان ژیاوە و ئاشنایەتی و دۆستایەتی لەگەڵ سەید ساڵحی نیعمەتوڵڵاهی (١٨٣٤ - ١٩٠٥) شاعیری ڕەندی کورد بووە.

قادر لە دوا ساڵانی ژیانیدا تووشی کەم بینایی بووە تا لە ساڵی ١٩١٠ هەر لە پاوە کۆچی دوایی کردووە. ئەگەرچی قادر لە ژیانی دارایی و گوزەراندا هەژار و دەستکورت بووە، بەڵام لە ژیانی گیانی و بەرهەمی شیعریدا دەوڵەمەند و بەدەسەڵات بووە.

### شیعری قادر

بەرهەمی ئەدەبی قادر ئەوەی لەبەردەستدایە کۆمەڵێک شیعری لیریکی و ئیپیکی (چیرۆکی شیعری)مان بۆ دەور دەکاتەوە. پاشماوە ئەدەبییەکانی شاعیر بەزمانێکی پاراو



و نزیک لە لێکسیکۆنی زۆربەی خەڵکی کورد تۆمار کراون و خراونەتە قاڵبی شیعرێکی ڕەوانی بێ گرێ و گوێیێکی مۆسیقی هوشیار ئاوازەکان دەڕێژێ و قافیە ڕێز دەکا.

قادر وەکو خوێندەوار و ڕۆشنبیرێکی بەدیمەن خۆی پیشان دەدا، شارەزای تەواوی مێژوو و دەستووری ئایین بووە. ئەمە بەتەواوی لە موناجاتەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، پابەندی خاک و مەڵبەند و نیشتمان بووە، ژیانی سەر ڕووی زەوی پێ خۆش بووە، لەبەر ئەوە ئارەزووی کردووە تام و چێژ لەو ژیانە وەربگرێ.

دڵخوازی شاعیر دلبەرێکی کورد بووە، ئەوەندە جوان بووە بەلایەوە جوانی لە هەموو شارە گەورە و بەناوەکانی گێتی وەرگرتووە، تەنانەت لەندەن و پاریسیشی لە بیر نەچووە و هەندێ ئەدگاری لێ وەرگرتوون بۆ ئارایشی خۆشەویستەکەی. یاری شاعیر جوانی لە هەموو ڕووی زەوی وەرگرتووە، بەڵام لە کوردییەتی نەکەوتووە و تەنیا کوردە.

شیعری قادر لە ڕووی ڕوخسارەوە بەژمارە زۆربەی شیعرەکانی درێژن، چونکە سروشتی چیرۆکە شیعرییەکانی ئەوە دەخوازێ. ژمارەی دێرە شیعری ئەو جۆرە بەرهەمانەی دەگەنە دەوروبەری سێ سەد دێرە شیعر. هەرچی لیریکەکانیشیەتی لەمەشا شاعیر هەناسەی درێژخایەنە، شیعری کورتی زۆر کەمە.

لە هونەرەکانی دیکەی شیعری کلاسیکی کوردیدا تەرجیع بەند لە دیوانی قادردا بەرچاو دەکەوێ، بۆ نموونە:

١- شیعری خانم خەندەشەن:

ئەم تەرجیع بەندە بریتییە لە یازدە پارچە، هەر پارچەی چوار یا پێنج دێرە شیعرە، بەندی یازدەمینی حەوت دێرە شیعرە. تەرجیع بەندەکە بەدێرە شیعرێک کۆتایی هاتووە. نیوە دێری دووەمی هەموو تەرجیع بەندەکان ئەمەیە «فەزاها بەلای خورشید نماوە».

شاعیر لە بەندی یەکەمدا دەڵێ:

خانم خەندەشەن
چون غونچەی نوخێز دایم خەندەشەن
خەرامان چین سەر ئەفکەندەشەن
سەدکەس چون خورشید خاوەر بەندەشەن
عەرعەر جە باغان حەیران مەندەشەن
چنووربەند زلف شەماڵ شەندەشەن

خەجاڵەتش كەرد خۆر وە هەواوە
(فەزاها بەلای خورشيد نماوە)

قادر بەم بەندە کۆتايی بەتەرجيع بەندەکەی دێنێ:

خەرامش مەرهەم ئيش زامەتەن
قامەتش فەزای ڕۆی قيامەتەن
نازار نۆ تووڵ يانەی باوانەن
بانووی موحتەرەم سەر کارخانانەن
موبارەک قەدەم مەلەک مەنزەرەن
ڕەژيدەی قودرەت دانای داوەرەن
ئەو کالا لايەق وە بالای خانەن
ئێد چون بەلقيس ئەو سلێمانەن
خولاسە خانم نەمام نۆبەر
هيچ عەيبش نيەن جە پا تا وەسەر
يا شا تا دنيان بوڵەند ئيقبال بای
هەر زەڕەڕە شيرين ساحيب جەمال بای
بنيشان وە هەم وە ئيستيغناوە
(فەزاها بەلای خورشيد نماوە)

***

(قادر) چون موخليس قەديم ئيخلاسەن
بافتی مەرحەمەت خەلاتی خاسەن

هونەری تەرجيع بەند لە شيعری گۆرانزەميندا کەمە. ئەم کارەی قادر نوێکردنەوە و تازەگەرييێکە لە گێتی ئەدەبی گۆرانزەمينی کوردی.

قادری شاعير ئەم ماوەيە هەست و نەست و بزووتنەوە و خورپە و شۆڕشی ناوەوەی خستۆتە قاڵبی شيعرەوە و لە دوو شێوەدا دەريبڕيوە:

١- شيعری ليريکی.
٢- شيعری ئيپيکی (چيرۆکی شيعری).



## شيعری ليريکی قادر

شيعری ليريکی ئەو پارچە شيعرە کورت و درێژانەيە (غەزەل و قەسيدە) کە ناوەڕۆکی گۆرانی و سروود و هەستی ناوەوەی کەسێتييان تێدايە. هەندێ جار قارەمان و ديالۆج و بزووتنەوە و گيانی چيرۆکی تياياندا دەبينرێ، بەڵام بەهيچ جۆرێ لە گيانی گۆرانی و سروود و هەستی خۆيی ناچنە دەرەوە. مەبەسەکانی شاعير لە ليريکەکانيدا تێکهەڵکێش کراون. واتە چەند مەبەس و هونەر و ناوەڕۆکێک لە تاکە شيعرێکدا بەکار دەهێنێ، لەبەر ئەوە بەتەواوی ناتوانرێ ناو بۆ شيعری بدۆزرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار بەپێی زاڵبوونی مەبەسێک بەسەر مەبەسەکانی تردا لە پارچە شيعرێکدا دەتوانرێ ناو بۆ شيعرەکە بدۆزرێتەوە و بخرێتە خانەيێکی مەبەسەکانی شيعری کلاسيکی. بەم پێيە دەکرێ شيعری ليريکی قادر تێکرا بەسەر ئەم مەبەسانەی لای خوارەوە دابەش بکرێ.

### شيعری دڵداری

شيعری دڵداری قادر لە چەند شێوەيێکدا خۆی دەنوێنێ، گرنگترينيان پێداهەڵوتن و ستايش و ئاوارەيی و دووركەوتنەوەيە لە يار، واتە لە هەردوو باردا هونەری پێداهەڵوتن دووری دەکاتەوە لە قاڵبی هەست و نەستی ناوەوەی بەرامبەر بەخۆشەويست.

شاعير هونەری جۆراوجۆر بەکار دێنێ لە مەبەسی پێداهەڵوتندا، بۆ بەڵگە لە شيعری «عەرعەر بێزەکەم»دا پاڕانەوە و موناجاتێکە لە خوارەوە بۆ سەرەوە بەچۆکدا دەکەوێ و ئاراستەی دلبەرەکەی دەکا. خۆشەويست وەکو بەشێکە لە «بوون»ی، ئەگەر ئەو بەشە نەبێ «بوون»ەکەش نابێ، لەبەر ئەوە ئاوەڵناوی کەسی يەکەم بەکار دێنێ، واتە دلبەر هی خۆيەتی يا ئەو هی دلبەرە يا هەردوو تەن يەک تەنە و بەبێ يەکتری هەڵناکەن. لێرەدا شاعير بەجوانی ڕووکەش و ناوەوە و ئاشکرا و نهێنی دلبەر هەڵدەڵێ و جارجارە وەسفێکی هەستپێکراوی مەترياڵی دەخاتە ڕوو، لە شيعرەکەيدا دەڵێ:

عەرعەر بێزەکەم
نەمام نەورەس، عەرعەر بێزەکەم

ئاهووی نەساسڵ، سەحەر خێزەکەم
دڵڕوبای دلبەر، دڵ ئاوێزەکەم

سەول نازپەروەر، شیرین جامەکەم
مەحبوب بێ عەیب، دانە و دامەکەم

گوڵ وەش گوڵ قامەت، گوڵ ڕوخسارەکەم
گوڵنام گوڵەندام، گوڵ کەلامەکەم

نەزاکەت فرۆش، لەنجە و لارەکەم
ڕۆشنی دیدەی، سۆمای تارەکەم

کۆگای زەبەرجەد، دانە لالەکەم
کان حەیا و شەرم، پڕ کەمالەکەم

توحفەی وەش قوماش، دڵپەسەندەکەم
شۆخ نازەنین، دیدە ڕەندەکەم

خاوێر خاڵدار، خەرامانەکەم
شیفای دەرد دڵ، بێ سامانەکەم

ڕەندم قامەتم، حاڵ زان حاڵم
شەمع و پەروانە و شەوچرای ماڵم

سەوڵ وەش قامەت، یار غەمخوارم
تەلا و ئەشرەفی، دانەی مروارم

گەنج و گەوهەرم، مایەی توجارم
خەزێنەی شاهان، خەروار خەروارم

خاو و خۆراکم، دیدە بیناهیم
دەوڵەت و ئیقبال، کەوکەبەی شاهیم

ساقی کەوسەر و بادەی تەهوورم
تووبا و سەهەندم، بەهەشت و حوورم



تەقوا و تاعەتم، زیکر و ئەورادم
فیکر و تەماشا و، دەرس و ئوستادم

کەسبم کەماڵم، ڕەویە و ڕەووشتم
بوتم کلیسام، مزگی و کەنیشتم

بێ تۆ زیندەگیم، چون ژار مارەن
پەی دووریت بەخودا، دڵ بێ قەرارەن

***

لە شیعرێکی تریدا «جامە دۆزان کەرد» وێنەیێکی زیندووی خۆشەویستەکەی دەکێشێ لە کاتی کراس درووندا. قوماش و دەرزی و داو، ئنجا دەست و پەنجە و بزووتنەوە لە درووماندا و گوڵچنیندا، دیارە هەموو بزووتنەوەییێکیش جریوە و هەناسەی سایکۆلۆجی تایبەتی لە دەموچاوی دلبەردا دروست دەکا:

جامە دۆزان کەرد
یەک ڕۆ لەیل وەناز جامە دۆزان کەرد

یاد هەوارگەی قەدیم هۆزان کەرد
بەخیە دۆزی بەرگ دڵ ئەفرۆزان کەرد

خەیاڵش جە غەم تەمام کەرد خاڵی
بڕەش کەرد کالای ئاڵای دیاری

کلافەی گیتار ئەژدەر وەست نە پشت
کلکەوانەی لاڵ کەردش نە ئەنگوشت

پەی دەفع خەتەر نیش مەودای خار
تا پەنجەش وەغەم نەکێشۆ ئازار

وەتای خەیاتەی خام ناوشاران
چەنی ڕیشەی دڵ خاتر پڕ خاران

وادا بەهەم دا بەلار و لەنجە
سەر مەودای دەرزی گرت وەسەر پەنجە

دڵ وە خەیاڵان چەم وەنازەوە
لەب وەشەکەرخەند ڕێزەی ڕازەوە

دەس وە دروومان بەخیە دۆزەوە
پێشانی بەوشەوق شەم ئەفرۆزەوە

چون باش خەیاتان ئۆسای تاتاری
کەوت وە سەودای نەخش دار و گوڵکاری

هەر تەقەڵ سەد ناز نەزاکەت مەکەرد
هەر نازێ سەد هۆش جە ئادەم مەبەرد

بەڵام ئەی یاران دۆسان دڵداران!
عەجەب کارێ دیم، جە ڕۆزگاران

جەودەم دا دلبەر دروومان مەکەرد
ناگا ئەو دەرزی شکیا و شکەست وەرد

ڕێزە ڕێزە بی ڕێزا وە هەم دا
شی نەراگەی مەوت مڵک عەدەم دا

چون پێشەی ڕەحیم قەدیم مەزاران
نەخش بی چەنی خاک خاشاک خاران

لەیلێ هەم خەیلێ غەمان بەرد وە دڵ
ئایینەی ڕەنگش قرمز بی چون گوڵ

ساتێ پەشێو بی شای عەرعەر قامەت
جەو دەما واتش: هەر ویم سەلامەت



دەس بەرد وە هەنی دەرزی بەر ئاوورد
دیسان هەم جە نۆ مەیل وە دروومان کەرد

منیچ وێنەی قەیس دێوانەی ساڵان
نە دەرزی بێ گیان پەرسام هەواڵان

هۆرگرتم جە خاک واتم: ئەی بێ مەیل
شکەست دای بەوێت عاجزی وە لەیل

تۆ خۆ پۆڵای سەخت سەرجۆشی خار بیت
ڕەواج بازار پای سەودا دار بیت

ئازیز بەو پەنجەی بلوور بافەوە
بەو سیم ئەنگوشت نەرم و سافەوە

کێ دییەن بلوور پۆڵاش مەڕدەبۆ!
کێ دییەن شەکەرتەوەن هەڕدەبۆ!

ئیسە تا مەحشەر بەناڵە و هاڵە
مەحرووم بیت جە دین ئەو بەژن و باڵە

دەرزی ئێد شنەفت کێشا ئاه سەرد
کزەی هەناسەش جە گەردوون ویەرد

واتش: ئەی مەجنوون سالار سەرمەشق
بەدبەختتەر جە من تۆ جە سەودای عەشق

تۆ چێش مەزانی زیندەگیم چێ وەر
جە تەور و یارام جە لای ئەو دلبەر

هەتا چەنی بەخت سەعادەت یار بیم
جە لای ئەو نازار دایم نازار بیم

یەکسەر گشت وە من دروومان مەکەرد
چون مەیلش چەنیم نەکەردە بێ سەرد

گاگا وەشادیم من مەدام وە فەرق
چەنی ستاران، دایم مەدام بەرق

وێم وە دڵدار شادیم وە کۆ بێ
دەماغم پەرداغ عەترە لیمۆ بێ

هەرگیز نەزانام رای نەسیم سەحەر
جەو یەخەی کەتان بکەرۆ گوزەر

ئینە چن وەختەن غەزەب گرتەن لێم
مەیل جارانش هیچ نەمەندەن پێم

نە تۆی دەرزی دان مەحبووسم کەردەن
سەد جار واتەنم ئاوات وە مەردەن

سابا تۆیچ ئارۆ حاڵم بزانی
مەردەیم وەشتەرەن جەی زیندەگانی

ئیتر جەی بێشتەر لێم مەدەر تانە
نەدارۆ تاقەت ئەو بەندیخانە

تۆ هەم وە باڵاش خەیلێ مەنازی
روێ وە هەن چون من، ئاوات بووازی

ئەر من زەمانێ دەنگم مەشکاوا
ئاخرش حالم وەی جاگە یاوا

ئەو رۆ پەنا بای جە ئێشی زامەت
چەنی تۆیچ ماچۆ هەر وێم سلامەت



هەر چەن جە لای لەیل بڵند پایەنی
عاقیبەت چون من کۆ تا مایەنی

وێت وست نە حەلقەی تۆڕدام مەینەت
بێ سوودەن ئیخلاس دیار بی بەینەت

(قادر) یە دامەن تۆ پەی وێت تەتدەن
رازان دەرزی گرد پەرێت پەندەن

***

وێنە بۆ مەبەسی دووری و ئاوارەیی لە بەرهەمی شاعیردا بەشێکی فرەی داگیر کردووە. ئەم دوورییە بەزۆری پێوەندی بەیارەوە هەیە، هەندێ جاریش نیشتمانە بچکۆلەی قارەمانی بنچینەیی کاری ئەدەبی شاعیرە.

لە شیعری «یاران هیجرانەن»دا وەستایەتی شاعیر لە وشە و زاراوە خۆی دەنوێنێ. دووبارە و سێ بارەکردنەوەی تاقە وشەیێک جۆرە مۆسیقاییێکی نهێنی دەدا بەمانا، هەستی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و چاوەڕوانی ئەوە دەبێ کە ئەو وشانە دواییيان نەیە، جوانییان لە دووبارە و سێ بارەکردنەوەیانە. لە لاییێکی تریشەوە شاعیر بەسوێندەکانی کە لە سەرەتای دێرەکانەوە بەوشەی «وە» دەست پێ دەکەن و لە دوایی دێرەکانەوە بەوشەی «قەسەم» کۆتاییيان دێ، ئەوانیش لە تیپ و دەنگەکانیان جۆرە قافیەییێکیان دروست کردووە. وەکو لەم شیعرەدا دوو جۆرە قافیە هەبێ، قافیەی سەرەتای دێرە شیعر و قافیەی بنچینەیی کە هەمیشە لە شیعری هەموو نەتەوەکانی گێتیدا دەکەوێتە دوایی دێرە شیعرەوە.

ئەوە نالێین دەلێین لە ئەدەبی یابانیدا جۆرە شیعرێک هەیە قافیەی لە سەرەتای دێرە شیعردا دەبێ نە لە دوایی.

قادر لە شیعرەکەیدا دەڵێ:

یاران هیجرانەن
ئیمشەو وادەی دەرد هیجری یارانەن
ئیمشەو بای هیجران وە سەخت وەزانەن
ئیمشەو لە هیجران قەلبم لەرزانەن

فیراق هیجران کار بالآی یار
وەستەن وەگیانم گڕگڕ گڕەی نار

قیبلەم گیانو تۆ وەخاڵت قەسەم
وە شێوەی شیرین پر نوورت قەسەم
وە گەردنی ساف بلوورت قەسەم
وە لەعل لە بان چون لالت قەسەم
وە پیشان خاس پر خاڵت قەسەم

وەپرشەی شیرین زولفانت قەسەم
وە شەمامەی شۆخ نەمامت قەسەم

وەلەفز شیرین وێنەی مرواریت
وەباڵای نەمام بەرز و دیاریت
وەتاق ئەبرۆی چون میحراب تۆ
وە نوور ئەفشان رووی مەهتاب تۆ

ئیمشەو لە هیجران گرانم دەردەن
لەباتی شەراو زوخاوم وەردەن

خاڵ سفتەی زوخاڵ تار هیجرانەن
دەبێ تۆ قیبلەم، جەرگم بریانەن

یاخوا کەس بەدەرد دووری نەوۆگیر
وەزولفی سیاکەس نەوۆ زەنجیر

مەفتوون وەباڵای شۆخی دۆس نەوۆ
بێچارە و بەدبەخت، کۆسەلکۆس نەوۆ
کەس چون من پابەند زولف و خاڵ نەوۆ
ئەسیر حەلقەی زولف یار نەوۆ



بێ عەقڵ و بێ هۆش مەجنوون وار نەوۆ
وەتای زولف لەیل گرفتار نەوۆ

کەس چون من وەیلان بیابان نەوۆ
دۆستاخ تای زولف پەرێشان نەوۆ
وەشەرارەی عەشق پایەماڵ نەوۆ

ئەی کار وەی تەور گەردوون پێم کەردەن
دەوران وە ڕاگەی هیچ کەس ناوەردەن

عەشق یار بیەن وە پاپێچ پام
ساتێ لە خەیاڵ نەدارۆم ئارام
خورد و خۆراکم هەر عەشق یارەن
زیکرم وەسف زولف سیای دلدارەن

نە فیکر مەزهەب نە فیکر دینم
هەر نە فیکر خاڵ ئەو مەه جەمینم

ئیمشەو من یەک جار گرانم بارەن
باڵای نەونەمام لێم نادیارەن
شەرارەی هیجران وەردانە جەرگم
وەتاقیق ئیمشەو میوانی مەرگم

چێش وا چوون ئیمشەو ماڵ بێ قەرارەن
باڵای شۆخ دۆس لێم نادیارەن

هەرچەند مانگەشەو ئیمشەو پڕ نوورەن
وەبێ تۆ قیبلەم بینابیم کوورەن
ئیمشەو ئازیزم، لێم نادیارەن
پێچی دەروونم، چون پێچی مارەن

***

شەو بەڵگەی تەنیاییە، لەبەر ئەوە بووە بەدروشمی ئاوارەیی. شاعیر ئەوەندە گێرووەدەی ئەم وشەیە بووە نەوەکو بەمانا بەڵکو بەڕوخساریش جارێک و دووجار دووبارەکردنەوەی تینوویەتی ناشکێنێ. قادر شیعرێکی هەیە پاش قافیەی «ئیمشەو»ە. لە شیعرەکەیدا باس لە خورپە و بزووتنەوەی ناوەوەی دەروونی دەکا، لەو کاتەی کە هەست بەتەنیایی دەکا و مێشکی بەتاڵ دەبێ و لە ژێر فەرمانی دڵیدا دەبێ. هەرچی لە دڵدایە مێشک دەیڕێژێتە سەر کاغەز، لە شیعرەکەیدا دەڵێ:

جە ئێش زامان شەوگارم ئیمشەو
گرفتارە دەرد ناغارم ئیمشەو

غەمزەدە و غەمین غەم وەکۆم ئیمشەو
مەینەتی ئافات رەنجەڕۆم ئیمشەو

هەر کۆ غەمێ بێ نە ئاڵەم ئیمشەو
گردین غەم بەستەن نە تاڵەم ئیمشەو

ئاهم نە گەردوون وەیەردەن ئیمشەو
ناڵەم نالەمش کەڕ کەردەن ئیمشەو

ستازەی بەختم بێ نوورەن ئیمشەو
بەدر دوو هەفتەم دەیجوورەن ئیمشەو

دەروونم کوورەی پڕ جۆشەن ئیمشەو
شەمع شای شادین خامۆشەن ئیمشەو

دڵەی مارانگاز هەم گیرەن ئیمشەو
هەردان جە ئاهم گڕ سەندەن ئیمشەو

خەیاڵم وەغەم پەرگەندەن ئیمشەو
هەردان جە ئاهم گڕ سەندەن ئیمشەو

کۆی غەم وە دەروون کۆبەستەن ئیمشەو
گەوری کۆ نەبۆ وەجەستەم ئیمشەو



مەر هەق بزانۆ وە ماڵم ئیمشەو
سەرتاپا چون کۆی زوخاڵم ئیمشەو

بازار شەوقم کەساسەن ئیمشەو
چون نەوفەل زەهرم نەتاسەن ئیمشەو

غەرق دەریای غەم پەژارەن ئیمشەو
جە دیدەت شادیم ئاوارەن ئیمشەو

یارم رەفیقم هەر غەمەن ئیمشەو
دڵم چاوگەی ماتەمەن ئیمشەو

لەو کاتەی کە شاعیر لە شیعری پێشوودا وشەی «ئیمشەو»ی کردۆتە پاش قافیە، لەم شیعرەی خوارەوەدا سەرەتای هەندێ لە دێرە شیعرەکانی بەوشەی «ئیمشەو» دەڕازێنێتەوە، دیارە ئەو شەوە تاریکە و چاو چاو نابینێ، چونکە یاری لێ دوورە، ئەگەر لێی نزیک بووایە پرتەوی یار شەوی بۆ دەکرد بەڕۆژ.

لە شیعرەکەیدا دەڵێ:

ئیمشەو قیبلەکەم لە من کەفتەن دوور
دوور بوو لە دیدەش دیدەم بییەن کوور

ئیمشەو نازارم لە من پێوارە
عەقل و فامی من بییەن ئاوارە

ئیمشەو قیبلەکەم دنیا و دینەکەم
مەحبووب شیرین مەه جە بینەکەم

باڵای زەریفش لێم نادیارەن
کوورەی دەروونم چون کوورەی نارەن

ئیمشەو مەواچی عەزا داریمەن
جە داغ دلبەر دەرد کاریمەن

ئیمشەو شەو نییەن داغ دەیجوورەن
جە دووری باڵات دیدەم بێ نوورەن

کاشکای نە کەردام ئی ئاشنایی
وە تەور نە چەشتام مەزەی جیایی

کاش وە ڕووی ئەزەل تۆ نە دیام وەچەم
تا وەی تەور قین نەبیام چەنی غەم

یاخوا کەس بادەی هیجران نەنۆشۆ
جەرگش وە ئایر حیرمان نەجۆشۆ

ئیمشەو وادەی مەرگ دەرد کاریمەن
بێ سەبر و بێ تاو بێ قەراریمەن

ئیمشەو لە دیدەم ئەسرین وەتاوەن
ئەسرین دیدەم ماچی لافاوەن

ئیمشەو یە پەی چێش خۆ لێم تەواسا
پەی چێش عەقل و هۆش لە من هەراسا

***

دووری لە نیشتمانیش هەندێ جار لە بەرهەمی قادر بەدی دەکرێ. شاعیر کە لە مەڵبەندی لە دایکبوون و شانۆی سەردەمی منداڵی دوور دەکەوێتەوە خۆی بەئاوارە دەزانێ و دەبێ بەبێگانە با ئەو جێیە تازەیە بەشێکیش بێ لە نیشتمانە گەورەکەی، بەم جۆرە بەکوڵ بۆ بەخت و چارەنووسی خۆی دەلاوێنێتەوە:

دەروون زوخاڵم
پەی دووری یاران دەروون زوخاڵم

دلداران دلان، چەند پەشێو حاڵم
هاوار بێ زێدم هاوار وەماڵم



سا جە داغ چەرخ ڕۆزگارەوە
تەکم دان وە لای کۆی هاوارەوە

دایم غەم وە کۆڵ نە هاوارەنان
خودا چەند بەدبەخت مەینەتبارەنان

ئەو گارم وەزام دووری یارەوە
کۆن دڵسۆزێ بەی وەهاوارەوە

هەر شەو تا وە ڕۆ هەر سۆب تا ئێوار
هاوارم بەرزەن هاوار نە هاوار

باوەرۆ نامەی قیبلەی وەفادار
بەڵ دڵ ساکن بۆ لادێ نە هاوار

وەرنە تا مەحشەر هاوارم بەرزەن
زایەڵەی زاریم وە هەزار تەرزەن

هاوار بێزار بی، وەی جە هاوارم
هاوار جە هاوار، دڵ بێ قەرارم

هاوار جە هاوار چێش مەکەروون
هاوار هاوارم وە لای کێ بەروون

هاوار هامسەران هاوارم بێ هۆن
هاوار جە هاوار هاوارپەرسم کۆن

هاوار مەترسوون جە رووی نەدامەت
هاوار بۆ زێدم تارووی قیامەت

هاوار مەترسوون هاوار بۆ وەجێم
چون گۆڕ غەریب کەس نەزانۆ پێم

پێم بۆ وە حەسرەت دیدار یاران
هاوارم بگنۆ وە سەر مەزاران

مەگەر هەر خاڵۆم شای نامەداران
ئیل بەگی بلووک خێل خانەداران

بپۆشۆ وەتەن خەڵات خانان
بنیشۆ وەشاد لە بەرزەبانان

ئەو بەڵگانەی بەناوی دڵدارییەوە خراونەتە بەردەم خوێنەر خەریکی وێنەکێشانی ناوەوەی هەست و نەستی شاعیرن، ئەمەش زیاتر بەلای ڕەشبینی و دووری لە ژیانی بەختیاری دەشکێتەوە، ئەم هەموو ڕەنجەڕۆییەی قادر ئەنجامی دڵدارییە پڕ لە سۆزەکەیەتی.

### شیعری کۆمەڵایەتی

ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی لە شیعری قادردا زیاتر لە شیعری «فەلەک بار دەرد»دا خۆی دەنوێنێ. ئەم شیعرە بێ گومان لە موناجات و پاڕانەوەییێک دەکا پڕ لە گلەیی و گازاندە. ئەگەرچی شاعیر ڕوو دەکاتە فەلەک (ڕۆژگار، چارەنووس، کردگار) بەڵام پاڕانەوەییێکە لە خوارەوە بۆ سەرەوە لەگەڵ خودا دەیکا. گفتوگۆییێکی مەنتیقی و فەلسەفییانەیە نویشکی ئەوە دەردەخا کە کەسێک گوناهی نەکردبێ بۆچ دەبێ هەژار و بێ دەسەڵات بێ!.

لە شیعرەکەدا دەڵێ:

فەلەک بار دەرد
تا کەی بکێشم سزای بار دەرد

وەهار دا نە تەپڵ زمستان وە یەرد
تا کەی جەوری دەرد ڕەنگم کەرۆ زەرد

مەر پێت نەیاوان دوود ئاهمەن
هەناسان سەرد سەحەر گاهمەن

شین و شەو ناڵین نامرادیمەن
کزەی کوورەی دڵ دوور جە شادیمەن



کزەی زۆخی و زام نادیاریمەن
قرچەی ئیستیخوان دەرد کاریمەن

مەر من جە ئوممەت موستەفا سیوام
چون سککەی خاریج قەڵب و ناڕەوام

من پەیکوڵ نە ڕای ڕەسووڵ ئەشەندم
نە دام پەی ئادەم گەواهی گەندم

کارنامەی مەشرووع ناما جە دەستم
پەی قەتڵ قابیل کەمەر نەبەستم

کوففار و کافر نەکێشام نە شار
زەکەریام نەکوشت بەمەودای مشار

بارەنەفت وە نار نەمروود نە پاشام
مەنجەنیق پەی مەرگ خەلیل نە تاشام

ناقەیی سالح، وە سیرقەت نەبەرد
میناکار تەخت فیرعەونم نەکرد

تیرم رشتەی هوون نافانە دامان
فوراتم نەبەست نە ڕووی ئیمامان

چەنی قەوم لووت مەی نۆشیم نەکەرد
پەی قەتڵ حوسێن سەرگۆشیم نەکەرد

ڕای کابەم نەگرت پەرێ حاجیان
تیغ نەدام نە فەرق فیرقەی ناجیان

راگەی عینایات نە کەردەنم بەند
باجم نە عەجەم ڕای نەجەف نەسەند

فەلەک من پەیرەو دینی نەبی بیم
چەند ساڵ نە پەی دین من مەکتەبی بیم

بێ راز بێ غەیبەت بێ کوفەی دین بیم
حەقیر و مەزڵووم رووی سەرزەمین بیم
هەقێش گەواهەن نمەک شناس بیم
حەککاک پڕ کار خاسە خەواس بیم

ئەر سزاوارم عیتابم تا کەی
ئەز موسوڵمانم عەزابم تا کەی

با رەحمەت بەیۆ بەجەستە و حاڵم
ناڵەم جێت وە بەرد تا کەی بناڵم

بەحاجەت نوور شای خەیرولبەشەر
ببەخشم بەنوور شەفیع مەحشەر

هەرچەند من عاسی مەعسیەت بارم
بەلوتف و یەکتا ئومێدەوارم
خالق تۆ قادر بەندە عەبدی تووم
نە دەرگانەی تۆ هەر ئیدەن ئەرجووم

بوویەر نە جورم ئەی (عەبدولقادر)
هەرچەند گوناهان لێش بییەن سادر

لەم شیعرەدا ئەگەرچی گلەییییەکە قادر لە گەردوونی دەکا و وا دەردەخا شایانی ئەوە نییە لە هەموو بەختیارییێکی سەر رووی زەوی بێ بەش بێ، بەڵام وەزعی خۆی بەمانای کۆمەڵ دەخاتە ڕوو و گلەییەکەی ئەوەیە بۆچ خەڵکی لە مافی ژیان بێ بەش بن!.

### شیعری وەسفی جوگرافی

سەرچاوەی بنچینەیی ئەم جۆرە شیعرە لە بەرهەمی قادردا زاراوەی جێگە و شوێنی جوگرافییە. ئاسۆی خەیاڵ و بیرکردنەوەی ئەوەندە فراوانە نەوەکو تەنیا ئەم ناوانە لە مەڵبەند و جێگەی ژیانی خۆی و نیشتمانی گەورەی وەردەگرێ، بەڵکو هەموو جێگە و شوێنی بەناوبانگی سەردەمی خۆی لەسەر رووی زەوی دەگرێتەوە.

بێ گومان مەبەستی شاعیر لە بەکارهێنانی ئەم زاراوە جوگرافییانە شتی تر بووە لە



چوارچێوەی ناوەکان دەچێتە دەرەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکا ئەم جۆرە شیعرەی بووە بەشیعری فێرکردن و زانیاری دان و ڕاستی خستنە ڕوو (شیعری دیداکتیکی)، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا مەبەستی ڕاستەقینەی کە دڵدارییە لە ناو پێچوپەنای ئەم ناوە جوگرافییانە هێشتا هەر بەدی دەکرێ.

بەرهەمی شیعری قادر دوو پارچە شیعری لیریکی لەم بابەتەمان بۆ دەور دەکاتەوە:

١- شیعری «شەماڵ»، شیعرێکی ستانداردتی ڕۆژهەڵاتییە، قارەمانی شیعرەکە (شەماڵ) پۆستەچیی دڵدارە نامەی بەدلبەر دەگەیێنێ، بەسەر چیا و هەرد و دۆڵ و قەدپاڵ و ڕووبار و کانیاو و گوند و ئاوایی و شینایی و دەرودەشت و ڕێگەوبان تێدەپەڕێ، لە ڕێگەی یادی ڕۆژگارانی دێرینی ڕابردوو دەکاتەوە کە هەر ئەم شەماڵە خۆی نامەی عاشقانی وەکو فەرهاد و قەیس و حەیدەر و وامیقی بۆ شیرین و لەیلا و عەنبەر و عەزرا بردووە تا دەگاتە مەڵبەندی دلبەر (پەریزاد) لە پاوە و پەیامی دڵدار (قادر)ی پێ دەگەیێنێ. لەو کاتەدا شاعیر ئاوارەی کاشتەر دەبێ و پەریزاد لە پاوە بەجێ دێڵێ.

سەرەتای شیعرەکە بەم جۆرەیە:

شنۆی سەحەرخێز
شنۆی سەرکاوان شنۆی سەحەرخێز

وەهار وەش رەونەق، زمستان وەبێز
مەحرەم وەحەرەم سەرای شای پەروێز

پەیک بێستوون دەلیل دوجەیل
مەست بۆی شیرین کەیل جە عەتر لەیل

سەنای تای توغرای زولفی تەتاران
هام دەرد و هام ڕاز دیدە خوماران

دەوای ئێش و زام دەروون پڕ دەردان
هام شەریک دەرد هەناسە سەردان

شاعیر لەگەڵ بای شەماڵ لە سەرەوە دەڕوانێتە خوارەوە، واتە لە ئاسمانەوە تەماشای زەوی دەکا، چونکە لەگەڵ شەماڵ پێکەوەن، شاعیر ڕێبەری شەماڵ دەکا، بەم هۆیەوە ناوی هەموو ئەو شوێن و مەڵبەندانە دەبا کە شەماڵ بەئاسمانیاندا تێدەپەڕێ تا دەگاتە پاوە دوا

مەنزڵگای پەریزاد و پەیامی شاعیری پێ دەگەیێنێ:

ئەوسا روو بنیە نە رووی پاوە شار
ئێد فەرزەن شەماڵ یەگشت بەر کەنار

سا تۆ خودا شەماڵ سەر باوەر راسی
مەبۆ تۆ قیبلەم چە تەور بشناسی

جەودما ماوەر عوزر و بەهانە
نامش وە شەش حەرف نەی فەردبوانە

پەریزاد نامەن پەری دەستوورەن
سەرتاپا بێ عەیب، هەر ماچی حوورەن

پەری دەستوورەن نازک ئەندامەن
شۆخەن شیرینەن پەریزاد نامەن

(قادر) تا زیندەن غەم نە خەیاڵەن
جان فیدای لەیلەن عەبدی شەماڵەن

***

قادر بەشێوەیەک گیرۆدە و هۆگری پەریزاد بووە نازانێ چۆن ئەو جوانە بەخەڵکی بناسێنێ. زۆر ناوی دەهێنێ، ئارەزووی ئەوە دەکا خەڵکی بیناسن تا دەگاتە ئەوەی بڵێ ناوی لە شەش تیپ پێکهاتووە بەئیملای کۆنی نووسینی کوردی (پریزاد)ە.

شاعیر هەتا لەسەر ڕووی زەوییە گیانی قوربانی پەریزاد و خۆشی عەبدی بای شەماڵە چونکە پەیامی دڵداری پێ گەیاندووە.

٢- شیعری «عەلەیکەسەلام» نموونەی وەرگرتنی ئەدگار و ڕەوشتی جوانی دلبەرە کە لە هەندێ ناوچە و شارەکانی گێتی خۆیان دەنوێنن، بەڵام شاعیر بەوە نەوەستاوە تەنیا ناوی شارە کۆنەکانی ڕۆژهەڵات بهێنێ کە دروشم و نیشانەی مەبەسێکی جوانی بوون، وەکو قازان، کشمیر، کابول، شیراز، خوتەن... هتد، بەڵکو ناوی لەندەن، پاریس، ڕەوان (ئەریڤان = یەریڤان) و هی تریشی هێناوە.

شاعیر هەر شارێکی لەم شارانە کردووە بەدروشمی ئەندامێکی جوانی دلبەر، یا



ڕەووشت و کارێکی دڵگیری کە خۆشەویست لەسەر شانۆی ئەڤین و جوانی نواندوویەتی. بەم پێیە ئەو شارانە یا شوێنە جوگرافیانەی کە لە کۆن و نوێ و هەموو لایێکی سەر ڕووی زەوی هەڵبژاردووە بەسەر قژ و زولف و ئەبرۆ و موژە و لووت و گۆنا و لێو و سنگ و مەمک و ناوک و کەفەڵ و ڕان و ئەژنۆ و لاق و پێ و باڵا و خەت و خاڵی دلبەر دابەش کردووە؛ هەروەها نیگا و چاوهەڵتەکاندن و خەندە و ئیشارەت و ماچوموچ و مووچڕک و ناز و لەنجە و لار و وەفا و بۆن و عەبیر و لووت بەرزی و قسەی خۆشی دلبەری لە شارانی تر بەدی کردووە، بەم جۆرە لە شیعرە ڕەنگینەکەیدا دەڵێ:

عەلەیکەسەلام فریشتەی ئەنوەر
رشتەی لیقای هەق حەیی تەوانگەر

وەش ئامای وە خەیر ئەی بەرگوزیدەم
سا قەدەم بنێ وەبان دیدەم

ئێران تا توران دنیا سەرانسەر
پایەندازت بۆ سەوڵ نازپەروەر

ئەستەموول پێشکەش نیم نیگای دیدەت
ئەسفەهان ئەبرۆی قەلەم کەشیدەت

مووسل وە مەودای موژەی خەمیدەت
بەسرە وە بینی دڵ پەسەندیدەت

حەلەب وە حەڵقەی حەی تار گێسووت
قازان وە قەد بەند باریکتەر جە مووت

پاریس وە پرشەی پێشانی پاکت
خاوەر وە خەرام خیشم غەمناکت

شام وە شەرت و شۆن وەفای شەریفت
بەغدا وە بەرزی بالای زەریفت

کشمیر وە گۆنای گوڵ غونچەی ڕەندت
کابول وە کالای ئالای پەسەندت

شیراز وه شوعلەی شەوق شەمامت
جام وه بۆی بخور عەبیر جامت

چین وه چین زولف سیای چین چینت
ماچین وه یەک ماچ جام جه مینت

زەڕنه زەڕەفشان تەشریف ئاوردەت
تاران وه تای ناز وه تۆمار کەردەت

خەتا وه خەندەی مەیل سالآنت
خوتەن وه نوختەی ورده خالآنت

قەندەهار وه قەند غونچەی دەهانت
یەمەن وه یەک حەرف لەعل لەبانت

غەزنه وه غەمزەی هیچ کەس نەکەردەت
نەی شابوور وه ناز تا وه سەربەردەت

خۆی وه خولووقەت خولق و خۆی گەرمت
سەلماس وه سینەی سفید نەرمت

تەبریز وه ڕێزەی ڕاز قەشەنگت
داغستان وه داغ تەئسیر دەنگت

نەهاوەند وه ناف موشک تاتارت
گەنجه هەم وه گەنج شاهان نەدارت

ڕەوان وه نەرمی بلوور ڕانت
وه گەردنم بۆ فیتنەی چەمانت

زابول وەزانووی ساف سیمینت
غەم وەردەی باهووی قەیس غەمگینت



سابلاغ هەم وەساق پاک بێ خەوشت
کاشان وه ئەنگوشت سەرپەنجەی کەوشت

قەزوین وه قیمەت قۆڵوانەی قۆڵت
لەندەن وه تای لۆنگ زەڕباف کۆڵت

لاهوور و لەنگوور وه لەنجە و لارەت
سەمسوون تەمام فیدای ئیشارەت

کوردستان وەگەرد تۆز پالآکەت
کرماشان سەرگەرد بالآی ئالآکەت

هەفت ئیقلیم تەمام نەونەمام تۆ
نەدارۆ قیمەت بەهای بالآی تۆ

مۆدەی عومری وێم هامەران یاران
هەر ئەورۆ وەشاد دنیام وه یاران

جەوساوه قیبلەم سلآمش کەردەن
زیندەگیم جه حاڵ مەردەن وه یەردەن

(قادر) وێنەی تەیر بێ وەدامەوه
تا مەحشەر بەندەن بەو سلآمەوه

جگه له قادر شاعیری کوردی دیکەش هەیه لەم بابەته شیعرەیان نووسیوه. بۆچوونەکانیان له یەکتری دەکەن له لایەن ناو بردنی ئەو شار و ئاواییانەی خاسیەتێکیان تێدا دۆزیوەتەوه بۆ بەراووردکردنیان لەگەڵ ئەندامێک له ئەندامەکانی لەشی یاری خۆشەویست. لای قادر ناوی هەندێ شار هاتووه، شاعیره کلاسیکییەکانیش له شیعردا ناویان هێناون. سەرەڕای ئەمانه هەندێ له شارانی وڵاتی کوردەواری ناویان هاتووه، له سەرووی هەموویانەوه ناوی نیشتمانه گەورەکەی خۆی «کوردستان».

## بەشی شازدەم

# شیعری ئێپیکی قادر

بەرهەمی شیعری قادر دوو پۆییەممان بۆ دەور دەکاتەوە «جەنگی کوللە و ئاینەمەل» و «سەما و زەمین».

### جەنگی کوللە و ئاینەمەل

یەکەمین هەواڵ لە بابەت ئەم بەرهەمەوە بەناوی «جنگ ملخ با آتش ملوچ = جەنگی کوللە و ئاینەمەل» لە لایەن ڤ. مینۆرسکییەوە لە ماوەی جەنگی دووەمی گیتی (١٩٤٣) بلاو کراوەتەوە، بەهۆی ئەو دەسنووسە کوردییانەی دەستی خستبوون، بەشێکی ئەم چیرۆکە شیعرییەی دۆزییەوە، بەڵام لەو سەردەمەدا نەزانرابوو بەرهەمی میرزا قادری پاوەییە.

جەنگی کوللە و ئاینەمەل چیرۆکێکی شیعری ڕەمزییە. ژمارەی دێرەکانی لە دەوروبەری سێ سەد دێرە شیعری مەسنەوییە. شاعیر ڕووداوەکانی خستۆتە نێو ناوەڕۆکی قارەمانی و سوارچاکییەوە، بەشێوازی کۆمیدی دەری دەبڕێ.

ئەو شێوازە کۆمیدییە بەزۆری لە ئەدەبی ئەورووپیدا بەدی دەکرێ، واتە بابەتی ڕووداوەکە درامییە و شاعیر شێوازی کۆمیدی بۆ هەڵبژاردووە. بێ گومان قادر وەکو مینۆرسکی بۆی دەچێ، زۆر ڕێی تێ دەچێ ئیلهامی ئەم چیرۆکەی لە هێرشە گەورەکەی کوللە وەرگرتبێ کە لە ساڵی ١٨٨٢دا لەم ناوە ڕوویدابوو. بەڵام مەبەسی قادر داهێنانی کارێکی ئەدەبیی ڕەمزی بووە، ناوەڕۆکی زیاتر لە مانایێک هەڵبگرێ.

هەڵبژاردنی دوو جۆرە گیانلەبەر، هۆزی کوللە و ئاینەمەل بۆ کارێکی تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی و داهێنانی دراماتیکی تێدا بێ، خۆی لە خۆیدا ئەدگاری سمبۆلی دەداتە کارە ئەدەبییەکە، شاعیریش شێوازی کۆمیدی هەڵدەبژێرێ بۆ بەئەنجام گەیاندنی بەرهەمەکەی. دیارە کوللە و ئاینەمەلیش هەریەکەیان بەشێوەیێک دروشمی قاتوقڕی و نەهاتین؛ چونکە هەموو جۆرە ڕووەکێکی بەکەڵک لە بن دێنن، ئەم کردەوەیە دەبێتە هۆی هەژاری و برسییەتی لە کۆمەڵی کشتوکاڵی ئەو سەردەمەی ناوچەی هەوراماندا، هەروەها دەبێ ئەوەش بزانین کە کوللە زیانی گەلێ زیاترە بۆ کشتوکاڵ و ئاینەمەل ئەگەرچی زیانیشی هەیە، بەڵام کردەوەی بەچاکە دەگەڕێتەوە، چونکە کوللە لەناو دەبا.



ڕەنگە خەیاڵی پیاو بۆ ئەوە بڕوا مەبەس لەو دوو لەشکرەی هۆزی کوللە و ئاینەمەل هێزی ستەمکاری عوسمانی و عەجەم بێ، بۆ ئەمەش دیارە کورد لە مێژووی تازەیدا بەتایبەتی لە دوای جەنگی چاڵدیرانەوە (١٥١٤) لەبەر ئەوەی بەگشتی چارەنووسی کەوتە ژێردەستی عوسمانی و عەجەم، باوەڕی بەسوڵتانی عوسمانی و شای عەجەم نەبوو. ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان پەنای بردبێتە بەر یەکێکیان لە دژی ئەویتر، تەکتیک بووە و هیچی تر. جا ئەگەر خەیاڵمان بۆ ئەوە بچێ کوللە عوسمانی و ئاینەمەل عەجەم بن وەکو لە ناوەڕۆکی کۆمیدیاکە دەردەکەوێ، مانای ئەوەیە شاعیری کورد لە هەڵوێستێکدا پێویستی بەوە بووە لایێکیان بەدۆست و لایەکەی تریان بەدوژمن بزانێ.

لە ڕوویێکی دیکەوە لەوانەیە قادر ویستبێتی ئاینەمەل لە ڕۆژهەڵات و کوللە لە ڕۆژئاوادا ببینێ. لەشکری ڕۆژهەڵات لەشکری پرتەوی ڕۆژ و ڕووناکییە، لەشکری ڕۆژئاوا لەشکری تاریکی و شەوی ڕەشە؛ لەبەر ئەوە بەرێکەوتیش بێ، عەجەم لە ڕۆژهەڵاتی پاوە و عوسمانی لە ڕۆژئاوایدا بووە، ویستوویەتی ئەم دیاردەیە وەربگرێ وەک بەڵگەیێک بۆ هێزی چاکە و خراپە، دیارە ئەمە هیچ پێوەندییێکی بەچاکە، یا خراپەی هەردوو دەوڵەتی عەجەم و عوسمانییەوە نییە، ئەگەر بمانەوێ بەشوێن ڕاستیشدا بگەڕێین هەردوو دەوڵەتەکە کوردیان دەچەوساندەوە.

لەگەڵ ئەم هەموو بۆچوونانەدا، ڕەنگە بابەتەکە لێکدانەوەی دیکەش هەڵبگرێ. ئەم کۆمیدیایە وەکو بەرهەمێکی ئەدەبی ڕەمزیی بەرز خۆی لە ئەدەبی کوردیدا دەنوێنێ؛ چونکە هونەروەرانە و داهێنەرانە کۆمەڵی هۆزی کوللە وەکو دوژمنی کۆمەڵی ئادەمزاد دەخاتە ڕوو.

قادر بۆ گێڕانەوەی ڕووداو بەشێوەیێکی هونەری داهێنراو سوپایێک لە کوللە دروست دەکا، ئەم سوپایە بێگانە و بەدفەڕە، سەربازی لەشکر هەموو بەرهەمێکی کشتوکاڵی هەڵدەلووشێ، زیان و خراپەی بۆ خاک و مەڵبەندی شاعیر هەیە تەنانەت بەئاوایی پاوەشەوە.

شاعیر چیرۆکەکەی بەپاڕانەوە و موناجات دەست پێ دەکا:

یا کەریم حەق یا کەریم حەق
یا فەرد بێچوون یا کەریم حەق
یا تەنیای بێ باک مەوجوودی موتڵەق
یا سازندەی چەرخ بێ ستوون مۆڵەق

یا ئاگا جه دەنگ خشەی پای پەخشە
یا نەزاو نەمیر جە کەس نە لەخشە
یا تای بێ هەمتا قەدیم و ئەقدەس
سیوای تۆ هیچ کەس نییەن بالادەس
یا ڕەونەق نمای گولاّن وەش بۆ
یا زوبان ئامۆز دەیریان کۆ

ئینجا لە خوا دەپاڕێتەوە، خەڵکی لە ستەم و کردەوە ناهەموارەکانی کوللە ڕزگار بکا:

یا مالیکەلمولک سەما و سەربستات
جە دەست مەلەخ پێمان دەی نەجات
مەعلوومە بێ تۆ پەشێوەن حاڵم
یە جەور مەلەخ یە جەفای زاڵم
یەک ڕۆ بێ خەوەر مەخلووق پاوە
چێش مەنزڵ بەگێ ئاما جەلاوە
تیپێ چون جەیحوون مەلەخ نمانا
عالەم هۆش کەرۆ وەهیچش زانا

وەکو دەردەکەوێ ئەو کۆمەڵە کوللەیەی لە پێشانا هاتبوون بۆ پاوە، مەبەسیان بەسەرکردنەوەی ناوچەکە بوو لە ڕووی تۆپۆگرافییەوە بەمەبەسی تاکتیکی سوپایی، پاش ئەوەی شارەزاییان لە ناوچەکەدا پەیدا کردبوو، توانیبوویان تەکتیکی هێرش بردنی داهاتوویان دیاری بکەن، ئینجا لە دوای سێ ڕۆژ گەڕانەوە لای سوپاسالاریان (شاهنشایان) و هەموو شتێکیان بۆی ڕوون کردەوە.

لەشکری کوللە هێرشی برد، وەک لافاوی زێی جەیحوون، لێشاوی هاتە خوارێ. ئۆردوگا دروست کرا و بارەگای فەرماندە (دیوانی شا) دیاری کرا. ئاسمانی ناوچەکە کوللە دایگرت، بەری ڕۆژ گیرا، تیپ-تیپ سەنگەریان گرت، لە هەردوو بەرزاییدا نوختەی پاسەوانییان دانا. لە پاشانا شای کوللە فەرمانی دەرکرد بۆ کۆبوونەوەی گشتی. ئاسمان و زەوی خرۆشان، لە کوللە بەولاوە هیچی دیکە نەدەبینرا، تەپڵ و کەڕەنا و مۆسیقای سوپای کوللە گێتی هێنایە لەرزین:



شا مەست و سەرەوەش جە پیاڵەی مەی
منیش نە خاتر کەیکاووس کەی
باقی سەرداران تیپ-تیپ سەف کێشان
مەئموور بێن بەئەمر پادشای وێشان
میرالا و مونشی و ئێلچی و باشچاوەش
هەر کام وە چەی وێش گرتش وە باوەش
حەیتە و مولازیم قۆڵچی و سەرعەسکەر
وەکیڵ و نایب ما باقی لەشکەر
سەردار و سەرتیپ شاتر و نازر
نەپای تەخت شا جەم جەم بی حازر
ئەر تۆمار وەسف شای مەلەخ وانی
مەزانی جەلال شای کەی کەیانی
نە قەیسەر جە ڕۆم نە خاقان جە چین
نە سوپای نەمروود نە دارای بێ دین
نە دەور فیرعەون نە زۆر شەدداد
نە قەوم سەموود نە تایفەی عاد
نە زۆر زوحاک بە دۆش سیاحەی
نە حوکم ڕەواج کەیقوباد کەی

لە پاش کۆبوونەوە و لە ئەنجامی گفتوگۆ، شای کوللە فەرمانی دەرکرد، سامانی خەڵکی ناوچەکە تالان بکرێ و بەسەر تیپەکانی سوپادا دابەش بکرێ، بەم جۆرە ئاوایی و گوندەکان دابەش کران:

میراوە، درایە وەزیر، دێڵێ، بۆ باشچاوش، زەروارە، بۆ سەرتیپ، گەوێڵێ، بۆ سەردار، پشتە بۆ مونشی و میرالا، گەلاخوان بۆ ئێلچی، کەلیان بۆ سەرهەنگ، هالە بۆ مولازیم، سەبارە، بۆ پاسەوانیی قەلا، مەیدان، بۆ قۆڵچی، خانەگا، بۆ وەکیڵ، دەرەموو، بۆ گزیر. ئینجا تیپی تایبەتی شا و بارەگا لە دەرەوەی زێد جێگەی دیاری کرا و مەتبەخیش لە کانی با، دروست کرا. سەربازانیش لە دەشتی کۆڵک و کۆڵە سەنگەریان بەست و خیوەتیان هەڵدا. لەشکر بەیداغی لە هەموو لایێک هەڵکرد و دەسەلاتی بەسەر

پیـــــر ڕەوشـــــەن دڵ منیـچ دەخــــیلم
ڕاگـــە گـــوم کـــەردە و وێڵ و زەلیلم
ئێـــســـتـــە وەهەرحــاڵ پڕ خـەجـاڵـەتم
خـــاکم وەســـەر بۆ پەی قـــیـــامـــەتم

***

(حـەریق) کـافی یەن پەی دنیـا و دینم
سـەگی ئاسـتـانەی شـای شـەمـسـەدینم

واتاکەی:

بەیانی کاتی سپێدە لێو غونچەیێکم دی
لە ناو پەردەی پاکیدا خۆی دەجلواند
بەسەد نەزاکەت بەقسە هات
بەیەک ناز داوای سەد نیازی کرد

***

بەدەمی ئەو گوڵە تازە و ناسکە
گیانم لە عەزاب دابوو، دڵ لەشین و شەپۆڕ دابوو
بەپەنجەی ناز نیقابی لەسەر ڕووی لابرد
ئاگری لە ناخی جەرگم بەردا

***

دەک بای شەماڵ فیدای سروەی ڕێگات بم
ئەی پیر بەفیدای سروەی ڕێگەی تۆش بم
ڕووناکی چاوم لە تۆزی بەرپێتان دایە
چاو و بیناییم بەلاّ گەردانی بالاّتانە

***

ڕەحمێ بە من بکە لە هەموو حاڵەتێکدا
لە عاسی بوون و هەموو کارێکی خراپ
ئەگەر ڕەحم بەلەش و کردەوەم نەکەی
لە داخی عیسیان و دەروونی سووتاوم



وەک پیری دانا مەعدوومی مەحرووم
فەرمانی ئامۆژگاریی کەسێکی زیرەکە

***

پیری ڕۆشنبیر منیش دەخیلتم
ڕێگەم ون کردووە وێڵ و زەلیلم
ئێستا بەهەموو جۆرێ زۆر خەجاڵەتم
خاکم بەسەرە تا ڕۆژی قیامەت

***

(حەریق) ئەوە بەسە بۆ دنیا و دینم
سەگی دەرگای شا شەمسەدین بم

لەم شـــیـعـــرەدا ئەوە دەردەکـەوێ لە هەمـوو ڕوویێکەوە حـەریق شـارەزای تەواوی لە ئەدەبیاتی گۆرانزەمیندا بووە. هەرچەند شاعیر نووسینی شیعری بەم دیالێکتە نەکردووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم قەسیدەیە نموونەی بەرهەمی شاعیرێکی قەڵەم ڕەنگینە لە شیعری دیالێکتی گۆرانیدا. شێوازی مەولەوی لەم شیعرەی حەریقدا ڕوون و ئاشکرایە. لەم شیعرەدا شاعیر ناوی مەولەوی بەمەعدووم یاد دەکاتەوە، وەک نازناوی دووەمی مەولەوی لە شیعردا. بەم جۆرە حەریق ئەم شاعیرە گەورەیە بەپیری دانا و کەسێکی خێر نەدیو لە ژیانیدا بەخەڵکی دەناسێنێ.

**تاک و چوارین**

حەریق بایەخی بەبابەتی تاک و چوارین داوە. ئەم جۆرە قاڵبە شیعرییەی بۆ تێبینییێکی کورت بەکارهێناوە. زۆربەیان لە قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و هەڵوێستی کۆمیدی و وەرامی ژیرانەی پرسیارێکی ناهەموار و سەر لێ شێواندن و گەلێ شتی دیکەن دەکەن.

**هەندێ لە تاکەکانی حەریق**

شاعیر لە تاکێکیدا دەڵێ:

تاڵ و شیـرین پێکەوە نەمـدیوە چا بێ چا نەبێ
هەر کەسێکی هەمنشینی چا نەبێ پێت چا نەبێ

لەم دێرە شیعرەدا حەریق جگە لە مانا لە ئاواز و مۆسیقای وشەکانی «چا» و «چاک»

داهێنانێکی ڕەوانبێژی دروست کردووە. ئەم دێرە شیعرە وەک قسەی نەستەقێک لە کۆمەڵی کوردەواریدا لەسەر زاری هەموو کەسێکە خوێندەوار و نەخوێندەوار.

لە تاکێکی دیکەیدا حەریق دەڵێ:

سێ کەس بەتەلەب بوون، لەتەڵە چوونەوە جارێ
ڕابردووە تەڵەب بێنەوە تا فەسڵی بەهارێ

بەهار ڕەمزی سەیران و خۆشییە، هەموو قەرزێک ئەگەر بەئاسانی دەست نەکەوێتەوە و لەپڕ بگاتەوە دەست خاوەنی بۆ ئەو کەسە وەک بەهار هاتبێ وایە. ئەم شیعرەی حەریق وەک پەندی پێشینانێک دەکەوێتە ڕوو.

لە تاکێکی دیکەیدا شاعیر دەڵێ:

گوتم بۆسەم دەوێ ڕووی خۆم بەئاوی ڕووت گوڵاو ناکەم
گوتی بۆسەت دەوێ شێتە منیش ڕووی خۆم گڵاو ناکەم

حەریق ئەوەندە دلبەری خۆش دەوێ داوای ماچی لێ دەکا، بەڵام دەزانێ نایداتێ. ئیتر دیارە ڕووی شاعیر لە گوڵاوکردنی بەماچ بێ بەش دەبێ. وەرامی دلبەریش هەر ئەوەیە دەڵێ منیش ڕووی خۆم گڵاو ناکەم، کەچی شاعیر بەمەش ڕازییە. حەریق لەم تاکەدا مەبەسی «گوڵاو» و «گڵاو»ە لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە.

## هەندێ لە چوارینەکانی حەریق

شاعیر لە چوارینێکیدا دەڵێ:

هەر وەکو بیستوومە بەینێکە لە ئەم بەر ئەم بەری
بۆ مەلای مزگەوتی سوور وا چاکە تۆ بی لەوبەری
پێ لە حاشا بوو لەگەڵ من مەحکەمەی قازی دەچوو
کاکی سەردەشتی بەتەڕدەستی وە سەر جێگا پەڕی

حەریق بەهەواییێکی کۆمیدییانە باس لە مەلاییێک دەکا، بێ گومان ئەو مەلایە خۆیەتی. پیاوێکی ئەوەندە بێ دەسەڵاتە هەموو کەس دەتوانێ لێی ببا. ئاماژە بەوە دەکا چۆن دادگا خەریک بووە دوایی بەمەسەلەی بەدووکەوتنی کچە ئەرمەنی بێنێ ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی مەسەلەی تاشینی سمیلی حەریق بچێتە ناو هینەکەی کچە ئەرمەنییەوە. بەم ڕەنگە تۆڵەی شاعیر نەسەنرایەوە. لە چوارینێکی دیکەیدا حەریق دەڵێ:



عەزیزم تۆ دەزانی من لەبەرچاوت کەر و گێژم
لەبەر ناپیاوی خەڵکی تێدەگەی موحتاجی گوێ درێژم
سوار نیم و پیادەم چۆن دەبێ وەسڵ و مولاقاتم
وڵاغ دەس ناکەوێ هەر بۆ تەبەڕوک خۆی سەراوێژم

لەم چوارینەدا حەریق لە قسە قۆشمەییەکانی ناکەوێ، هۆی کەری گێژی خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی پیاوی ساغ دەست ناکەوێ. کە ئەمە نەبێ پێویستە هانا بۆ گوێدرێژ ببا، ئەمەش دەست ناکەوێ، ئیتر چۆن دەتوانێ بگاتە ئەوەی دەیەوێ بیگاتێ.

شاعیر لە چوارینێکی دیکەیدا دەڵێ:

کاغەزی وا زۆر دەهاتن زوو لە هەورامانەوە
وەک گەڵا تالوو هەموومان خستە ئاگردانەوە
دوێنێ دەتگوت یووسفی سیددیقی میسری دین ئەوە
ئەمڕۆ باتداوە چ عەیبێکی هەیە بادانەوە

حەریق دەڵێ نامەی بێ ناوەڕۆک نرخی نییە، پێویستە ببێتە خۆراکی ئاگر. نامەی لەم جۆرە وەکو ئەوەیە هەرچەندە چاکەت کردبێ لە دواییدا باتدابێتەوە، هەموو کردەوەت دەبێ بەخراپە، هەروەها بەتەوسەوە ئەوە دەردەبڕێ ڕاڕایی و بادانەوە لە ڕەوشتی ئادەمزاددا خەوش نییە!.

***

مەلا ساڵحی حەریق یەکێکە لە گەورە شاعیرانی کلاسیکی کورد. بەرهەمی شیعری بەقەوارە زۆر نییە. کێش و قافیەی شیعری دەوڵەمەند نییە، واتە لە بەحرەکانی عەرووز تەنیا چوار بەحری بەکارهێناوە. دەنگەکانی قافیەی کەمن. قافیەی تیپە تایبەتییەکانی زمانی کوردی و عەرەبی نییە، تەنیا دەنگێکی کوردی نەبێ «ێ». لە هونەر و بابەت و ژانری شیعری کلاسیکی بەزۆری غەزەل و قەسیدەی دروست کردووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شاعیرێکە لە گەورە شاعیرانی ناوەڕۆکی شیعریان بریتییە لە دڵداری و وەسف و دانایی و فەلسەفی. بەگشتی مانای شیعری لە ڕووە، بەڵام شیعری داخراویشی هەیە. کاری نالی بەسەر هەندێ لە شیعرەکانییەوە هەیە. حەریق یەکێکە لەو شاعیرانەی ڕێچکەی شیعری نالی و سلێمانی و بابان و شارەزوور و هەموو کوردستانی باشووریان وەرگرتووە و بەشیعرە ڕەنگینەکانیان دیوانی شیعری کوردییان دەوڵەمەند کردووە.

## بەشی هەژدەم

# ئەدەب

**١٨٥٩ - ١٩١٦**

## ژیان و خاسیەتەکانی شیعری

### ژیانی ئەدەب

عەبدوڵڵا بەگ کوڕی ئەحمەد بەگ کوڕی ڕۆستەم بەگ کوڕی باباعومەری کوڕی سەیفەددینە. نازناوی شیعری «ئەدەب»ە. بەڕەسمی لەقەبی «میسباح-ددیوان»ی لە محەمەد عەلی شای قاجار وەرگرتووە لە کاتێکدا وەلی عەهدی شای ئێران بووە و لە تەورێز دانیشتووە. لە مەڵبەندی خۆی و لە ناو کوردەواری بەعەبدوڵڵا بەگی میسباح-ددیوان و ئەدەب ناوبانگی دەرکردووە.

عەبدوڵڵا بەگ لە ساڵی ١٨٥٩ لە گوندی ئەرمەنی بلاغ لە ناوچەی موکریان لە دایکبووە. ئەم گوندە کەوتۆتە ئاقاری سێ کوچکەی ئاواییەکانی بۆکان و میاندوا و ساینقەڵا. ئەدەب لە بنەماڵەیێکی دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتوو و خوێندەوار بووە. لە تەمەنی حەوت هەشت ساڵیدا مامۆستای تایبەتی بۆ گیراوە و لە ماڵەوە فێری خوێندنی کردووە، ئەو مامۆستایە ناوی مەلا فەیزوڵڵا بووە، قورئان و بەرنامەی سەرەتایی حوجرەی مەلایانی بۆ دەور کردۆتەوە. لە پاشانا مامۆستای زمانی فارسی و خۆشنووسی بۆ گیراوە. پرۆگرامی ئەم جۆرە مامۆستایە کە میرزایان پێ وتووە بریتی بووە لە پێگەیاندنی ڕۆشنبیرێک ئاگاداری زمانانی فارسی و کوردی بێ و شارەزایی لە زانستییەکانی دەرەوەی بەرنامەی حوجرە هەبێ کە تەنیا زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبییە. ئەم جۆرە خوێندەوارانە لە دیوەخانی دەوڵەمەنداندا دەبوونە نووسەری ئاغاکان و دەوری سکرتێری ئێستایان دەدی.

لە تەمەنی بیست ساڵیدا باوکی دەینێرێ بۆ خوێندن لە شاری تارانا. ماوەیێکی کەم لەوێ دەمێنێتەوە، هەرچۆنێ بێ فارسی باشتر فێر دەبێ و ئاسۆی بیری لە شارێکی گەورەی وەکو تاران زیاتر فراوان دەبێ. بەهۆی ژیانێکی ئورستۆکراتی پێوەندی کۆمەڵایەتی لە گەلێ لایەنەوە ڕەنگاوڕەنگ بووە، گەشتی لە هەندێ ناوچەکانی ئێران بووە



بەتایبەتی تەورێز. خۆی و عەلی بەگ سالار سەعیدی برای کە ئەندامی مەجلیسی شوورایی میللی (پەرلەمانی)ی ئێران بووە ئاشنایەتییان لەگەڵ قونسوڵی ڕووس لە تەورێز کوردناسی ناودار ڤاسیلی نیکیتین بووە. هەروەها گەشتی ڕووسیا و پۆلۆنیای هەیە بەتایبەتی شارە گەورەکانیان. وا باوە هۆی ئەم گەشتەی دەرەوەی وڵات لەبەر ئەوە بووە لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا تووشی نەخۆشی لەرزۆکی (ئیفلیجی، شەلەل) بووە، بۆ تیمارکردن ڕووی کردۆتە ئەو وڵاتانە.

ئەدەب گەشتی ناوچەی شارەزووری هەیە لە ساڵی ١٩١٠ لەگەڵ هەندێ لە بەگزادەکانی موکریان و مەریوان سەرێک لە ئاوایی شانەدەری دەدا، ماوەیێک میوانی خەلیفە ڕەشید ناوێک دەبێ، گۆیا لەم گەشتەدا ئەدەب بەبینین یا بەنامە پێوەندی لەگەڵ تاهیر بەگی جافی شاعیردا بووە.

ئەدەب لە زانینی زمان پێشکەوتوو بووە، جگە لە زمانی دایک زمانەکانی فارسی و عەرەبی و تورکی زانیوە، شارەزایی لە زمانی ڕووسی و فەرەنسی بووە. بەڕاستی ئەم شاعیرە لە ڕووی زانیاری و ڕۆشنبیرییەوە وەک هەڵکەوتوویێک دەکەوێتە بەرچاو تەنیا شاعیری چاک نەبووە. بەڵکو یەکێک بووە لە خۆشنووسە بەهرەدارەکان، هەندێ لە شیعرەکانی کە بەخەتی خۆی نووسراونەتەوە نرخی مۆزەیی تایبەتی خۆیانیان هەیە. جگە لەوە ئەدەب بایەخی بەنەخش و نیگار و وێنەکێشان داوە، بەقەڵەم و بۆیاغ وێنەی ڕەنگاوڕەنگ و هێڵکاری ڕەش و سپی کێشاوە. لە دەوروبەری ژیانی شاعیر کامێرا (ماکینەی وێنەگرتن) پەیدا بووبوو، بەرهەمی ئەم جۆرە هونەرەش ماوەتەوە. سەرەڕای زانینی ئەم جۆرە هوانەرانە ئەدەب بایەخی زۆری بەمۆسیقا داوە، تار و کەمانچەی بەکارهێناوە شارەزای دانانی نۆتەی مۆسیقا بووە، لەوانەیە دەنگ خۆشییەکەشی بووبێتە هۆی ئەوەی بایەخ بەمۆسیقا بدا یا شیعری گۆرانی میللی ئامێز بهۆنێتەوە.

ئەدەب کەسێکی دڵ تەڕ بووە، حەزی بەڕاووشکار و کۆڕی ساز و سەمتوور و بەزموڕەزمی ئورستوکراتییانە بووە، چێژی لە خواردنەوە وەرگرتووە هەنگامی سەرخۆشی پێ خۆش بووە، قوماری بۆ ڕابواردن کردووە، جیگەرەی کێشاوە.

دیاردەیێکی هەرە گرنگ لە ژیانی تایبەتی ئەدەبدا عەشقی نوسرەت خانمە، ناخی دەروونی داگیر کردبوو بەبێ ئەو ئارامی نەدەگرت. نوسرەت خانم کچی عیزەتوڵڵا خانی میر پەنجی بووە، یەکێکە لە بنەماڵە سەردارەکانی موکریان. نوسرەت زۆر جوان بووە،

ئەدەب هەموو شیعری بۆ ئەو وتووە، لە شیعرێکیاندا ناوی دەبا:

دڵڕوبایی مونحەسیر ئەوشۆ بەحاڵی نوسرەتە
ویردی بەزمی مەی گوساری چاوی کاڵی نوسرەتە

لە شیعرێکی دیکەیدا دەڵێ:

ئەشعاری (ئەدەب) بۆ عورەفا قووتی ڕەوانن
خاسسە بەسەدای لالەعوزارێکی خۆش ئاواز

لەبەر نەخۆشی درێژ خایەنی ئەدەب خۆشەویستی نێوان شاعیر و دلبەر نوسرەت خانم بەردەوام نەبووە، هەروەها نەخۆشی کاری گەورەی بەسەر شاعیرەوە بووە و کەم ژیاوە. تەنگوچەڵەمەی زۆر بووە لەگەڵ ئەم ژنە، گەلێ جار تۆراوە و لە دواییدا ئاشت بوونەتەوە. هەرچۆنێ بێ لە ساڵی ١٩٠٨ نوسرەت لە ئەدەب جیا بۆتەوە بەیەکجاری و لە پاشانا شووی بەئاغایێکی عەشرەتی کەوورگ کردووە.

ئەدەب لە منداڵییەوە نەخۆشی لەرزۆکی بووە، لە سەرەتادا ئازاری نەداوە، هەرچەندە زیاتر بەساڵا چووە نەخۆشییەکەی تەشەنەی کردووە و لێی پیس بووە. ناچار جۆلانەیێکی بۆ دروست دەکەن و لەناویدا پاڵ دەداتەوە، بەهۆی ژەندنی جۆلانەکەوە، ئازاری لەشی هەندێ کەم دەبێتەوە، تا ساڵی ١٩١٦ ئەو نەخۆشییە لە مردن نزیکی دەکاتەوە و لە گوندی خۆیان ئەرمەنی بلاغ کۆچی دوایی دەکا و هەر لەوێش دەنێژرێ.

## خاسیەتەکانی شیعری ئەدەب

### شاعیریەتی ئەدەب

ئەدەب نوێنەری قوتابخانەی نالییە لە خاکی موکریاندا، هەر وەکو حاجیش نوێنەری ئەم قوتابخانەیە بوو لە خاکی سۆراندا، حەریق و مەحوی و شێخ ڕەزاش نوێنەری ئەم قوتابخانەیە بوون لە خاکی بابان و گەرمیاندا. ئەم شاعیرانە، واتە شاعیرانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم ئەگەرچی غەزەلی نالییان لە ڕووی ڕوخسارەوە نەگۆڕیوە، بەڵام شۆڕشێکیان لە ناوەڕۆکدا بەرپا کردووە، حاجی بەنیشتمانپەروەری و کوردایەتی، حەریق و مەحوی بەسۆفیزمی، شێخ ڕەزا بەئەدەبی داشۆرین و کراوە (ئیرۆتیک)، وە ئەدەب بەدەرهێنانی غەزەلی دڵداری لە چوارچێوەی سۆفیزمەوە بۆ گێتی ڕیالیزم.

ئەدەب غەزەلی کوردی لە لاهووت ڕزگار کردووە، ئەگەر دلبەری هەندێ لە شاعیران نە



کوڕ بووبێ و نە کچ و پەیکەرێکی سۆفیزمی بووبێ، بێ گومان دلبەرەکەی ئەدەب ئادەمزادێکی سەر ڕووی ئەم زەوییە بووە و ناوی نوسرەت خانم بووە.

ئەدەب لە ئایین نەدواوە، تەنیا نەعتێکی هەیە، نەوەکو لەبەر ئەوەی مەلا نەبووە، لەوانەیە ئوروستوکراتییەتی بنەماڵەی هێڵێ ئەم ڕێبازەی بۆ کێشا بێ. ئەدەب یەکێکە لە داهێنەرانی جوانی مانا لە ئەدەبی کوردیدا. لە شیعریدا ئەوە دەردەکەوێ ناخۆشیی ژیانی نەچەشتبێ، ئەگەرچی تەندروستیشی باش نەبووە و هەمیشە نەخۆش بووە. هەموو شیعرەکانی بۆ جوانی و دڵداری و سروشت و ژیانی بەختیاری تەرخان کردووە.

شیعری ئەم شاعیرەمان نرخێکی ئیستێتیکی تایبەتییان هەیە لە ئەدەبی کوردیدا، هۆیێکی گرنگ بوون بۆ بڵاوبوونەوە و پەرەسەندن و گۆڕانی ئەدەبی کوردی لە ناوچەی موکریاندا. شاعیر کە لە شیعری سۆفیزم دوور کەوتۆتەوە، لە ڕاستییێکی دیکە نزیک بۆتەوە کە دڵداری ڕیالیزمی سەر زەمینییە. سروشت لای ئەدەب دیاردەیێکی ڕووداوە، خۆشەویستەکەی پەری بەهەشت نییە بەڵکو ژنێکی کوردە، نوسرەت خانمە.

داڕشتنی ڕستە و هەڵبژاردنی وشە لە لای ئەدەب لە دیالێکتە ناوچەییەکەی موکریان وەرگیراوە، لەبەر ئەوە لە کاتی خوێندنەوەی بەشێ لە شیعرەکانی هەست بەوە دەکرێ کە شاعیر خەڵکی موکریانە. هەروەها لە خوێندنەوەی شیعری حاجی قادریش هەست بەوە دەکرێ کە شاعیر خەڵکی ناوچەی سۆرانە (دیالێکتی ناوچەیی هەولێر و کۆیە و ڕواندز).

### دیوانی ئەدەب

تا ئێستا بەرهەمی شیعری ئەدەب بەتەواوی لە دیوانێکدا چاپ نەکراوە. بەشێکی زۆری بەرهەمی چەند جارێک بەچاپ گەیێنراوە وەکو لە لای خوارەوە ڕوون کراوەتەوە:

١- بەشێک لە دیوانی ئەدەب بۆ یەکەمین جار لە لایەن حوسێن حوزنی موکریانییەوە لە ٢٨ی ئاغستۆسی ١٩٣٦ لە ڕواندز چاپ کراوە.

٢- بۆ جاری دووەم دیوانی ئەدەب لە بەغدا لە ساڵی ١٩٣٩ لە چاپ دراوە. پێشەکییێکی هەژدە لاپەڕەیی بۆ ئەم چاپە نووسراوە، بۆ ڕاستی و مێژوو پێویستە ئەوە بوترێ پێشەکی ئەم چاپە لە لایەن شێخ سەلامی شاعیرەوە نووسراوەتەوە هەر ئەویش لە کاتی خۆیدا دیوانەکەی بۆ چاپ ئامادە کردبوو.

٣- دیوانی ئەدەب بۆ جاری سێیەم لە لایەن گیوی موکریانییەوە لە هەولێر لە ساڵی ١٩٦٦ چاپ کراوە.

٤- دیوانی ئەدەب بۆ جاری چوارەم لە لایەن محەمەد ئەمینی میسری و ئیسماعیلی سەییدیان، خاوەنەکانی «کیتابفرۆشی سەییدیان» لە مەهاباد چاپ کراوە. ساڵی چاپی لەسەر نەنووسراوە. ئەم چاپە دووبارەکردنەوەی چاپی دووەمی بەغدایە بەرێگەی ئۆفسێت.

٥- دیوانی میسباح-ددیوان «ئەدەب» بۆ جاری پێنجەم لە لایەن محەمەد سەعید نەججاری «ئاسۆ»وە ئامادە کراوە و «ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیووبی» لە ساڵی ٢٠٠٢ لە ئێران بڵاوی کردۆتەوە، هەرچەندە ئەم چاپەش تەواوی شیعری ئەدەب نییە، بەڵام لە ڕووی ڕاست و نووسین و ئیملاوە لە هەموو چاپەکانی پێشوو باشترە.

٦- بەشێک لە شیعری ئەدەب بەناوی «عەبدوڵڵا بەگی میسباح-ددیوان شاعیری گەورەی خاکی موکریان»، لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧٠ لەگەڵ لێکۆڵینەوەیێک لە لایەن مارف خەزنەدارەوە بڵاو کراوەتەوە. ئەم برە شیعرە لە کاتی خۆیدا لە ساڵی ١٩١٥ ئەدەب بەخەتە خۆشەکەی نووسیبوویەوە بەتایبەتی بۆ کوردناسی ناودار ڤاسیلی نیکیتین. ئەم دەسنووسە ئێستا لە ئەرشیفی نیکیتین لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمییەی زانستی ڕووسیا لە سانت پیترسبورگ پارێزراوە.

## کێشی شیعری ئەدەب

ئەدەب بەشێکی زۆری بەحری عەرووزی کردووە بەکێشی شیعری، لەوانە: هەزەج، ڕەمەل، موزاریع، ڕەجەز، سەریع، موتەقاریب، موجتەس.

## قافیەی شیعری ئەدەب

ئەدەب نزیکەی نیوەی دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی بەکارهێناوە وەک قافیە لە شیعریدا. ئەو دەنگانەی بەکاری هێناون ئەمانەن: ا ب ت چ د ر ز س گ ل م ن و ۆ ه ی ێ وەک لەم لیستەدا دەردەکەوێ ئەدەب ئەو دەنگانەی لە ئەلفوبێی عەرەبیدا هەن و لە ئەلفوبێی کوردیدا نین هیچ یەکێکیانی بەکار نەهێناوە، ئەو دەنگە کوردییانەی لە زمانی عەرەبیدا نین و تەنیا لە کوردیدا هەن، شاعیر دەنگەکانی (چ، گ، ۆ، ێ)ی بەکارهێناوە، واتە شاعیر ئاوڕی لە دەنگە کوردییەکان داوەتەوە و دەنگە عەرەبییەکانی نەکردووە بەقافیە.



## پاش قافیە

ئەدەب بەگشتی هۆگری بەکارهێنانی پاش قافیە بووە. ئەگەر بەراووردێک لە نێوان ژمارەی شیعری و قەوارەی بەکارهێنانی پاش قافیە بکرێ ئەمەیان بێ گومان یەکجار زۆر دەکەوێتە بەرچاو. ئەو پاش قافیەی لە شیعرە بڵاوکراوەکانیدا بەکاری هێناون ئەمانەن: نەکا، دەکا، بەخودا، شکا، ئەدەب، ئەمشەوت، لە باڵات، نەکرد، چەند، کرد، بولبولم، بم لە گوڵشەن، بوو، تۆ، چ بوو، ئەمرۆ، تێکەڵە، هەیە، چاکە، چاترە، خۆشترە، بەسە، ساقییە، موبارەک بێ، دەڵێ چی.

## نەعت

دیوانی ئەدەب تەنیا قەسیدەیێکی شازدە دێری دەور دەکاتەوە لە نەعتی پێغەمبەر، شیعرەکە بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

ئەی نووری ئیهتیدات لە ماهی هەتا سەما
وەی فەخری ئیستیفات لە ماهی هەتا سەرا
ئەی شاهی ئەنبیا کە ووجوودی شەریفی تۆ
ئەقدەمترە لە خیلقەتی مەخلووقی دوو سەرا
ئادەم ئەبولبەشەر کە بەزاهیر لە سولبی وی
هێشتا قوڕی گەڵاڵە بوو، تۆ خەتمی ئەنبیا

بەم دێرانە ئەدەب دوایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

قەسدی منیش لە عەرزی جەسارەت بەحەزرەتت
جوبرانی نەقسی حاڵە بەنامت لە (مامەزا)
گەر ساڵحە (ئەدەب) و گەریش تالحی شەمی
ئومێدەواری عەفووتە تۆ و خەمسەی عەبا
هێندەم بەسە لە حەشر کە چەتری شەفاعەتت
من ڕوو سیەه لە سایەیی ڕەحمەت وەلا نەخا

ئەم نەعتەی ئەدەب بەتەواوی لە نەعتە کلاسیکییەکانی شاعیرانی دیکەی کورد جیا دەبێتەوە. ئەو نەعتانە بوون بەکەرەستەیێکی ئامادەکراو بۆ شاعیران لە ناو خۆیاندا، بەئاسانی لە یەکتربیان وەردەگرت، سەرچاوەی بنچینەیی هەموویان نەعتەکانی نالی بوون. لە هەموو ڕوویێکی هونەرییەوە شاعیرانی دوای نالی لە دەوروبەری وێنە و ماناکانی ئەو

دەسووڕانەوە، نەک تەنیا ناوەڕۆک بەڵکو لە ڕوخساریشدا لاسایی ئەویان دەکردەوە، شیعرەکانیان لەسەر کێش و قافیەی ئەو دادەنا. بەڵام ئەم نەعتەی ئەدەب بەتەواوی لەوان جیا دەبێتەوە. ئەستووری بیروباوەڕی شاعیر لێرەدا ئەوەیە محەمەد پێغەمبەر پێش ئادەم خوڵقاوە، خوا ئادەمی دروست کردووە لەبەر پێغەمبەر. واتە ئادەم هێشتا قوڕ بووە کە گیانی پێغەمبەر خوڵقاوە. کەسێکی وا گەورە توانای ئەوەی هەیە لە گوناه خۆش بێ، بۆیە ئەدەب داوا لە ئالی عەبا (محەمەد و عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسێن) دەکا بیخەنە ژێر چەتری شەفاعەت و بەبەهەشت شادی بکەن.

## وەسف و دڵداری

سەرچاوەی ئیلهامی هەموو شیعری دڵداریی ئەدەب نوسرەت خانم بووە. لە بنەڕەتدا بەرهەمی ئەدەبی لە ڕووداوێکی دیاریکراو دروست دەبێ بەڵام ڕووداوێکی تازەی دیکەی دروست دەکاتەوە، بەم پێیە ئەگەر جوانەکەی ئەدەب نوسرەت خانم بووبێ، ئەوەی ئەو دروستی کردووە دەبێ لە نوسرەت خانمیش جوانتر بێ. ئەوەی پێوەندی بەلێکدانەوەی شیعری ئەدەبەوە هەیە ئەوەیە جوانی نوسرەت خانم جۆرە شەقڵ و سیمایێکی تایبەتی داوەتە شیعری ئەو شاعیرە دەتوانرێ بەشاعیرێکی خاوەن شێوازی تایبەتی دابنرێ، ئەو شێوازە سەربەخۆیە سنووری جوانکاری شیعری دیاری دەکا، ئیتر پیاو دەتوانێ ئەو شێوازە هونەرییەی بەواقیعی ڕێکوپێکی هەموو ئەندامانی پەیکەری نوسرەت خانم بچوێنێ واتە شیعرەکە بەراوورد بکا لەگەڵ نوسرەت خانم.

لەم ماوەیەدا هەندێ نموونەی لەم بابەتەی شیعری ئەدەب دەخرێتە بەرچاو.

- ١ -

سەبا لە کنم گوزەرگاهت دیاری دلبەرە ئەمڕۆ
شەمیمی عەنبەر ئامێزت وەها جانپەروەرە ئەمڕۆ
لە خەودا شەو خەیاڵی دەستەیی کاکۆڵی یارم کرد
دەماغم پڕ لە عەتر و بۆ و مێشک و عەنبەرە ئەمڕۆ
دوێ فەرمووت کە جان و سەر فیدای ئەو خاڵی هیندووتە
بەڵێ فەرمایشی جانان لەسەر جان و سەرە ئەمڕۆ
بەڕوودا قافیلەی هیجرت سەرای دڵمی لە غەم پڕ کرد
خەرابەی دڵ لە لوتفی تۆ عەجایەب بەندەرە ئەمڕۆ



لە تەختەی عاجی ڕوخسارت بەمووداسی نەزەر لەغزی
دە داوەت دا دڵی بۆیە لە عەمەدەن شەشدەرە ئەمڕۆ
بەبێ تۆ خوسرەوی عالەم لە لام وەک ڕەنجی فەرهادە
بەوەسڵت ڕووحی شیرینم هەلاهیل شەککەرە ئەمڕۆ
غولامی تۆ (ئەدەب) تا بوو لەناو عوششاقی بێ سەر بوو
بەڵێ تاجی سەرم بۆیە لەسەریان ئەفسەرە ئەمڕۆ

شنەبای شەماڵ کە دەگاتە ئەدەب بۆن و عەنبەر بیری لە دلبەرەوە بۆ دێنێ، ئەمە ئەگەر لە بێداری بووبێ، کەچی لە خەودا دەستی لە ملی دلبەر کردووە و مێشکی پڕ بووە لە بۆنی خۆش و میسک و عەنبەر، بۆنی خۆشی زولفی دلبەر. بەم جۆرە ئەدەب لە داهێنانی وێنە هونەرییەکانی بەردەوام دەبێ. زۆریان تازەن و لە داهێنانی شاعیرن. لەم شیعرەدا ئەدەب هەندێ وێنەی ڕەوانبێژی بەدەگمەن بەکارهێنراوی داهێناوە وەکو لێرەدا «موراعات» و «نەزیر»ی بەکارهێناوە کە لە نێوان خوسرەو و فەرهاد و شەکر و شیریندا هەیە، وەک ئاشکرایە ئەمانە هەموویان قارەمانی چیرۆکی شیعری «شیرین و خوسرەو»ی خانای قوبادی و نیزامی گەنجەوین.

- ٢ -

بێ زەوق و مەحەببەت مەی و مەیخانە دەڵێ چی
بێ نەشئەیی زاتی بەت و پەیمانە دەڵێ چی
هەر سیدقە دەبا مەردی خودا ڕێگە بەمەقسوود
شێخ و شەحەن و کەعبەو و بوتخانە دەڵێ چی
عاقڵ ئەوەیە قەیدی عەلاقەی نییە وەک شێت
فەزل و هونەر و عاریف و فەرزانە دەڵێ چی
زادەی ڕەهی هاموونی تەریقەت مەبە زاهید
ویردی سەحەر و سەبحەیی سەد دانە دەڵێ چی
تۆ تاوی سەری شەمعێ مەبینە کە دەسووتێ
بنواڕە لە سۆزی دڵی پەروانە دەڵێ چی
باتین ئەوەیە مەخزەنی ئەسرارە سەراسەر
بێ گەنجی حەقیقەت دڵی وێرانە دەڵێ چی

میسباح ئەوەیە سائیرە نووری لە هەموو جێ
قەندیلی زەڕ و زیوەری کاشانە دەڵێ چی
واعیز وەرە یەک هەفتە (ئەدەب) فێر بە لە لای من
پەندی بەڕیا لۆمە و ئەفسانە دەڵێ چی

لەم شیعرەدا ئەدەب لە ڕەسەنی ڕەوشت دەگەڕێ لە ئادەمزاددا. هەندێ مەسەلەی لۆجیکی دێنێتە گۆڕێ وەکو ئەوەی ئەگەر چێژ یا ئەڤین خۆڕسک نەبێ لای مرۆڤ مەستی مەیخانە هەڵوێستی چی دەبێ بەرامبەری! ئەم وێنەیە و هەموو وێنەکانی دیکەی شیعرەکە کە لە ڕەنگی ئەون، بەپێوانەی لۆجێک تەماشا ناکرێن چونکە مەسەلەکە گیانییە، لەبەر ئەوە لە گێتی داهێنانی هونەریدا تیۆرییەکانی لۆجێک بەتاڵن. بۆیە هەموو وێنەکانی شاعیر چوونەتە دەلاقەی داهێنانی هونەرییەوە.

- ٣ -

دوو هەناری نەورەسن هەریەک بەیەک گوڵنارەوە
یا دوو نارنجی ڕەسیدەن لەو بەهاری پارەوە
دوو شەمامەن دەم تەرەک هەردوو بەیەک بۆستانەوە
یانە جووتێ گوڵبەدەم سێون بەسەر یەکدارەوە
دوو پیاڵەی زەڕ نیشانن سەر بەدوو گژنیژەوە
یا دوو حوقەی گەوهەرن بەندن بەدوو بزمارەوە
نار و نارنج و شەمامە چەندە خۆش دێنە نەزەر
هەر لە یەک شاخ و لە یەک باغ لە یەک گوڵزارەوە
نە هەنارن نە شەمامەن نە بەهێن نە سێوی کاڵ
جووتێ مەمکی ئاتەشین ڕەنگن بەبەر دڵدارەوە
ئەی خودا چەندە ڕەوانبەخش و لەتیف و دلبەرن
ئەو دوو نارە نەورەسە بەو سەرووی خۆش ڕەفتارەوە
حاڵی زاری من لە حەسرەت ئەو دوو نارانە دەڵێی
گینگڵی مارە بەسەر کانوونی پشکۆی نارەوە
دلبەرا ڕەحمێ بکە ئاخر هەتا کەی بەندەگیت
ڕۆژ و شەو بێ ڕوویی تۆ بەو ئاه و ناڵەی زارەوە



گەر لە تاڵی شەربەتی هیجرت دەپرسی بەو سەرەت
خۆزگە دەخوازم هەموو جارێ بەژەهری مارەوە
ئەی (ئەدەب) ئێستا لە هیجران ناڵە بێ سوودە لە لام
هەر دەبوو ئەووەل نەچووبایتایە ژێر ئەم بارەوە

ئەم وەسفەی ئەدەب لە شیعری کلاسیکیدا حاڵەتێکی زۆر باو نییە، کەم شاعیر بەرهەمێکیان تەرخان کردووە تایبەتی بێ بەئەندامێک لە ئەندامە جوانەکانی دلبەر. ئەدەب نیوەی زیاتری ئەم شیعرەی بۆ وەسفی مەمک داناوە. وێنە هەڵبژاردەکانی لە باغی سروشت وەرگرتووە. باس لە میوەکانی هەنار و نارنج و شەمامە و سێو و بەهێ دەکا و بەمەمکیان دەچوێنێ. وێنە جوان و ڕەنگینەکەی لەوەدایە یەکە یەکە باسی ئەم میوانە دەکا و ئینجا دەڵێ ئەوەی شاعیر دەیەوێ باسی لێوە بکا، هیچ یەکێک لەم میوانە نییە، بەڵکو مەمکی دلبەری خۆشەویستە.

- ٤ -

ئەو چەنبەری گێسوو کە موزەییەن بەپەرەنگە
سەد نامی خودا چەندە مەلیح و چ قەشەنگە
ڕوخسارە درەخشانە لە ناو زوڵمەت و پەرچەم
یا پرتەوی میهر و ئوفوقی وادییی زەنگە
لێوت بەسوخەن دێنییە ئیعجاز مەسیحە
چاوت بەفیتنەن فیتنەیی ئیسلام و فەڕەنگە
چاوت ئەگەر ئەوڕۆ بەنیگەهـ مایلی سوڵحە
زولفی سیەهت بۆچی دەگەڵ مەی سەری جەنگە
سەختی دڵی تۆ شەوقی دڵی نازوکی ئێمە
وەک سوحبەتی خارا وو سەبوو شیشە وو سەنگە
بێ وەجهە بکەم فیکری ڕەهایی لە کەمەندت
تا کێشی کەمەنداری بڕۆت پڕ لە خەدەنگە
تەنگی دەمی تۆم هاتە نەزەر لەو غەزەلەی دا
بۆیەم بەخودا وەک دەهەنت قافیە تەنگە

فەرمووتە (ئەدەب) جانێ بەماچێ کە دەوا بێ
هێنامەوە هاتووم وەرە بیگرە درەنگە

ئەدەب لەم شیعرەدا وەسفی هەندێ لە ئەندامی لەشی دلبەر دەکا، لەوانە پرچ و کەزی و دەموچاو و ڕوومەت و لێو، بەگشتی لە قالبی شاعیرانی پێش خۆی نەچۆتە دەرەوە. بەڵام لە دوو توێی ئەم وەسفانەی وێنەی تازە دروست دەکا. هەر لەم شیعرەدا دیارە و چەندە جوانە کە بەدلبەری دەڵێ قافیەی من وەک دەمت بچووک و تەنگە، واتە قافیەی بۆ نایە و لەم لایەنەوە سەرکەوتوو نییە. کەچی ئەدەب بەگشتی لە قافیە زۆر شارەزایە، قافیەی ئەو کەموکووڕی تێدا نییە، بۆ بەڵگە لەم شیعرەدا هەر نۆ وشەی قافیە ڕەسەنن و دووبارە نەکراونەتەوە. هەموو شیعری ئەدەب لە ڕووی کێش و قافیە و ڕیتم و مۆسیقاوە بێ خەوشن.

- ٥ -

ئەی لوعبەتی زیبا وو دڵارام و پڕ ئەفسوون
ئەی شاهیدی پڕ ناز و سوخەن جۆیی سەمەن گوون
هەر من بەتەنێ شیفتەیی تەلعەتی تۆ نیم
عالەم بەسەری نێرگسی فەتتانتە مەفتوون
فەرمووتە کە فیردەوسی بەرینە روخی زیبات
گەر جەننەتە بۆ خابگەهی دوو بەچە ئاهوون
شاعیر دەهەنی غونچەیی تۆ شیبهی بەگوڵ کرد
نەیزانی خەتای کردبوو وەڵڵاهی بەسەرچوون
فەرمووت کە (ئەدەب) دڵ نەشکێنێ بەجەفای تۆ
چۆنم نەشکێ شووشە کە ئاماجی روخام بوون

لەم پارچە شیعرەدا ئەدەب دەیەوێ خۆشی بگەیەنێتە گیانی دلبەر کە دەڵێ تەنیا هەر ئەو گیرۆدەی دڵدار نەبووە، هەموو عالەم عەشقی جوانی دلبەرن، ئەگینا کامە دڵدار حەز بەوە دەکا دلبەرەکەی هەموو عالەم خۆشیان بووێ و لێی بستێننەوە! دیارە مەسەلەکە تەنیا ئەم لێکدانەوە سایکۆلۆجییە نییە، بەڵکو ئەو وێنە هونەرییانەیە کە لەم شیعرەدا شاعیر لە دەوری بیروباوەڕەکەی کۆیانی کردۆتەوە.



## دڵتەنگی لە دووری یار

ئەدەب کۆمەڵێک شیعری لیریکی تەرخان کردووە بۆ وێنەگرتنی هەست و نەستی ناوەوەی خۆی. ئەو شیعرانە زادەی بیری سەردەمی گرژی و خەیاڵی ڕەشبینی و زایینی ڕاڕایی ناو مێشک و دڵ و دەروونی شاعیرن و هەمووشیان لە قالبی هونەری شیعری کلاسیکی دوور ناکەونەوە و مانا لەفزییەکانیان کە وا زان دەکرێ ناخۆشە، بەخۆشی دەگەڕێتەوە و دەبێ بەنموونەی دڵداری.

- ١ -

مەستی قەدەحی بادەیی زیبا سەنەمێکم
هەر لەحزە لە نەشئەی لەبی وەک جامی جەمێکم
ساتێ کە فرووغی مەهی دیداری نەبینم
ئەو ساتە مەپرسە کە قەرینی چ غەمێکم
تا دانەبەزێ غەیری لەسەر مەکەفی پاکەی
هەر تاوە وەکو سایە لە بن هەر قەدەمێکم
قەت نەبووە شەوێکی بەغەمی کوهنەیەوە بم
هەر سوبحدەم ئازوردەیی تازە ستەمێکم
هێندەی غەم و چین خستنە سەر یەک خەمی گێسوو
نازانم ئەوێستاکە لە بەندی چ خەمێکم
گەنجێکە خودادادە بەوی حوسنی جیهانگیر
لەو گەنجە ئەمن چاوەنوارِی کەرەمێکم
گەر حاڵی (ئەدەب) بێتو بپرسن لە فیراقی
ماوم کەم و بێشێکی بەڵا (کەلعەدەم)ێکم

ئەم شیعرەی ئەدەب ڕەنگدانەوەی ئێش و ئازاری دوورییە لە دلبەر. غەم و پەژارەیێکی قورسی بۆ دروست کردووە. کە بیری لێ دەکاتەوە سەری لێ دەشێوێ، هەروەها ناتوانێ تەعبیر لە شێواوی خۆی بکا، خۆی لە خۆی ون بووە.

- ٢ -

ئەی غەزالەی بێ سەبەب ڕەم کردەکەی هەم پەیکەرم
شۆخی بێ پەیمانەکەی بێ شەرتەکەی سەوداسەرم
خۆش مەزەی ناخۆش ئەدای شیرین کەلامی تورش ڕوو
دلبەرەی شێوەگەرەی جەور ئاوەرەی جادووگەرم
کەی من و تۆ شەرتمان وابوو بەبێ یەک هەڵبکەین
یا دەبوو کەی من بەبێ تۆ سەر بنێمە بەستەرم
بۆ گوڵی ڕوومەت گوڵی تەڵعەت گوڵی ڕوخسار گوڵ
گوڵعوزاری نازداری دڵشکاری خودسەرم
گەر عیتابە هەر بەسە نازە بەسە جەور بەسە
وا بکە ئاخر چاوەکەم ئەمنیش بەباری دەربەرم
من کە کوشتەی یارم زەحمەتە ڕووح دەربەرم
تاقی ئەبرۆی چاوەکانی بوونە قەتڵ بۆ سەرم
شاهی خووبان تۆ مەڕەنجە لەو گلەییانەی (ئەدەب)
تۆ هەر ئەو شاهی وەفاداری و منیش فەرمانبەرم

دلبەری شاعیر لە مامز دەکا، بزێوە، سرکە، بێ پەیمانە، جادووگەرە، بەڵام جوانە، قسە خۆشە، بۆ شاعیر ڕوو ترشە. جوانێک هەموو ئەندامی لەشی گوڵ بن، ئەگەر گلەیی بکا، ناز بکا، خراپە بکا، پێویستە سنووری هەبێ، ئاوڕێک لە دڵدار بداتەوە. ئەمەی شاعیر گازاندەیە، دلبەر هەر شاهە و ئەدەبیش فەرمانبەرە.

- ٣ -

بەستەیی زولفم ئەگەر چاهی زەنەخدانت چ بوو
سیلسیلەی کردم لە گەردەن بەند و زیندانت چ بوو
فیتنەیی چەشمی سیەه کافی بوو بۆ سامانی مە
تیرەبارانی سەفی سەربازی مۆژگانت چ بوو
ئێمە جەمعی عاشقان ئاشوفتە حاڵی زولفی تۆین
تۆ لەمە ئاشوفتەتر زولفی پەرێشانت چ بوو



گەر لە ئەووەڵ قەسدی تۆ پێکانی سینەی مە نەبوو
بێ سەبەب تۆ بەو خەدەنگی غەمزە ڕەهبانت چ بوو

شاعیر بیر لە بەندیخانە و کۆت و پێوەند و زنجیر دەکاتەوە، بەڵام ئەم ئازاردانە ئاساییەکە نییە، بەڵکو ئەوەیە وەکو شاعیرانی کلاسیکی باسی دەکەن. ئامێرەکانی ئازاردان زولف و کەزی دلبەرن. دیارە شاعیر مەبەسی وێنەی ڕاستی نییە و ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەی پێ خۆشە.

- ٤ -

بەختی من ئەی زولف کە هەموارە نگوونی
یا سەبری من ئەی موو کە تۆ بێ تاب و زەبوونی
جیسمی منی ئەی توڕڕە مەگەر پڕ تەب و تابی
یا چاوی منی چەهرە کە وەک کاسەیی خوونی
هەم فەردی منی عوود مەگەر دوودە هەناسەت
هەم دەردی منی ڕووح مەگەر زار و زەبوونی
ئەی لالە مەگەر سۆزی فیراقت لە جیگەردا
ڕوخسارە بەخوێنی وەکو من داغ دەروونی
ئاهی منە شام و سەحەر و دەردی دڵی سۆز
یا ڕەب چ عەجەب ئایینە لەم ئاهە مەسوونی
بۆ تیغی برۆت چاکە دەڵێن وەسڵەتە جەبری
لەم چاکە دوو ڕۆژە بەوەفا چاکە دەروونی
هەرکەس کەتوهی بێ (ئەدەب) ئاسا لە هەوای عیشق
ڕازیم بەخودا من بەنەبوونی بەنەبوونی

شاعیر بەسەر بەدبەختی و نامرادی خۆی هەڵدەڵێ. زولف و کاکۆڵ بەرەو خوار بۆتەوە، عوود دەناڵێنێ، گوڵاڵەسوورە لەبەر دووری لە یار خوێن لە ڕووی زاوە. بەختی شاعیر ڕەنگدانەوەی ئەم هەموو وێنانەیە، جا ئەگەر بۆ خودی خۆیان جوان و خۆش بن بۆ دەروونی ناوەوەی شاعیر ناشیرین و ناخۆشن.

## میهرەجانی سروشت و مەیخانەی پیری موغان

ئەدەب لە کۆمەڵێک شیعریدا سەما بەسروشت دەکا. بەهارە و لە گوڵشەندا میهرەجان دەگێڕێ. پۆلی پەرییان لە ئاسمانەوە و جوانانی سەر ڕووی زەوی لە ئاسۆی دوورەوە بەسەما و هەڵپەڕکێ دێنە ناو گۆڕەپانی میهرەجانەوە، گوڵی زەرد و سوور و نیگارانی مەمکەسێو بەدەم ئاوازی کردگارییەوە جامی مەی لە یەکتری وەردەگرن و پیری موغان سەردەستە و ڕێبەری ئەم ژیانی بەهەشتییە دەکا.

شاعیری دڵ تەڕ و ناسک، هۆگری نوسرەت خانم و شەیدای مەیی جاویدانی لەم شیعرانەیدا گۆرانی دەچڕێ بۆ ژیانێکی بەختیاری بۆ هەموو ئادەمزادی سەر ڕووی ئەم زەوییە، بۆ ئەوەی ساتی بەختیاری هەمیشەیی بێ و مرۆڤ دوور بێ لە بەدبەختی.

\- ١ -

ئەمڕۆکە عەجەب شۆڕش و غەوغایە لە گوڵشەن
وەقتی تەرەبی بولبولی شەیدایە لە گوڵشەن
خەملێوە بەسەد ڕەنگە گوڵ و لالە وو سەحرا
سەد نەغمە لە هەر لا وو سەد ئاوایە لە گوڵشەن
تێکەڵ لە هەموو لاوە شەقیق و گوڵ و نەسرین
ئەلحەق کە گەهی سەیر و تەماشایە لە گوڵشەن
سەتحی چەمەن ئەوڕۆ لە قەڵەم قودرەتی سانیع
وێنەی قەڵەمی سەنعەتی ئەو شایە لە گوڵشەن
خەندەی گوڵ و گریانی هەوا وا دەنوێنێ
ئەمڕۆکە دەمی بادە وو مینایە لە گوڵشەن
بولبول سەحەری نەغمەنەوازە بەسەراحەت
یاران چ گەهی تۆبە وو تەقوایە لە گوڵشەن
ئەمڕۆ نەشکێ کەی دەشکێ تۆبە کە ئەمڕۆ
تۆبە شکەنی حوکمی تەقازایە لە گوڵشەن
ساقی بدە بەو جامی زەڕەت بادەکە ئەمڕۆ
هەنگامی مەی وو ساغەری سەهبایە لە گوڵشەن



هاوارە وەکو بولبولی شەیدا (ئەدەب)ی زار
دەستی نەگەیشتە گوڵ و ڕیسوایە لە گوڵشەن

ئەدەب گوڵشەنی کردووە بەگۆڕەپانی بەزمورەزم و خرۆشانی سروشت. قارەمانانی ئەم ئاهەنگە بولبول بەدەنگە خۆشەکەی و گوڵ و گوڵاڵە بەڕەنگە جوانەکانیان بەختیاری دابەش دەکەن. لە گوڵشەندا مەی و مەیخانە بووە بەدیاردەییێک ناهەقی نییە تۆبەکار تۆبەی بشکێنێ، لەبەر ئەوەیە ئەدەب داوا لە مەیگێڕ دەکا زیاتر شەرابی پێ ببەخشێ چونکە ڕۆژ ڕۆژی ئەو بەزمورەزمەیە.

\- ٢ -

وەدەرنێن زاهید و سۆفی نەوەک ئەو بەزمە ساوا بێ
بڵێن موتریب دەگەڵ ساقی بەچەنگ و تارەوە با بێ
نەکیسا و باربەد هەر دوو بەعوود و ڕوودەوە بێنن
لە بەزمی خوسرەویش دا بێ بڵێن شەککەر ئەوێستا بێ
لە کیشوەر سادە ڕوو چی هەن لە هیند و خوللەر و کشمیر
لە بەزمی عەیشی من ئەوشۆ دەبێ پاکی موهەییا بێ
لە هەر جێییێک دەزانن بەچچە تەرساییێک هەیە بێنن
نییە عوزری پەزیرا گەر خودی پاپای کلیسا بێ
لە هەر جێ چەنگییێک ڕامشگەرێک ئاوازە خۆشێک بێ
بەتار و بەربەت و سەنتوورەوە بێنن لەگەڵ شا بێ
لە هەر جێ دلبەرێک شۆخێک بوتێ سیمین بەرێکو دی
بەحوکمەن بۆ منی بێنن نە سارا بێ چ تەرسا بێ
لە هەر جێ موغبەچێکو دی دەگوێی نووسێن بیهێنن
بەتەوع و کوڕه و زۆری بێ دەبێ بێ گەرنەیە نابێ
لە هەر جێییێک فریشتە پەیکەرێ غیلمان لە قایێ بێ
بەباوەش بۆ منی بێنن لە فیردەوسی موعەللا بێ
لە جەننەت هەرچی غیلمان بەچچە هەن پێیان بڵێن پاکی
بەخولد و توور و تووباوە بەعینوانی تەماشا بێ

بڵـــێن بەو زوهرەیی زەهرا دەبێ بۆ ڕەقـــسی ئەو بەزمـــە
دوو چەنگی ماه و ڕۆژ دەستیان لە مل عیقری سورەییا بێ
خـەبەر کـەن چەرخی مـینایی بەشـیـشـە و جـامی مـیناوە
دەقـیـقـێک بێـتـە ئەم سـەیرە بلا چەرخێک نەسـووڕا بێ
بڵـــێن ئەخــتــەر هەتا ڕۆژ دیدەبان بن چاو لە دەرگــادا
نەیێنە مـــەجلیـــسی عـــەیشم چ ئەسکەندەر چ دارا بێ
حـەریفـان بێن و مـوتریب لێ بدەن سـاز و چەنـگ و نەی
بەشـەرتێ یاری خـۆم ساقی لە جـام و تونگی سـەهبـابێ
لە لایێ شـــاهیـــد و ســـادە لە لایێ ســـاقی وو بادە
لە لایێ مـەی لە لایێ نەی وەکـو مـەحـشـەر کـە بەرپا بێ
کـە یار هات و بوو بەسـاقی بادەخـۆری جـالیـبـە تاکـو
لە ئەمـشـەو تا دەڵێن وەقـتـە کـە ڕۆژی حـەشـر بەرپا بێ
(ئەدەب) لەو بەینەدا دەســتـەومـلانی سـەروی زیبـاکـە
هەتا دەوری مـــەســـیح و ئاخـــری دەورانی دنیـــا بێ

شاعیر داوا دەکا زاهید و سۆفی لە کۆڕی بەزمورەزم دوور بخرێنەوە. مۆسیقا ژەن و دەنگ خۆشی وەکو نەکیسا و باربەدی خوسرەوی پەرویز بێنە ناوەوە. شەککەری جوان لەوێ بێ، دووەم ژنی خوسرەو بووە لە پاش شیرین، کچە نازەنینەکانی وڵاتی هیندستان و بەتایبەتی کچە پەریزادەکانی وڵاتی خوللەر بێنە ڕیزەوە. کچانی تەرسا واتە مەسیحییەکان ئامادە بن. لە وڵاتی مەسیحییان منداڵان کۆ بکەنەوە. دەنگ خۆش و مۆسیقا ژەنی هەموو سەر ڕووی زەوی بانگ بکەن. لە هەر کوێیێک جوانێکتان دی بیانهێنن، ئەگەر نەهاتن بەزۆر ڕاپێچیان بکەن، موغبەچە منداڵە جوانەکانی زەردەشتییان بانگ بکەن.

شاعیر تەنیا بەجوانانی سەر ڕووی زەوی تینووی ناشکێ حوور و غیلمانی بەهەشتی دەوێ. ئاسمان دەبێ بەشداری لەم میهرەجانەدا بکا، ئەستێرەی زوهرە پێویستە مۆسیقا ژەن بێ، مانگ و ڕۆژ چەنگ لێ بدەن لەگەڵ ئەستێرەکانی پێر و تەرازوو دەست لە ملی یەکتری بکەن. ئەستێرەکان دەبێ شەو تا بەیانی پاسەوانی دەرگای میهرەجان بن ئەگەر ئەسکەندەری مەکدۆنی و دارای شاهەنشاش بێن نەیەڵن بێنە ژوورەوە. یاری نازدار مەیگێڕە سوراحی و بادەی بەدەستەوەیە. ڕۆژی حەشرە کەس بەکەس نییە، لە لایێک



جوانان، لە لایێک مەیگێڕ، لە لایێک نەی و لە لایێک مەی. با ئەم بەزمورەزمە نەمر بێ، هەتا هەتایە بێ. ئەدەب دەست لە ملی دلبەر بێ تا کۆتایی ڕۆژگار.

- ٣ -

نیگارانی دیاری مـە شـەکـەر لەب گـوڵعـوزارانن
هەمـوو تورکی کـەمـەندارن هەمـوو عـەنقـا شکارانن
هەمـوو سـیـمین بناگـۆشن هەمـوو مـاهی زرێ پۆشن
دەمێ نێش و دەمێ نۆشن چ جـادووگـەر نیگارانن
هەمـوو غـیلمـان بەچەن سادە پەری نەسلن پەری زادە
بەخـەندە نەشئـەیی بادە بەغـەمـزە مـەی کـوسـارانن
بەقـامەت نەخلەکەی توورن بەتەڵعەت کۆمەڵی نوورن
بەسـوورەت ئاگـری سـوورن بەڕوخ لالە عـوزارانن
بەدوو لەب جووتێ گوڵنارن بەغەبغەب سێوی خونسارن
بەگێسـوو دوو سیـەه مارن بەچاو ئەفسـوونی مـارانن
بەبالا سـەروی ئازادن بەگـێسـوو دامی سـەییادن
لە سـەیدی دڵ چ ئوسـتادن چ مـاهیـر جـان شکارانن
بەچەهرە وەک مەهی ڕەوشەن بەزولفی حەلقەیی جەوشەن
بەکوڵمن وەک گوڵی گوڵشەن بەلەب غونچەی نیسارانن
لە مـەشقی عـیشـوەبازی دا لە شێـوەی کـینەسازی دا
لە عـەرسـە تورک نازی دا چ شـیـرین شـەهسـوارانن
لە مولکی لوتف و ڕەعنایی لە کیشوەر حوسن و زیبایی
لە پاتەخـتی دلاڕایی چ سـەرکـەش تاجـدارانن
دزی دڵ ئافـەتی جـانن شکەسـتی دین و ئیـمـانن
نە بەستەی عەهد و پەیمانن نە خەستەی جان سپارانن
نە ئۆگـر یار و ئەغـیـارن نە بابی ڕەنج و ئازارن
نە مـەحـرەم عـاشـقی زارن نە هەمـدەم بێ قـەرارانن
قـەدەح دار و مـەه ئاشـامن دڵ ئازار و دڵ ئارامن
دەمێ وەحـشـن دەمێ ڕامن چ ئاهوو جـیلوەدارانن

(ئەدەب) چبکا لە یارانی لە یاری نازدارانی
دەمێ خونخواری بێ باک و دەمێ غەمخواری جارانن

لەم لیریکە ڕەنگینەدا ئەدەب وەسفی پۆلێک کیژی نەمامی تازەپێگەیشتوو دەکا، وێنەی ئەندامی لەشی جوانیان دەکێشێ، لە ڕەوشت و کردەوە و هەڵسوکەوتی سایکۆلۆجی ناوەوەی دەروونیان دەدوێ. پیاو بۆی هەیە بەخەیاڵ لە ڕستەی «هەموو تورکی کەمەندارن» وا بزانێ کاری هونەر و ئەدەبی گریک و ڕۆمان بەسەر ئەم بەرهەمەی ئەدەبەوە هەیە، بەوەی ئەم کیژە جوانانە لەوانەی سەردەمی ڕۆمانەکان دەکەن، ئەو پۆلە کچانەی بەپێوە لە عەرەبانە دووپێچکەکان دەوەستان و جڵەوی ئەو تاکە ئەسپەیان بەدەستەوە دەبوو کە بەغار عەرەبانەکەی ڕادەکێشا، هەروەها کچەکان تیر و کەوانیشیان بەدەستەوە بوو. لە کاتی لێخوڕیندا دەنگێک لە دەمی سوارچاکی جوان دەردەچوو. گریمان ئەدەب ئاگاداری ئەو وێنە ڕۆمانییە کۆنانە نەبووبێ، بەڵام بۆ کەسانی وەک ئێمە هەیە بڵێین بەڕێکەوت ئەو پۆلە کیژانەی لەم لیریکەدا ئەدەب وەسفیان دەکا لەو جوانانەی ئەو سەردەمەی ڕۆمانەکان دەکەن و مەسەلەکە بەڕێکەوت لای ئەدەب دروست بووە.

ئەو جوانە تیر و کەوان بەدەستانە ڕاوی باڵندەی عەنقای ئەفسانەیی دەکەن لەو کاتەی زرێ پۆشن و لێویان شەکرە و بسکیان گوڵە. باوکی ئەم جوانانە غیلمانی بەهەشتن و دایکیشیان پەریی ئەوێن. ئەدەب لەم لیریکەدا هەوڵ دەدا هەردوو سیفەتی دژ بەیەکتری درشتی و ناسکی لە ڕەوشتی ئەو دلبەرانەدا بدۆزێتەوە. ناسکییەکەیان لەبەر ئەوەیە چونکە شاعیر خۆشیانی دەوێ، وە درشتییەکەشیان لەبەر ئەوەیە بەئارەزووی ئەو ناکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر نازدارن.

لەم شیعرەدا هەست بەسووکی کێش و مۆسیقا و ڕیتم دەکرێ، ئەویش لەبەر ئەوەیە شیعرەکە بەهەردوو کێشی خۆماڵی و عەرووزی دەکێشرێ. لیریکەکە لە سەر بەحری هەزەجی تەواوی هەشت جار (مفاعیلن)ە، واتە (مفاعیلن مفاعیلن)ی عەرووزی، بەکێشی خۆماڵی دەبێتە (ب – ب – ب – ب –) بەم جۆرە ئەگەر حسێبی کێشی خۆماڵی بکەین دەبێ بەم ڕەنگە بینووسین:

نیگارانی دیاری مە
شەکەر لەب گوڵعوزارانن
هەموو تورکی کەمەندارن
هەموو عەنقا شکارانن



ئەم کێشە خۆماڵییە هەشت سیلابی (کەرتی، بڕگەیی، پەنجەیی) پێ دەڵێن، کێشێکە لە ئەدەبی میللی و ئەدەبی نوێی کوردی بەشێوەییێکی یەکجار فراوان بەکار دەهێنرێ.

**بەشی نۆزدەم**

# گەشتی گوڵزاری ئەدەب

شیعری ئەدەب بەگشتی لە پلەیێکی هونەری و ئیستێتیکی بەرز خۆی دەنوێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ ئێسکەی جوانکاری هەیە زیاتر سەرنج ڕادەکێشێ لەبەر گرنگی بابەتەکەی بێ بەوەی بەدەگمەن لە لایەن شاعیرانی دیکەوە دەستی لێ دراوە یا لە ژێر کاریگەری شاعیرێکی تر ئەدەب دروستی کردووە. ئێسکەی لەم بابەتە لە بەرهەمی شیعری ئەدەبدا بەرچاو دەکەوێ، لێرەدا بۆ نموونە هەندێکیان دەخرێنە ڕوو.

## وەسفی بووکی پەردە و بەزاوا بوون

پێنجینی «دوێ شەو...»ی ئەدەب یەکێکە لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی. داستانێکی درێژە وەسفی ئەندامی لەشی دلبەری خۆشەویستی نوسرەت خانم دەکا. ئەوەی زیاتر سەرنجی خوێندەوار ڕادەکێشێ لەم شیعرەدا ئەوەیە شاعیر خۆی زۆر خەریک کردووە بەوێنەکێشان و تاشینی پەیکەری ئەندامی مێیینەی ناوگەڵی ئەو ژنە نیگارینە. حوسێن حوزنی موکریانی ژیرانە بۆ مەسەلەکە چووە کە دەڵێ ئەدەب ئەم قەسیدەیەی بۆ شەوی پەردەی بووکێنی نوسرەت خانم وتووە.

شاعیر بەم پێنجینانە دەست بەشیعرەکەی دەکا:

دوێ شەو شەوی شەمبە کە لە شەمعی مەه و ئەختەر
ئاراستە بوو سەتحی سەرا پەردەیی ئەخزەر
من بەندە لە کاشانەیی تاریک موحەققەر
دوو دیدەیی عیبرەت بەبەر ئەسەقفی موجەددەر
گەه غەرقی خەیاڵات و گەهێ واڵە وو موزتەر
گەه مات و سەراسیمەیی ئەو رەسم کەتیبە
گەه خیرەیی ئەو قودرەتە و ئەو نەقشە عەجیبە
ئەو جیرمە درەخشەندە بەم ئەشکالە غەریبە
بێ زەحمەتی نەققاش و بەبێ ڕەنگی کەتیبە
چۆنی بەسەفا خستە سەر ئەو سەفحەیی مەنزەر



جارێکی خیتابم بەدڵی غەمزەدەیی زار
ئەی هەمدەمی غەمخوارم و وەی مەحرەمی ئەسرار
تا کەی بەهەوای عیشقی بوتان و غەمی دیدار
تا کەی بەجەفای وەسڵی گوڵان و لەبی دڵدار
تا کەی بەتەمای وەسوەسەیی نەفسی بەدئەختەر
ناگاه وە ژوور کەوت یەکێ مەهوەشێ تەرسا
خۆی لوعبەتی تەرسا وو بەسەر چادری تەرسا
لەو چادری تەرسایی نومایان ڕوخی ڕەخشا
وەک پرتەوی شەعرا لەمیان پەردەیی حەزرا
سەد نامی خودا بەو شەوە لەو ماهی مونەووەر
پۆشیدە لەسەر میجحەری دیبایی سیاه فام
لەو تافتەیی فەردە کە مەشهوورە بەبادام
جیلوەی بەمەسەل لەنجەیی تاووسی لەبی بام
هەی هەی لەبەر ئەو قەدد و قیافە و سەر و ئەندام
مەوزوون و تەڕ و تازە وەکوو نەخلی سنەوبەر

ئەدەب وەک پێشەکییێک بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتە ڕۆمانتیکییەکەی ئاماژە بۆ ئەو شەوە دەکا کە شەوی شەمو بووە، ئاسمان ساف و بێ گەرد بووە، لە ماڵێکی ساکاری بچووکدا ژیاوە. شاعیر سەری سوڕ دەمێنێ لە توانای کردگار بۆ ئەو سروشتەی کە خوڵقاندوویەتی.

ئەوجا دەکەوێتە موناجات لەگەڵ خۆیدا، هاوار بۆ ئەو کەسە دەبا کە غەمخۆریەتی و نهێنییەکانی دەپارێزێ، بۆ دڵداریی جوانان، بۆ ڕوخساری خۆشەویستان، بۆ وەسڵی گوڵان و دوو لێوی دلبەر، هەمووی بۆ ئامانجی ئەوەیە لەگەڵ دلبەردا بچنە ناو یەکەوە و بگاتە ئەوپەڕی ئەنجامی دڵداریی زەمینی. لەپڕ نازەنینێکی مەسیحی پەیدا دەبێ. مەسیحی ڕەمزی جوانییە، بێ گومان ئەدەب ئەم بیرۆکەیەی لە شیرینی ئەرمەن یا گورجی خوسرەو و فەرهاد وەرگرتووە. ڕەوتی نەرمی ئەو نازەنینە لە لەنجەی تاووسی دەکرد. یا خودا هەر بەردەوام بێ ئەم پەیکەرە جوانە!

بەهبەه لەبەر ئەو قامەت و ئەو زولفی سەمەن سا
دوو ڕشتەیی موشکینی تەرازی قەدی ڕەعنا

لەو تورفی بەناگۆشەوە تاکو بەکەفی پا
ئاشوفتە وو بەرگەشتە وو ئاڵۆز و چەلیپا
حەلقە و شکەن و پێچ و خەم و چەنگەڵ و چەنبەر
عەتری گرێهی زولفی شەوەی تورڕەیی شەبرەنگ
ئەلبەتتە دەچوو تا بەقەریبی دوو سێ فەرسەنگ
ڕووی میهری فرووزان و خەمی زولفی شەوەزەنگ
ڕەخشەندە لە ناو زولفی سیاها ڕوخی گوڵڕەنگ
وەک پرتەوی ئیمانە لە دڵ مولزیم و کافر
من هەر موتەحەییر کە وە یا ڕەب چ کەسێ بێ
یا بولبولی شەیدایی چ باغ و قەفەسێ بێ
کێ بێت و چ کەس بێت و چ خۆش هەم نەفەسێ بێ
یا بۆ منی بێچارە چ فەریادڕەسێ بێ
ئەغیارە دڵازارە وە یا یاری سەمەنبەر
سەبرێکی هەڵستام و بەسەد فیکرەت و ئەندێش
دوو سێ قەدەمی هاتمە نەزدیکی کەم و بێش
حەیران و سەراسیمە کە بێگانەیە یا خێش
عەیشی منە ئازاری منە نۆشەوە یا نێش
بەم نیوەشەوە کێ بوو لە من بوو بەپەلەنگەر
من غەرقی تەفەککور لەپڕ ئەو دلبەرەی تەنناز
ئاهیستە سەلامێکی بەمن دا بەشەکەر ناز
یا ڕەب چ سەلامێک و چ لەهجێک و چ ئاواز
وەک نەفخەیی سەنتوورە دەگەڵ زیر و بەمی ساز
بەو نەفخە دڵی خستەوە پەرواز بەبێ پەڕ

ئەدەب لە خۆی گۆڕاوە، سەری سوڕماوە، لەو دوو زولفەی بەدیمەنی ئاڵۆزی جوانتر بووە، وێنەی ئەندازیاری ڕەندی دروست کردووە. بۆنی گوڵاوی قژی تا جێگەیێکی دوور بڕی دەکرد، ڕوخساری ڕووناکی بوو، شەوەزەنگ دەوری دابوو. لە پاشانا ئەدەب سەری سوڕ دەمێنێ، نازانێ ئەمە چی کەسێکە، دەبێ بولبولێک نەبێ بۆ باغ و قەفەس شێت نەبووبێ!



کێیە، چی هەناسەگوڵاوییێکە! یا بۆ منی بێچارە چی یارمەتیدەرێکە. یا بێگانەیە و دڵی ئازار دەدا یا دلبەرە و دەست و دیاریی گوڵە. بێ هۆش بووم و بیرم دەکردەوە. چەند هەنگاوێک چوومە پێشەوە و لێی نزیک بوومەوە. نەمدەزانی خۆشییە بۆ من یا ئازارە. بەم نیوەشەوە کێیە لێم بووە بەپڵنگ. من هەر بیرم دەکردەوە، دلبەر بەنازوفیزەوە سڵاوی لێ کردم، تەنیا خودا خۆی دەیزانی ئەو سڵاوە چی ئاوازێکی هەبوو، وەک هەناسەی سەنتوور و چریوەی نالینەکانی بوو.

ئەمجارە کەمێ هاتەوە پێشێ بەشەکەرخەند
فەرمووی کە(ئەدەب) حیرەت و نەفرەت لەمە تاچەند
من ئەو سەنەمەم وا کە دڵی تۆم بەجەفا سەند
من ئەو فەتەنەم گەردەنی تۆم خستەوە ناو بەند
حازر بە نیشانەم ڕەسەنی زولفی موعەتتەر
هەر ئەو بوتی فەرخارە هەر ئەو دلبەر پارەم
هەر ئەو گوڵی گوڵزارە هەر ئەو تازە بەهارەم
هەر غونچەیی خەندان و هەر ئەو لالەعوزارەم
ئەو میهری درەخشانە هەر ئەو ماهی حەسارەم
هەر ئەو قەدی شمشادەمە ڕەنگینە بەمیعجەر
ئەو ساتە کە ناسیمەوە ئەو دلبەری شەنگە
ئەو تورکی کەمەندارە هەر ئەو غەمزە خەدەنگە
ئەو شاهیدی تاتارە هەر ئەو ماهی فەرەنگە
ئەو یاری جەفاکارە لەگەڵ مەسەری جەنگە
هەر دلبەرەکەی پارە هەر ئەو یاری ستەمگەر
کەوتم لەبەری پێی و وتم ئەی گوڵی ڕەعنا
ئەی ڕووحی ڕەوانم چ بەسوورەت چ بەمەعنا
هەرچی کە بفەرمووی (سەمیعنا وەئەتەعنا)
ما شِئْتُ فَعَلْتِ وإلی الآنَ قَنَعْنا
ئەمما وەرە فەرموو لە چ بووی لَیمە موکەددەر
ئەی لالە ڕوخ و تورڕە وەکو موشکی تەتاری

سەد جانی عەزیزم بەفیدای غونچەیی زاری
چیت لێمە خەتا دیوە کە بەینێکە کەناری
فەرموو کە لەسەر چی لەگەڵ ئێمە بەنیقاری
ساڵێکە لەسەر چی لەمە تۆراوی سەراسەر
فەرمووی کە چ هەنگامی گلە و وەختی عەزایە
ئەمشەو شەوی عەیش و تەرەب و سوڵح و سەفایە
سەیری سەری کوڵمم کە دەڵێی نووری چرایە
سینەم کە دەڵێی ڕەوزەیی ڕیزوانی خودایە
شەهدی دەهەنم کە دەدا تەعنە لە کەوسەر
تێ فیکرە لە خورشیدی جەماڵم بەتەئەمول
بگرە سەری گێسووم وەکو دەستەیی سونبول
سونبول عەجەبا بۆچی دەدا بۆنی قەرەنفول
شەوگاری تەواسول نییە هەنگامی تەغافول
ئەمشەو شەوی عەیشە نە حیکایەت لە سکەندەر

بووکی ناو پەردە کەمی هاتە پێش و کەوتە گفتوگۆ: ئەی ئەدەب! پێویست نییە دوودڵ بی، من ناناسییەوە، من ئەو بوت و دلبەرەم گەردەنی تۆم کۆت و زنجیر کردووە، من هەر بوتەکەی شاری فەرخاری تورکستانم، منم گوڵ و گوڵزار و بەهار و غونچەیی خەندان.

ئینجا شاعیر هۆشی دێتەوە لای خۆی و دلبەرە جوانەکەی دەناسێتەوە. ئەو دلڕفێنە کەمەندارە ڕەمزی کچە جوانانی تەتارستانە، بەڵگەی چاوشین و قژ زەردی فەڕەنگستانە، هەر ئەو یارەیە کە لە پارەوە ناسیوبەتی. ئەوجا شاعیر دەکەوێتە بەرپێی و لێی دەپاڕێتەوە و موناجاتی لەگەڵدا دەکا و بەشان و باهوو و جوانیدا هەڵدەڵێ و پرسیاری لێ دەکا لەبەر چی لێی زیزە. بووکی ناو پەردە لە وەرامدا دەڵێ: کاتی گازاندە و گلەیی نییە، شەوی ئاشتبوونەوە و خۆشییە. تەماشای کوڵمم بکە تیشکی چرایە، بنوارە سینەم دەڵێی باغ و باغچەی بەهەشتە. ئاوی ناو دەمم لە ئاوی کەوسەر خۆشترە. بەوردی تەماشای جوانیم بکە زولفەکانم وەکو دەستەی سونبول بگرە بەدەستەوە، ئەمشەو شەوی خۆشی و ڕابواردنە نەک گێڕانەوەی حیکایەتی بەسەرهاتی ئەسکەندەری مەکدۆنی.

هەر وای وت ڕووبەندی کە لادا بەقەفادا
گێسووی بەسەر پەنجە لەسەر عاریزی لادا



ئەو تەلعەتی وەک ماهی لە ناو زولفی سیادا
ڕۆژێ بوو تولووعی بوو لە ناو لەیلی دوجادا
ڕووناکییەکەی خستە هەموو خیتتە وو بەندەر
سەر کوڵمی گوڵی دایەوە وەک لالەیی حەمرا
زیبی سەری دوو کوڵمە دوو گێسوویی مەتەڕڕا
جارێ خەم و گەه حەڵقە وو جارێکی دەگۆڕا
جارێکی بەسەر کوڵمەوە جارێکی لەسەر ڕا
وەک پێچ و خەمی دوودە لەسەر میجمەری ئازەر
ڕەنگین بەخەت و خاڵەوە وەک کەبکی موتەووەق
جار جارە کە دبزووتەوە بەو جیلوەیی موتلەق
عەکسی شەفەقی سینە لە بن مەوجی ستەبرەق
هەر تاوە بەڕەنگێ بوو وەکو قەسری خەوەرنەق
سوبحانە! لە زیبایی ئەو شاهیدی کشمەر
زولفی سیەهی پەخشە لەسەر گەردەنی بەللور
وەک سوحبەتی موشکی خوتەن و نیسبەتی کافوور
با یەک لە شەوەی توورڕە و هێندێک لە قەمەر نوور
هەر بۆیە کە ئامێزشی مەهتابە بەدەیجوور
هەیهاتە لە نەیڕەنگی بوتی شەعبەدە پەروەر
ئارایشی عالەم بەگوڵستانی جەمالی
بەو خوڵقی پەسەندیدە وو بەحوسنی کەمالی
هەر جارە کەتیلیکی دەدا چاوی غەزالی
پەیکانی خەدەنگی نیگەهی نێرگسی کالی
کاری لە دڵی عاشقی شەیدا وەکو خەنجەر

کە دلبەر وتی: ئەمشەو سەردەمی خۆشی و ڕابواردنە. دەستبەجێ، ڕووبەندی لە دەموچاوی لابرد، قژ و زولفی لەسەر ڕوو لادا، ئەمە وەک هەڵاتنی خۆرێک بوو گێتی ڕووناککردەوە. ئەدەب بەوردی سەرنجی داوەتە هەموو ئەندامەکانی لەش و بزووتنەوەکانی دلبەر. دەمێک بەکەوی خاڵداری چواندووە، دەمێک بەراووردی کردووە لەگەڵ جوانانی

خەوەرنەقی کۆشک و باڵەخانەی بەهرامی گۆڕ و نازەنینەکانی کشمیری هیندستان.

لەم برِە شیعرەدا ئەدەب لە شێوازی قاڵبی کلاسیکی لای نەداوە بەتایبەتی لە وەسفی ئەندامی لەشی ئەو بووکەی لەو جوانتری نەدۆزیوەتەوە لەسەر ڕووی زەوی.

دوو توڕڕەیی مەفتوولی سەرازیرە بەڕوخسار
یەک عەقرەبی جەڕڕارە یەکێ سونبولی گوڵزار
یەک شکڵی سیەه مارە یەکێ موهرەیی بیمار
یەک نۆشی دڵارام و یەکێ نێشی دڵازار
یەک مەرهەمی دەردان و یەکێ دەردی موسەووەر
لەب لەعلی بەدەخشان و دەهەن حوققەیی مەرجان
مەتبووع و پەسەندیدە بەهەر تەبع و بەهەرجان
ئامیختە نوتقی بەشەکەر وەک بەشەکەرجان
شیرینە وەک ئەو دەم کە لە دەر بێتەوە بەرجان
دەبزانە چ خۆشە کە ڕەوان بێتەوە بەربەر
دەم تازە شکۆفێکی شەقایق لە نزاران
لەب پڕ لە تەبەسسوم بەنەسیمێکی بەهاران
ئاوونگی بەیانانی بنیشێ لە کەناران
دەستی چ کەسی لێ نەدرابێ لە چ جاران
مەحبووب و تەڕ و تازە وو ڕەنگین و موعەتتەر
سینەی چ بڵێم سوبحەدەمی فەسڵی بەهارێ
یا بەفری هەوەڵ شەو کە زەمستانێ دەبارێ
دوو مەمکی وەکو جووتە هەناری لقی دارێ
دوو گوڵ بەدەمی نارەوە وەک دەنکی هەنارێ
قەترەی عەرەقی پێوەیە وەک دانەیی گەوهەر
ناف و شکەمی وەک چ بڵێم نافەیی قاقوم
نافەی لەمیان بەستەری قاقوم بەمەسەل قوم
وەک نافە کە بووبێ لە غەزالی خوتەنی گوم
خۆی بێ ئەسەر و ماوە لە ئاهوو ئەسەری سوم



وەک نافە بەبێ نافە پەراگەندە بەکیشوەر
ئەلقیسسە لە شەوقی دڵی پڕ حەسرەتی موشتاق
وا گرتمە ناو باوەشی خۆم ئەو مەهی ئافاق
بووە یەک دەهەن و گەردەن و سینە و کەمەر و لاق
جووتێ بوو بەباتین بەدەن ئەمما بەنەزەر تاق
ئەو ساعەتە عەیشم بەدووسەر عومرە بەرابەر

لەم برِە شیعرەدا ئەدەب هەوڵی ئەوەی داوە لە تەوقی سەری دلبەرەوە بەرەو خوار بێتەوە و وەسفی ئەندامەکانی بکا. بۆ ئەم مەبەسە لە جووتە مەمکەکانییەوە دەست پێ دەکا، بەمار و دووپشکیان دەچوێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئارامی گیان و مەرهەمی دەردانن، چونکە مەبەسی شاعیر لەم زیندەوەرە ترسێنەرانە شێوەی پەیکەریانە لە قژ و بسک و زولف دەکەن. لە پاشانا دەکەوێتە باسی دەم و لێو وەک قوتووی مەرجان وێنەی دەکێشێ. ئەوجا دێتە سەر سنگ و مەمک، ئەوەندە ساف و پاک و سپی و جوانە لە یەکەمین بەفری زستان دەکا، جووتە مەمکی وێنەی دوو هەنارن، دوو گۆی مەمک لە شێوەی دەنکە هەنارن، خوناوی وەک دانەی گەوهەر لەسەریان نیشتووە. ئەدەب زیاتر بەرەو خوار دەبێتەوە و دەگاتە ناوکی خۆشەویست، دەڵێ ئەمەیان ئەوەندە نەرمە وەک خوری ئاژەڵی قاقوم، وێنەی ئەو ناوکە لە شوێنەوار یا شەقڵی سمی مامزی شاری خوتەنی ئەفسانەیی تورکستان دەکا. جگە لەوە ئەم وێنەیە لە ئەندامی مێیینەی دلبەرەکەش دەکا. ئیتر نازەنین دەگرێتە باوەش و دەگاتە ئەو گەنجینەیەی ئەم هەموو خۆشییەی پێ دەگەیەنێ.

گەه خیرەیی خورشیدی جەمالی بەتەلەئلوء
گەه سایەنشینی خەمی زولفی بەتەفەیوء
گەه حامیلی ئەو نازە کە دەیکرد بەتەهەزوء
گەه سولح و گەهێ جەنگ و گەهێ عیجز و تەخەتتوء
گەه حەزم و گەهێ ڕەزم و گەهێ بەزم و گەهێ شەڕ
گاهێ لە کەفی موهبەتی چەشمی بەتەوەقوع
گاهێ بەئەتک مەرحەمەتی دەستی تەوازوع
گاهێ لە گوڵی زاری بەئومێدی تەمەتتوع
گەه بادە گوساری لەبی لەعلی بەتەجەڕڕوع

گەهـ جورعەکەشی ماچی دەمی وەک مەیی خوللەر
غونچەم دەچنی جارێ لە گوڵزاری عوزاری
جارێ لە تەماشایی شکۆفەی گوڵی زاری
ساتێکی خەریکی گرەهی بەندی ئیزاری
دەستم لەپڕا کەوتە سەر ئەو مەوزیعی کاری
چاوی بەدی لێ دوور بێ وەکو گەنجی تەوانگەر

شاعیر کە دلبەر دەگرێتە باوەشییەوە دەکەوێتە دەربڕینی هەست و نەستی ناوەوەی، لەو ساتە خۆشەدا ئەوەی لە یاد نەچۆتەوە کە نازونووزی خۆشەویست بێ پایانە، ئەگەر ڕەتکردنەوە نەبێ، دەم نادەم گرژی نەبێ سەردەمی مێبازی دڵدار و دلبەر پڕ شەوق و جۆش نابێ، لەبەر ئەوە ئەدەب گەلێ وێنەی پێچەوانەی یەکتری لەم شەوە خۆشە لە ناو شیعرەکەدا دروست کردووە. تۆران و ئاشتبوونەوە و، ڕوو ترشی و بزەی خۆشی، ئەمە مەکە و ئەمە بکە، هەمووی چێژی سەرخۆشانی دڵدار و دلبەر بەهێزتر دەکەن و زیاتر هۆگری یەکتری دەبن. لە کاتێکدا ئەدەب مەستی شەرابی شەوی بووکێنی خۆشەویستی دەبێ، شەرابی بەناوبانگی شاری خوللەری نزیک شیراز مەستتری دەکا و دەکەوێتە دەستبازی لەگەڵ ئەو پەرییەی لە ناو پەردەدا بوو لەگەڵی. دەمێک خەریکی بەندە خوێنی دەرپێی دەبێ و دەستی دەکەوێتە سەر ئەو جێیەی مەبەسی کۆتایی شەوی بووکێنییە. ئیتر دەست دەکا بەوەسفی ئەندامەکە.

گەنجی چ بڵێم گەنجی خودا دادی فەرەیدوون
دەربەستە وو نەشکوفتە وەکو مەخزەنی قاروون
دورجێکی گوهەر ڕەنگی گوهەرسەنگی گوهەرگوون
هەر کەس کە بەسەد گەنجی بدا هەر ئەوە مەغبوون
دەبزانە چ گەنجێکە بەسەد گەنجە بەرابەر
گەنجینەیی مەستوورە بەبێ خازین و گەنجوور
ئایینەیی بەللوورە بەبێ سەنعەتی مزدوور
یاقووتی نییە هەر وەکو یاقووتە جیگەرسوور
خاسیەتی یاقووتی هەیە وەک هەیە مەشهوور
دەفعی غەم و تەفریحی دڵ و قووەتی پەیکەر



وەک شکڵی هوڵوو هەیئەتی گوڵبەرگی شڵی ڕەنگ
ئاڵوودە وەکو شەهدی لە تافەت وەکو باڵەنگ
حوققەیکی خڕ و سادە وو سیمین و دەهەن تەنگ
ئەندوودە نەبووبێ ڕوخی سیمی بەخەتی زەنگ
تەوزیحە بەکوردی وەکو بەیزێکی موقەششەر
ڕەنگین و خڕ و گردە لە تەرکیبی هەنارێ
هەروەک کەلەمێ زوقمی لەسەر بەرگی ببارێ
هەر جارێ کە ڕێکت بگوشیبایە بەجارێ
سیرەی لە وەتاغی دەچووە دەرکی حەسارێ
وەک خرچەیی تەڕ درزی دەبرد ئەمسەر و ئەوسەر
وەک تازە هەڵووژەی کە لە ناو دوو لقەدا بێ
وا ڕێک گوشرا بێ کە لە دوو لاوە قوپا بێ
هێندێکی قوپا بێت و کەمێکی قەڵیشا بێ
قەڵشانی نە وابێ کە بەچاو فەرقی کرابێ
هەر وەک لە بەهێیی کاڵێ درابێ دەمی نیشتەر
وەک گوڵ دەمی خەندان و وەکو غونچە لەبی جووت
غونچێکی لە ناو دوو پەڕی گوڵدا کە نەپشکووت
پەیدا سەری چوچڵە لەمیان دوو لەبی یاقووت
هەروەک بەدەمی تفلی سەما هاتەوە شاقووت
نیوێکی پەیدار و ئەوی دیکە موسەتتەر
بەم تەرزە کە هاتە نەزەر ئەو حوققەیی بەللوور
حەمدانە لە سوێیانی کەپووی لێ بوو بەشەیپوور
بەو مێزەر و دەستاڕ و سەر و گەردەنی ئەستوور
بێ وەی کە دەقولبا بێ بکا سەرزەدە چووە ژوور
سوبحانە لە بێ عاریی ئەو گوێ ڕەپی ئەعوەر
چوو ژوورەوە بەو شکڵ و هیوولا وو قەوارە
دەتگوت کە لە ناوکی بەرەو ژێر گرتی بەئیجارە

کاری بەدوو ساعەت گەیییە چل بەژمارە
ئەلبەتتە هەتا ڕۆژێ دەدا خۆی لە هەزارە
ئەلحەق هونەری کردووە سلێمان بەگی یاوەر

خوێندنەوەی ئەو تابلۆ هونەرییانەی شاعیر لە وەسفی ڕووکەشی قوزی ئەو بووکە جوانە بێ هاوتایەکەی «مەستوورە»کەی نالیمان دێنێتەوە یاد. گومان لەوەدا نییە ئەدەب شیعرەکەی نالی خوێندۆتەوە و چێژی لێ وەرگرتووە، لە پاشانا ئیلهامی داوەتێ. بەم جۆرە ئەدەب هەوڵیداوە لاسایی بکاتەوە، یا هیچ نەبێ لەم بابەتە شیعرە، شیعری کراوە (ئیرۆتیک)، بەرهەمێک بخاتە ناو دیوانی شیعرییەوە. لەم بەشەی شیعرەکەیدا ئەدەب هەندێ تابلۆی ڕەنگدانەوەی شێوازی نالییە، بەڵام ئەو کەرەستانەی نالی بەکاری هێناون، شاعیر بەلایانا نەچووە، بەڵکو بەڵگەی دیکە و تازەی وەرگرتووە لە دیاردەی سروشت بۆ لێکچواندنی ئەندامی مێیینەی خۆشەویستی و ئەو دیاردانە. بەشێکی دیکەی تابلۆکانی شاعیر شێوازی نالییان پێوە نییە، بەڵکو لە داهێنانی شاعیر خۆیەتی. لێرەدا وەنەبێ هەست و بینین و تێبینیی تیژ و ژیرانەی ئەدەب لەوەی نالی کەمتر بن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر ئەوەی نالی وەک یەکەمین شاعیر و دامەزرێنەری قوتابخانەی کوردستانی باشوور نەک تەنیا لەم مەبەسە بەڵکو لە هەموو مەبەسەکانی شیعری کلاسیکی کوردی شاعیرانی نەوەی یەکەم و دووەم و هەموو ئەوانەی بەشێوازی شیعری عەرووزی نووسیویانە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری نالییەوە.

ئەدەب لە وەسفی ئەندامی مێیینەی خۆشەویست وێنەی جوان دروست دەکا. وەک ئەوەی بەخەزنەی دەوڵەمەندە گەورەکانی مێژوو و گێڕانەوە ئەفسانەیییەکانی دەچوێنێ وەک قاروون و فەرەیدوون. خەزنەکە داپۆشراوە پاسەوانی نییە. وەک قاپێکی بلوورینە ناوەوەی سوورە وەک یاقووت. نەرم و شلە لە شێوەی قۆخ یا نارنج دایە. قوتوویێکی خڕ و سادە و زیوینی دەم بچووکە وەک هێلکەیێکی بچووکی پاک کراوە. ڕازاوە و گردە لە هەنار دەکا، یا وەک کەلەمێکە زوقمی لەسەر باری بێ یا وەک خرچەیێکی تەڕ و ناسک درزی تێ کەوت بێ. هەروەها وەک هەڵووژەیێک لە ناو دوو لقدا دابێ و قەڵشانی تێ کەوتبێ یا وەک نشتەری لێ درابێ. هەروەها بەگوڵێکی دەچوێنێ بزەی لێ پەیدا بووبێ. یا وەک غونچەیێک لێوی داخستبێ، یا وەک غونچەیێک نەپشکووتبێ. میتکەی شتێکە لە نێوان دوو لێوی دەمێکی لە یاقووت دروست کرا بێ.

ئەوجا لە دوای ئەم هەموو وەسفە جوانەی ئەو ئەندامە ناسکە، شاعیر هینەکەی خۆی



دێنێتە گۆڕێ، شتێکە لە شەپیوور دەکا، بەقەد و گەردەنی ئەستوور و سەر و مێزەری وەک دەستارەوە کوێری ئەعوەر (یەک چاو، کێر) بێ ئەوەی لە دەرگا بدا خۆی دەکا بەژووردا. بەم جۆرە ناو لەشی دلبەر داگیر دەکا تا ناوکی. لە ماوەی کاتژمێرێک چل جار خۆشی و مووچڕک بەلەشی دەگەیێنێ. دیارە تا بەیانی خۆی لە هەزار دەدا. دوا قسەی شاعیر ئەوەیە دەڵێ سلێمان بەگی یاوەر هونەری نواندووە. مەبەسی لە سلێمان بەگ کەسێکی دیاریکراو نییە، کینایەتە بۆ ئەندامی نێرینەی پیاو.

شاعیر بەم دوو پێنجینە کۆتایی بەداستانەکەی دێنێ:

خەتمێکە (ئەدەب) هێندە مەکە بێ ئەدەبی دی
تا حەملی نەکا واعیزی ئەم شارە بەچی دی
هەرچەندە کە هەڵدەگرێ خەیاڵات شتی دی
ئەمما بەخودا غەیری تەسەووڕ نییە چی دی
مەقبوولە ئەمیش خاسە لە لای مەردی سوخەنوەر
گەر هەز لە ئەگەر تیبەتە گەنجێکە نیهانی
مەملووئە سەراسەر لە دوڕ و گەوهەری جانی
هەر دانە بەرابەر بەدوو سەد گەوهەری کانی
قەدری لە کن ئەو شەخسە بزانێ لە مەعانی
مەعلوومە لە لای گەوهەرییە قیمەتی گەوهەر

ئەدەب لەم بەزمەی نوسرەت خانمدا لاسایی نالی دەکاتەوە وەک ئەو لە «مەستوورە»کەیدا کردوویەتی، لەم وێنە کراوانەی ئەندامی مێیینەی خۆشەویستەکە پاشگەز دەبێتەوە. ئەمە بێ گومان بەزەبری ڕای گشتی دروست بووە چونکە ئەم جۆرە کردەوانە نهێنی و تایبەتین لە نێوان ژن و پیاوێک ڕوو دەدەن و شایانی ئەوە نین ئاشکرا بکرێن. لەبەر ئەوە کردەوەی لەم جۆرە بەماقووڵ حسێب ناکرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئەدەب سوورە لەسەر ئەوەی ئەم کاڵایە باڵای خۆی هەیە و شیعری لەم جۆرە خوێندەواری خۆی هەیە. ئەم کردەوانە شتێکی گرنگن لە واقیعی کۆمەڵایەتی ئادەمزاددا، لەبەر ئەوە باسکردنیان نابێ شوورەیی بێ. لە کاتێکدا ئیلهام دەدەنە هونەروەر بۆ داهێنانی قسەی جوان دەبن بەبەشێک لە سامانی نەتەوایەتی میللەت و مرۆڤایەتی.

## پەری بەسەما دێتە سەر شانۆ

دیوانی ئەدەب پێنجینێکی دیکەمان بۆ دەور دەکاتەوە، لە هەندێ لاوە لە پێنجینی بووکی ناو پەردەی پێشوو دەکا، لە هەندێ لای ترەوە بەرِوخسار و ناوەرۆک بابەتێکی دیکەی تایبەتییە. ئەم پێنجینە لەوەی پێشوو سووکتر و رەوانترە لە دابەشکردنی ئاوازی ریتم و مۆسیقا، هەروەها لە دەنگی قافیەی گشتی شیعرەکە، واتە قافیەی دێری پێنجەمی هەموو پێنجینەکان. وشەی ئەم شیعرە هەڵبژاردەیێکن جۆرە هارمۆنییێکیان دروست کردووە ئاوازێکی وەکیەکی و لەیەکچوویان داوەتە خۆیان و ئەو رستانەی دروستیان کردووە. بەم رەنگە قەسیدەکە بووە بەنموونەی ئاوازێکی مۆسیقی رەوان پیاو کە دەیخوێنێتەوە هەرچەندە تەنگەنەفەسیش بێ گەرووی دەکرێتەوە و بەبێ وەستان دەنگی لێ دێتە دەرەوە. گومان لەوەدا نییە هەموو سەرچاوە و کەرەستەی ئەم شیعرە رۆژهەڵاتییە، بەڵام پیاو بۆی هەیە بەخەیاڵیش بێ بیر لەوە بکاتەوە ئیلهامی شیعرەکە ئەگەر لە دەرەوەی دووریش هاتبێ (ئەوروپا) کارێکە سەرسوڕمان دروست ناکا. رەنگە لە ئۆپێرایێک یا بالێییێک هاتبێ. مەرج نییە ئەدەب لە رووسیا یا پۆلۆنیا چاوی بەو شانۆیە کەوتبێ، لەوانەیە لە تاران بینیبێتی. رەنگدانەوەکەی دیمەنی ئۆپێرا یا بالێ لەو سەماکەرە جوانەوە هاتووە کە لە پشت پەردەی شانۆ بەنازوفیزێکی رۆمانتیکیانەوە خزیوەتە ئەمدیوی پەردەوە و بەلەرینەوەی هونەرییانەی لەشولاری جوانی خەڵکی دەباتە حاڵەتی ئارامی گیانی و هێمنی دەروونی. ئەدەب پێنجینەکەی بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

دووێکە ماشیتە قەزا لە سونعی لایەنامەوە
بەهەفت کەوەی پەردەوە لە حەجلەیی زەڵامەوە
عەرووسی میهری ئەنوەری لە قەسری چار بامەوە
لەپڕ نیگاری ماهرِوو بەحوسن ماهی تامەوە
لە پەردەوە وە ژوور کەوت بەوەجد و ئیبتیسامەوە
قەدەم قەدەم دەهاتە پێش بەچەندە عیزز و نازەوە
بەچەندە ئیهتیزازەوە بەچەندە ئیعتیزازەوە
بەلەنجەیێکی کۆتری بەحەملەیێکی بازەوە
بەچەندە راز و بازەوە بەچەندە سیحر و نازەوە
بەچەندە کیبر و بازەوە بەچەند ئیحتیشامەوە



دوو زولفی دڵ شکارەکەی سیاهی تاب دارەکەی
یەکێ لە جانیبی یەمین یەکێ لە لای یەسارەکەی
ببوونە زیبی قامەتی نیهالی نەوبەهارەکەی
وەکو لە باری خوسرەوی دوو تورِفە پەردەدارەکەی
خودا خودا چ حشمەتێک بەدوو سیاه غولامەوە
لە سەبزی میعجەری نیهان سەهی قەددی سنەوبەری
فرووغی تەڵعەتی عەیان لەجورمی سەبزی میعجەری
وەکو لە هەوری تیرەدا درەخشی شەمسی خاوەری
وە یا لە تەلعەتی مەسا تولووعی میهری ئەنوەری
کە دەم بەدەم لە تیشکی دوو سەباحی خستە شامەوە
لە گرشە گرشی روومەتی لە بن قەددی نیقابەوە
لە تاقی تیری غەمزەکەی دوو چەشمی پڕ عیقابەوە
کە یەک لە دووی یەکی دەهات بەتاب و ئیلتیهابەوە
وەکو خەدەنگی ئاتەشی لە جانیبی شیهابەوە
لە هەیبەتی عەجەب نەبوو کە ئەو دەمەی توامەوە

لەم دێرانەدا شاعیر لە شێوازی وەسفی رۆژهەڵاتی نەچۆتە دەرەوە، تەنیا ئەوەیە بەدیمەنێکی خەیاڵی پەیکەری خۆشەویستی رازاندۆتەوە. لە پشت پەردەی تاریکی و نادیارییەوە ئەم پەرییە دەرکەوت و هاتە ناو ژووری شاعیرەوە. ئەدەب نزیکبوونەوەی بەلەنجەی کۆتر و هێرشی باز دەچوێنێ. دوو زولفی جوانی لەملا و ئەولای راخستووە، هەموو ئەندامی لەشی دەلەرێتەوە، هاتنی ئەم نازەنینە هەڵاتنی رۆژ بوو، بەتیشکی رووناکی خستە شەوەوە. دیارە خۆشەویست بەپەچەوە رووی کردۆتە شاعیر. پەچەکە لە ئاوریشمی رەش بووە، ئەمە زیاتر جوانی داوەتە دەموچاوی پەرییەکە چونکە تارمایی جوانییەکەی لە پەچەکەوە کەوتۆتە بەرچاوی ئەدەب، ئەم هەموو جوانییە بۆی هەبوو بیتوێنێتەوە.

بەرِەقس و جیلوە زوهرە بوو بەشەوق و شوعلە مشتەری
نە زوهرە بوو نە مشتەری نەوەک مەلەک نەوەک پەری

نەوەک بوتانی کاشغەر نەوەک نیگاری کیشمەری
خرۆشی زیب و زیوەری لە عیقدی تاجی ئەنوەری
دەگەییە چەرخی هەفتەمین لە خاکی تیرفامەوە
ئەمن شکوفت و خیرە سەر غەریقی لوججەیی خەتەر
کەمە خەیاڵە یا خەتەر فریشتەیە وە یا خەتەر
ستارەیە وە یا قەمەر چییە دیارە جیلوەگەر
کەچی نیگاری سیمبەر لە تەرفی بەردە هاتە دەر
وەکو قەمەر کە دێتە دەر لە کیسوەتی غەمامەوە
کە قورسی ڕووی وەدەر کەوت لە بن سەوادی بورقوعی
شوعاعی دا بەزیللی شەو ڕوخی مەهی موقەننەعی
لە زەڕنیگاری میقنەعی مولەووەنی مولەممەعی
لە زیوەری مورەسسەعی موسەللەسی مورەببەعی
دوو سەد مەهی موقەننەعی نیشان لە سەقفی بامەوە
سەباحەتی سوهەیل ئەگەر سوهەیلی تاجدار بێ
نەزاکەتی نیهال ئەگەر بەری نیهال نار بێ
تەراوەتی بەهار ئەگەر بەهار نافەدار بێ
حەلاوەتی بەهار ئەگەر نەباتی غونچەدار بێ
تەزووری کۆهسار ئەگەر عیقابی بێ بەدامەوە
بەهاتنی جەمالەکەی بەزولفی پڕ عەبیرەوە
چەم و خەمی دوو سونبولی بەتابوشی حەریرەوە
یەکێ بەڕەنگی قیرەوە یەکێ بەڕەنگی شیرەوە
جیهانی دەستەگیر دەکرد لە فەقیر تا ئەمیرەوە
بەشاوە تا موشیرەوە لە خاس تا بەعامەوە

ئەدەب لە وەسف نەوەستاوە، بزووتنەوە و ڕووناکی پەرییەکەی بەئەستێرەی زوهرە و مشتەری دەچوێنێ، بەڵام بەڕاستی تەنیا لەمانە جوانتر نەبووە، بەڵکو لە بوتەکانی کاشغەر و نازەنینانی کشمیریش ڕەنگینتر بوو. شاعیر سەری لێ شێواوە نازانێ ئەمە



فریشتەیە یا ئادەمزادە، ئەستێرەیە یا مانگە. لەپڕ کچێکی لەش زیوین لە پەردە هاتە دەرێ، وەکو مانگێک بوو لە ناو هەوردا هەڵبێ. کە ڕووی دەرکەوت لە ژێر پەچەی ڕەشی، ڕووناکی دایە شەو. تیشکی ئەستێرەی سیوەیل (سوهەیل) و نەرم و نۆڵی درەختی تازە نەمام و تەڕی و شیرینی بەهار لەو پەرییە دەهاتنە جیلوە. بەهاتنی ئەو جوانە ئەمیر تا هەژار، گەورە تا بچووک خۆیان خوار دەکەنەوە لە پێشی و کڕنووشی بۆ دەبەن.

ئەدەب بەم پێنجینانە دوایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

قوسووری عەقلی عاریفان دوو توڕڕەیی موشەووەشی
فتووری زوهدی زاهیدان سەوادی خاڵی دڵگەشی
بەتیرەکەی لە تورکەشی دوو هیندوویی کەمان کەشی
دوو تورکی مەستی سەرکەشی نیگاهی نێرگسی گەشی
بەقەتلی عاشقانی خۆی بەچەندە ئیهتیمامەوە
مەلەنگ و مەست و مەی زەدە بەچەندە ئاب و تابەوە
بەڕەنگی ئافتابەوە بەڕوویی ماهتابەوە
بەچەشمی نیم خوابەوە لە نەشئەیی شەرابەوە
بەڕائیحەی گولابەوە لە زولفی پڕ لە تابەوە
چ پایە ئینبیساتی دڵ لە لەعلی پڕ موزابەوە
چ گوڵعوزار و گوڵ بەدەن چ دلڕوبا وو دل شکەن
چ خۆش ئەدا وو خۆش سوخەن شەکەرلەب و شەکەردەهەن
بەجەستە بەرگی نەستەرەن بەتوڕڕە وەک پەری زەغەن
پەری زەغەن بەسەد شکەن تیرازی بەرگی نەستەرەن
شکا سەباحەتی چەمەن بەقامەتی نەمامەوە

ئەدەب لە کۆتاییدا وەک لە سەرانسەری شیعرەکە دەردەکەوێ هەموو شتێکی تێکەڵ و پێکەڵ کردووە، گەلێ شتی هێناوە و تێکی ترنجاندوونەتە ناو یەکتری، بەڵام وەستایانە مۆزاییکێکی ڕەنگینی دروست کردووە، وشە و تەعبیر سەما دەکەن لەگەڵ ئیقاعی ئاوازی کێشی عەرووز و قافیە.

ئەو پەرییە جوانە قژ و بسک و زولفی شێواوە، خاڵ و چاوی مەستی خەواڵووە، بۆن و عەبیر زولفی بەهار گوڵاوپژێن دەکا. لەشی گوڵە، شەکر لە دەمی دێتە دەرەوە، قسە خۆشە،

سنگ و بەرۆکی گوڵی نەستەرەنە، بەنێوچەوان لە باڵندەی زەغەن دەکا، کە دەردەکەوێ جوانی چیمەن و مێرگ و مێرغوزار و باغ و باغات دەشکێ.

سەرانسەری ئەم شیعرە بریتییە لە دەرکەوتنی جوانێک لە پشت پەردە، ڕێکەوتێکی خۆش و گرنگ بووە بۆ شاعیر، خۆشەویست بەنازوفیزەوە لە جێی خۆی وەستاوە و هەموو بزووتنەوەیێکی نەرمی سەمایێکی ئاسمانی بووە، ئیتر ئەدەب بۆ جوانی بەژن و باڵا و هەموو ئەندامانی لەشی شیعری وتووە و گۆرانی و سروودی چڕیوە.

### «کچ»ی ئەدەب بەیادی نالی

نالی شیعرێکی هەیە بەم دێرە دەست پێ دەکا:

عیشقت کە مەجازی بێ خواهش مەکە ئیللا کچ
شیرین کچ و لەیلا کچ، سەلما کچ و عەزرا کچ

لەو شیعرەدا هەست بەچێژی دڵداری دەکرێ بەپێی ئەو بیروڕایانەی لەو سەردەمەدا لە ناوەوە بوون. هەندێ زاراوە بۆ ئەو جۆرە دڵدارییانە بەکار دەهێنران وەکو دڵداری بەکچ، دڵداری بەکوڕ، دڵداری سۆفیزم یا دڵداری کردگاری، عیشقی حەقیقی و مەجازی و هی دیکە. نالی لە شیعرەکەیدا لە ناو ئەم زاراوانەدا سووڕاوەتەوە، بەڵام بێ گومان بەڕوونی دیارە لایەنی دڵداری زەمینی (مەجازی) گرتووە و ژن بەلای ئەوەوە تەواوکەری پیاو بووە بەو مانایەی کاتێ مێبازی بەخۆشی و شادی دەبەنە سەر.

لە دوای نالی شاعیری ڕەندی کورد حەریق لە شیعرێکیدا بەرپەرچی نالی دەداتەوە، بیروڕاکانی نالی ڕەت دەکاتەوە، دەوری کچ لە دڵداریدا دەسڕێتەوە، واتە عیشقی مەجازی بەکارێکی نارەسەن لە قەڵەم دەدا، تەنیا باوەڕی بەعیشقی حەقیقی بووە، بەناوی سۆفیزمییەوە نەوەکو هەتیوبازی، بۆ ئەمە شیعرێکی داناوە و وشەی «کوڕ»ی کردووە بەپاش قافیە بۆ ڕەتکردنەوەی شیعرەکەی نالی.

لە دواییدا شاعیری ئەم ناوەمان ئەدەب وەکو ناوبژیکەرێک لە نێوان نالی و حەریق شیعرێکی هۆنیوەتەوە هەرچەندە پاش قافیەی «کچ»ە، بەڵام لایەنی هەردووکیان دەگرێ، هیچ کامێکیان ڕەت ناکاتەوە. جگە لەوە ئەدەب زۆر خۆی خەریک کردووە بۆ وێنەگرتن و دەربڕینی کوڕ و کچ لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی تایبەتی ئادەمزاددا. هەموو بیروڕاکانی ئەدەب ئەوە دەگەیەنن ئەم دوو دیاردەیەی هەموو کۆمەڵانی خەڵقی سەر ڕووی زەوی، کوڕ و کچ یەکتری تەواو دەکەن. بێ یەکتری هیچ کامێکیان ناژی. ژیان لەسەر ئەوان دانراوە. لە



هەر یەکێکیاندا ئەگەر جوانییێک ببینێ جوانییێکی دیکە بۆ ئەویتریان دەدۆزێتەوە، بۆیە دەبینین ڕستەی «کوڕ یا کچ» و «کوڕ و کچ» زۆر دووبارە دەکاتەوە لە شیعرەکەیدا. هەر چۆنێ بێ ئەو سۆزییانەی ئەم شاعیرانەیان هان داوە، هەمووشیان لە شاعیرە گەورەکانن نالی و حەریق و ئەدەب، بەم بەرهەمانەیان دیوانی شیعری کوردییان ئاوەدان کردۆتەوە.

ئەدەب بەم دێرانە دەست بەهۆنینەوەی شیعرەکەی دەکا:

بۆ ئەو کەسە عیشقی بێ فەرقی نییە کوڕ یا کچ
هەرچەندە کە مەعلوومە فەرقی چییە کوڕ یا کچ
بۆ ئەو دڵەی شەیدا بێ فەرقی نییە هەر لا بێ
بەڵکە لە هەموو لا بێ ئەولا کوڕ و ئەملا کچ
بۆ عیشقی مەجازی تۆ بۆ مەحرەمی ڕازی تۆ
شەوگاری درازی تۆ ئەعلا کوڕ و ئەحلا کچ

ئەم دێرانە ئەوە دەگەیەنن ئەدەب وەرامی هەردوو شاعیر نالی و حەریق دەداتەوە، بۆیان ڕوون دەکاتەوە کە کوڕ و کچ هیچ نەبێ لە لایەنی جوانی و ئیلهامی شیعرییەوە جیاوازی لە نێوانیاندا نییە.

ئینجا دەکەوێتە وەسفی پەیکەر و ڕەوشتی هەردووکیان:

کوڕ یا کچی سیمین تەن هەردوو گوڵی یەک گوڵشەن
هەردوو سەنەمی ئێمەن لاتە کوڕ و عوززا کچ
کوڕ یا کچی لەب نۆشین هەردوو بەڕوخی ڕەنگین
هەردوو بەمەزەن شیرین قەندی کوڕ و حەڵوا کچ
کوڕ یا کچی سیمین بەر هەردوو بەخەتن عەنبەر
هەردوو وەکو یەک دلبەر ڕەعنا کوڕ و زیبا کچ
کوڕ یا کچی لالە ڕوو شیرینە بەمە هەردوو
وەک نوقڵی موهەننا کوڕ وەک شەهدی موسەففا کچ
کوڕ یا کچی خۆش مەنزەر یەک پرتەو و دوو پەیکەر
وەک عیقدی سوڕەییا کوڕ وەک ئەختەری سەڕرا کچ
کوڕ یا کچی موشکین موو هەردوو بەڕمن ئاهوو
تیری نیگەهی هەردوو دڵدۆزە کوڕە یا کچ

کوڕ یا کچی خۆش سووڕەت یەک جەننەتە یەک لەززەت
کوڕ بۆیی وەکو کەوسەر قەد شاخەیی تووبا کچ
کوڕ یا کچی تەن نازک هەردوو بەمە ئیعجازن
لەب وەک دەمی عیسا کوڕ ڕوو وەک کەفی مووسا کچ
کوڕ شەهدی لەبی مەعلووم کچ وەک عەسەلی بێ مووم
یەک لازمە یەک مەلزووم نەشئە کوڕ و سەهبا کچ

لە وەسفەکانی ئەم بەشەیدا ئەدەب لەسەر ئەو باوەڕەیە هەریەکە لە کوڕ و کچ جوانی خۆی هەیە تا لە خودایەتی بوتپەرستیشدا کوڕ و کچ هەیە، وەکو عەرەبەکانی پێش ئیسلام بوتیان هەبوو بەناوی «لات» و «عوززا». لە دوای ئەمە شاعیر کۆمەڵێک وێنەی داهێنراوی هونەری دروست دەکا، وەک لە شیرینی لێویان دەڵێ یەکێکیان قەندە و ئەوی دیکەیان حەڵوا. جوانی تەنیا لە کچدا نییە، لە کوڕیشدا هەیە، کوڕ نوقڵە و کچ هەنگوینە. کوڕ و کچی بەدیەن جوان دوو پەیکەریان هەیە بەڵام یەک پرتەو. بۆ گەورەکردن و ڕێزلێنانی بێ سنوور لە کوڕ و کچ ئەدەب کردەوە و کەراماتی پێغەمبەرانیان پێ دەبەخشێ، وەک لێوی کوڕ بەدەمی عیسا و ڕووی کچیش بەدەستی مووسا دەچوێنێ. بێ گومان کردەوە و توانای ئەم پێغەمبەرانە لای هەموو کەس ئاشکرایە.

ئینجا شاعیر دێتە سەر ئەوەی ژیان بەبێ هەردووکیان نابێ.

بێ هەردوو حەرامە عەیش بێ روکن و قەوامە عەیش
ئەو وەختە تەمامە عەیش یومنا کوڕ و یوسرا کچ
وا خۆشە بەهەر ئانت پڕ بێ لە شەبوستانت
سەد حووریی غیلمانت غیلمان کوڕ و حەووا کچ
کوڕ لالەیی گوڵزارە کچ لوعبەتی فەرخارە
بۆ وەختی تەماشا کوڕ بۆ سوحبەتی ناوا کچ
کوڕ سەروی گوڵستانە کچ عیشرەتی مەستانە
بۆ هەمدەمی سەحرا کوڕ هەنگامی تەوانا کچ

ئەدەب لەم دێرانەدا ئەوە دەردەبڕێ ئەو کاتە ژیان خۆش دەبێ ئەولا کوڕ و ئەملا کچ بێ. لە بەهەشتیشدا کوڕ و کچ هەیە، غیلمان و حووری. بۆ تەماشاکردن و گەشتی ناو گوڵستان و هاودەمی لە چۆڵ و بیاباندا کوڕ قارەمانە. بۆ ماچوموچ و یاری تەنیایی و



سەردەمی چێژ و خۆشی کچ بووکی ناو پەردەیە.

ئەدەب بەم دێرانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

کوڕ شاهیدی سەیرانی کچ دلبەر پەنهانی
بۆ بەزمی موهەییا کوڕ بۆ عەیشی موحەللا کچ
کوڕ ساقیی سەهبایە کچ عوزری پەزیرایە
بۆ مەجلیسی مەستان کوڕ بۆ مەسنەدی مەشها کچ
کوڕ ڕوویە وەکو مەهتاب کچ موویە وەکو سەنجاب
بۆ پرتەوی ئەیوان کوڕ بۆ بەستەری دیبا کچ
ئاغازی سەبووحی کوڕ ئەنجامی سوراحی کچ
مەعشووقەیی ئەزحا کوڕ مەحبووبەیی زەلما کچ
کوڕ بۆ دەمی فەروەردین کچ بۆ چلەیی هاوین
کچ بەهمەن و کوڕ تشرین گەرما کوڕ و سەرما کچ
بۆ عەیشی (ئەدەب) هەردەم وەک ماچی مەیی دەرغەم
خەندەی کچە جامی جەم بادە کوڕ و مینا کچ
(نالی) کە ئەوەی دیبا ئەلبەتتە دەبوو وتبای
(عیشقت کە مەجازی بێ خواهش مەکە ئیللا کچ)

لەم دێرانەدا ئەدەب وێنەی هونەری زۆر ورد دەدۆزێتەوە یا دروست دەکا لە سیفەتی کوڕ و کچ بۆ ئەوەی بەراووردیان بکا لەگەڵ یەکتریدا. لەمەدا دەڵێ کوڕ مایەی سەیرانی خەڵکییە، کچ دلبەری نهێنی و تەنیاییە. کوڕ بۆ بەزمی کارێکی حازر بەدەستە، کچ بۆ ژیانی جوانییە. کوڕ مەیگێڕی شەراب و ئەندامی کۆڕی مەستانە. کچ بۆ ئارەزووی شەهوەتە، ئەزحا و زەلما لە داستانی ئەڤینیدا دلبەر و دڵداریان بووە.

ئینجا شاعیر دەکەوێتە ناو بەزمی مێبازییەوە و دەڵێ کوڕ زادەی نەورۆز و بەهارە، بەڵام کچ نەوەی گەرمای هاوینە، کچ چلەی زستانە، کوڕ مانگی تشرینە، گەرما بۆ کوڕە و سەرما بۆ کچ.

ئەدەب لەسەر وەسفە جوانەکانی بەردەوام دەبێ و دەکەوێتە وردکردنەوەی خەیاڵی و دەڵێ: لە سەردەمی خۆشیدا خەندەی کچ جامی جەمە، بادە کوڕە و سوراحی کچ. ئینجا چەپڵە بۆ نالی لێ دەدا و دەڵێ: ئەم هەموو شتانەی زانیوە بۆیە وتوویەتی، عیشقێک

ئەگەر مەجازی بێ پێویستە تەنیا داوای کچ بکرێ. ئیتر ئەدەب بەنیوە دێری یەکەمی سەرەتای شیعرەکەی کۆتایی بەداستانەکە دێنێ. ئەو زنجیرە «کوڕ و کچ»ەی نالی و حەریق و ئەدەب دیوانی شیعری کوردی سەدەی نۆزدەمیان ڕەنگین کردووە.

## دیالۆجی دڵدار و دلبەر

ئەدەب هەندێ شیعری تەرخان کردووە بۆ گفتوگۆ لە نێوان خۆی و دلبەر. نیوە دێری یەکەمی لیریکەکان بریتییە لە پرسیارێک، ڕوونکردنەوەیێک لە دلبەری دەکا، ئەویش لە نیوە دێری دووەمی هەموو شیعرەکان وەرامی پرسیارەکانی دەداتەوە. شاعیر لە پرسیار و وەرامەکاندا هونەری نواندووە لە بەرجەستەکردنی هەست و نەستی دەروونی خۆی و جوانی یارەکەی و هەرچی پێوەندی بەو سۆزەوە هەیە کە هەردووکیانی لەگەڵ یەکتریدا کۆکردۆتەوە.

- ١ -

لە شیعرێکیدا ئەدەب دەڵێ:

گوتم زولفت لەسەر کولمت بەدایم بۆچی بێ تابە

گوتی ئەفعی لەسەر پشکۆ قەراری پێچش و تابە

گوتم کەوتۆتە گردابی غەمی عیشقت سەفینەی ئان

گوتی غەرقی جەمالی من چ باکی مەوج و گردابە

گوتم پەژموردە بوو جانا گوڵی عومرم لە هیجرانت

گوتی پەژموردەیی وەسڵم هەمیشە سەبز و شادابە

گوتم دڵ خەستەیی دەرد و فیراقی تۆم عیلاجم کە

گوتی چارەت بەگوڵبەرگی تەڕی خۆش ڕەنگی سیرابە

گوتم گێسوویی پڕ نێشت لەبەرچی مایلی ڕووتە

گوتی نەتبیستووە عەقرەب ئەگەر مایل بەمەهتابە

گوتم سەوداسەری چینی دوو زولفی عەنبەرینی تۆم

گوتی عیللەت بەسەودایە لە فیکری ڕەفعی سەودابە

گوتم ماچی لەبی لەعلت شەوی دی مەستی بۆ کردم

گوتی ئەلبەتتە ماچی من بەسەد شیشەی مەیی نابە



گوتم جەور و ستەم تا کەی نیگارا مروەتێ ئاخر

گوتی چبکەم (ئەدەب) ئەمرۆ جەفا بۆ دلبەران دابە

پرسیارەکانی ئەم لیریکە هەوێنی شیعرایەتی تێدایە، وەرامەکان وێنەییێکی دیکەی داهێنانی هونەرین، وەکو ئەوەی شاعیر دەپرسی: بۆچی زولفت بێ ئۆقرەیە لەسەر کولمت؟ دلبەر دەڵێ: مار لەسەر ئاگر چۆن ئۆقرە دەگرێ! شاعیر دەپرسی: کەشتیی گەردوون لە ناو گێژاوی غەم و پەژارەی دڵداریی تۆدایە. دلبەر دەڵێ: کەسێ لە ناو جوانی مندا نوقوم بێ چۆن لە شەپۆڵ و گێژاوی زەریا دەترسێ. شاعیر دەپرسی: گوڵی تەمەنم لە دووری تۆ سیس بووە. دلبەر دەڵێ: ئەوەی ئازار لە دووری من دەچێژێ هەمیشە تەڕ و ئاودارە. شاعیر دەڵێ: نەخۆشی من لەبەر دووری تۆیە دەرمانم کە. دلبەر دەڵێ: بەماچی لێوم چاک دەبییەوە. شاعیر دەڵێ: لەبەر چی زولفت هەمیشە لەسەر کولمتە. دلبەر دەڵێ: من شێت و شەیدای زولفی بۆنداری تۆم. دلبەر دەڵێ: ئەمە بەڵگەی شێتییە، ئیتر بیر لە چارەسەری خۆت بکەوە. شاعیر دەڵێ: شەوی ڕابردوو ماچێکی دەمت سەرخۆشی کردم. دلبەر دەڵێ: بێ گومان ماچی من بارتەقای سەد شووشەی شەرابە. شاعیر دەڵێ: تا کەی ستەم و زوڵمی تۆ بچێژم، مروەتت هەبێ. دلبەر دەڵێ: ئەی ئەدەب هیچ بەمن ناکرێ، زوڵم و زۆرداری بۆ دلبەران کارێکی چاکە.

- ٢ -

هەر لەم بابەتەوە ئەدەب لە شیعرێکی دیکەیدا دەڵێ:

گوتم با کەم بناڵێنم نەڵێم دەردم بەکەس چاکە

گوتی ناڵینی جارجارت لە دوور بێ وەک جەرەس چاکە

گوتم مورغی ڕەوانی من ڕەوانە لەو تەنە بێ تۆ

گوتی ئەو مورغە بێ باڵە لە لای من بێ قەفەس چاکە

گوتم مەنعم دەکا زولفت لە پابەندی لەبی شەهدت

گوتی شەهدی دەهانی من بەبێ نێشی مەگەس چاکە

گوتم حەبسی دوو هیندووم من هەتاکو مەستی خاڵی تۆم

گوتی مەستی خەراباتی لە پێوەندی عەسەس چاکە

گوتم بۆ گوڵبوونی قەددت خەیاڵی گوڵچنینم کرد

گوتی بۆ سەروی ئازادم کە نەتبێ دەستڕەس چاکە

گوتم میهری بوتان تا کەی خەیاڵم عوزلەتەجانا
گوتی عیشقی پەری ڕوویان هەتا ئاخر نەفەس چاکە
گوتم بۆ چ ڕێم نییە جاری بەگوڵزارت گوڵی نەورەس
گوتی گوڵزاری نەوخیزم (ئەدەب) بێ خار و خەس چاکە

پرسیار و وەرامەکانی ناو ئەم شیعرە هەر وەکو ئەوەی پێشووە. شاعیر دەڵێ: با کەم بناڵێنم و چاکتر وایە دەردم بەکەس نەڵێم. دلبەر دەڵێ: کارێکی باشە جار جارە لە دوورەوە ناڵەت بێ. شاعیر دەڵێ: باڵندەی ڕووحم لە ناو لەشمدا کە تۆ لەوێ نەبی چاکتر ئەوەیە بڕوا. دلبەر دەڵێ: ئەو باڵندە بێ باڵە باشتر وایە لە ناو قەفەسدا بێ. شاعیر دەڵێ: زولفت لێم ناگەڕێ هەنگوینی لێوت بمژم. دلبەر دەڵێ: هەنگوینی ناودەمم پێویستە دوور بێ لە چزووی مێشەنگوین. شاعیر دەڵێ: زولفت حەبسی کردووەم چونکە سەرخۆشی خاڵی تۆم. دلبەر دەڵێ: دەموچاوی من مەیخانەیە، هەر کەسێک سەرخۆش بێ پێویستە پاسەوان کۆت و زنجیری بکا. شاعیر دەڵێ: بەتەمابووم لە گوڵستانی ناو قەدت گوڵ بچنم. دلبەر دەڵێ: بالاّم سەروی ئازادە، پێویست ناکا دەستی بۆ درێژ بکەی. شاعیر دەڵێ: تا کەی خۆشەویستی لەگەڵ جوانان، حەز بەگۆشەنشینی دەکەم. دلبەر دەڵێ: دڵداری لەگەڵ پەری ڕوخساران تا دوا هەناسە شتێکی چاکە. شاعیر دەڵێ: بۆ ڕێگەم نادەی جارێ بەگوڵزارت شاد بم. یار دەڵێ: ئەی ئەدەب گوڵزاری نەونەمام بێ دڕک و داڵ باشە.

## شیعری ئەدەب بۆ گۆرانی

یەکێ لە خاسیەتەکانی هەندێ لە شاعیرانی موکریان ئەوەیە شیعریان هەیە بەتایبەتی وەک سروود هۆنراونەتەوە بۆ گۆرانی چڕین. ئەم جۆرە شیعرانە لە هەموو ڕووییێکەوە، لە ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە نزیکن لە شیعری میللی سەرزاری نەنووسراو (فۆلکلۆر).

لێرەدا هەندێ کۆپلە لە گۆرانییێکی ئەدەب گوڵبژێر دەکەین:

بەبالاّ بلّند و بەقەد شووش و باریک
جەمالی ڕووناکە شەوی هەوری تاریک
بۆن وەنەوشە زۆر پێ خۆشە
بۆ مەزەی دڵ ماچی خۆشە

***



برادەر بپرسن (ئەدەب) بۆچ نەماوە
بەبۆنی گوڵان شووشەکانی شکاوە
ڕوو چراغە سینە باغە
ساحیبی شەوق و دەماغە

***

چ خۆشە بەخەلعەت بدا جورعەیی مەی
دڵ و جان بەپێشکەش لەبی ناسکەکەی
خەندە شیرین لەعلی ڕەنگین
قەسدی جان و غارەتی دین

***

جوانی تۆ لەم عەسرەدا بێ نەزیرە
دڵم مورغی سەحرا بەدامی تۆ گیرە
مورغی چاکم زۆر بێ باکم
حەیفە لەو داوەت هیلاکم

***

دوو نارنج لە باغی گولاّندا تەمیزن
دوو لیمۆی کاڵ و دوو سێوی لەزیزن
باغی سێوان گوڵ لە لێوان
شێت و شەیدا کەوتمە کێوان

لەم گۆرانییەدا ئەدەب سیستێمی بەندی بەکارهێناوە. هەر بەندی لە چوار نیوە دێڕ شیعر پێکهاتووە، دوو نیوە دێری یەکەمی لە بەحری عەرووزی موتەقاریب چوار جار (فعولن)ی تەواوە. دوو نیوە دێری دووەمی لەسەر بەحری عەرووزی ڕەمەل دووجار (فاعلاتن)ی تەواوە. قافیەی هەر چوار نیوە دێری بەندەکە بەم جۆرەیە (ا ا ب ب...).

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بریتییە لە شیعری وەسف و دڵداری، بەزمانێکی ئاسان هۆنراوەتەوە بۆ ئەوەی بۆ گۆرانی چڕین دەست بدا.

***

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم لە کوردستانی باشوور، لە تازە پایتەختی میرنشینی

بابان لە سلێمانی سەرۆکایەتی رینیسانسی شیعری کلاسیکی کوردی کەوتبووە ئەستۆی نالی. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم کە بزووتنەوەکە لە هەموو هەرێم و ناوچەکانی کوردستانی باشوور بڵاوبووەوە کۆمەڵێک شاعیری بەدیمەن پەیدابوون. یەکێ لە شاعیرە هەرە ڕەندەکانی ناوچەی موکریانی ئەو سەردەمە ئەدەب بوو. هەموو هۆیێکی ژیانی خۆشی بۆ ئەم کەسە ڕەخسا بوو. بەپێچەوانەوە تەندروستی باش نەبوو. نەخۆشی لەرزۆکی (ئیفلیجی) پەرێشانی کردبوو. ئەمە بووە هۆی ئەوەی سەرانسەری ژیانی بێ ئازار نەبێ و تەمەنیشی کورت بێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە بەرهەمی شیعریدا بێزاری لە ژیان بەرچاو ناکەوێ. ئەگەر وێنەی ئێش و ئازار و ناخۆشی لە شیعریدا ببینرێ، ئەمەی وەکو هەموو شاعیرانی دیکەی کوردە. مەسەلە دڵداری و دووری لە یار و پاڕانەوە و خۆ بەکەم زانینی شاعیرییانە و عاشقانەیە.

ناوەڕۆکی شیعری ئەدەب دڵدارییە لەگەڵ ژنی جوان، ئەو ژنە دەتوانرێ دیاری بکرێ، نوسرەت خانمی خێزانی بووە. هەموو خۆشی ژیانی لە جوانی لەش و کرداری جوانی ئەودیوە. ئەدەب تا کۆچی دوایی کردووە ئەو ژنەی خۆش ویستووە، بەڵام نازانرێ ژنەکە هەڵوێستی بەرامبەر بەئەدەب چۆن بووە لە دوای ئەوەی لێی دوور کەوتۆتەوە! لەوانەیە لەو سەردەمەشدا سۆزی بەرامبەر بەشاعیر وەکو خۆی بووبێ هەتا ئەگەر مێردیشی کردبێتەوە، چونکە نەحەوانەوە لەگەڵ ئەدەب زیاتر لەبەر نەخۆشییەکەی بووە. هەر چۆنێ بێ ئەم دڵدارییە بووەتە هۆی ئەوەی ئەدەب دیوانێکی ڕەنگینی شیعری کوردی پێک بێنێ.

وەستایەتی شاعیر هونەروەرانە لەو وێنە نوێیانە ڕەنگی داوەتەوە، دێرە شیعر توانای شاعیرییەتی ئەدەب دەستنیشان دەکا. هەڵبژاردنی وشەی فەرهەنگی و زاراوەی زانستی و جۆری دروستکردنی ڕستە و قانگدانی بەکێش و قافیە و مۆسیقا و ڕیتمی دەنگی تیپەکان گێتییێکی بێ کەموکووڕی دروست دەکەن کە لیریک و غەزەل و قەسیدەی پێ دەوترێ.

یەکێ لە ئەدگارە هەرە گرنگەکانی شیعری ئەدەب ئەوەیە شێوازی نووسینی یەک جۆرە، واتە تایبەتییە بەخۆی. یەکێکی شارەزا لە شیعری ئەدەب ئەگەر لیریکێکی دەست بکەوێ و نازناوی شاعیری تێدا نەبێ زۆر ئاساییە بەئاسانی شیعرەکە بناسێتەوە و بەبێ سڵەمینەوە بیخاتە ناو دیوانی شاعیرەوە. بەکورتی ئەدەب یەکێکە لە شاعیرە دیارەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی لە ڕۆژی پەیدابوونییەوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم.

## بەشی بیستەم

# خەلیل

**١٨٦٣ - ١٩٢٣**

## ژیانی شاعیر و شیعری لیریکی

### ژیانی شاعیر

شاعیری ئەم ماوەیەمان بەم دێرە شیعرانە پیشەو جێگەی خۆی لە کۆمەڵدا دیاری دەکا:

خـۆ تۆ ئەزانی من کـەی ئەمـیـرم
نـە باشـکـاتـبم، وە نـە مـــودیـرم
کـاسـبکار و هەم مـەلای فـەقـیـرم
دائیــــمــولـدەوام هەرهاد نەدێرم
شاعیری بێ شەوق هەم بێ شەعیرم
بێ ڕان و مـایین هەم بێ بەعـیـرم

هەندێ لایەنی دیکەی ژیان و نازناوی شیـعری خۆی لە سەرانسەری دیوانی شیـعریدا ڕوون دەکـاتەوە. ئەگەرچی بەزۆری «خـەلیـل»ی بەکـارهێناوە، بەڵام «خـەلیـل منەوەر» و «محەمەد خەلیل» و «مەلا خەلیل» و «میرزا خەلیل» و «میرزا»ش دەبینرێن، وەکو خۆی لە هەندێ لە شیعرەکانیدا دەڵێ:

کـاتیـبـولحـورووف خـەلیـل منەوەر
ئینەسی و پەنج بەوەجـە دەفـتـەر
***
خەلیل جە دەوران مـەکـەرە گـفـتـار
قانیع بەر بەحەق بکەر ئیسـتـیغفار
***
زارو مەحجووبم جە لای خاص و عام
محەمەد خەلیل مەنشوور بەنغـام
***



بەگـفـتـەی بەندە فـەقـیـر زەلیلەن
کـاتیـبـولحـورووف مـەلا خـەلیلەن
***
من مـیـرزا خـەلیل دیوانەی دەلیم
دوعـاگـۆی دەوڵەت پابۆسـەی عـەلیم
***
کاتیبولحورووف کەمـینەی کەمـتەر
خـــەلیل ئیـبن خـــزر منەوەر

لەمەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە شاعیر لە بنەماڵەیێکی ڕەنجبەری هەژار بووە، هەموو کار و پیشەیێکی تاقی کردۆتەوە بۆ ئەوەی بەڕەنجی شان و هەوڵ و کۆششی خۆی گوزەران بکا و دەست لە کەس پان نەکاتەوە.

خەلیل کوڕی خدری کوڕی ئەحمەدی کوڕی خەلیلە، لە هۆزی کاکەیی، یادگاری ئایینی کۆنی کوردی یارسانە. لە ساڵی ١٨٦٣ لە گەڕەکی موسەڵڵا لە شاری کەرکووک لە دایکبووە، هێشتا ساوا بووە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە. خانزادی دایکی بەهەژاری بەخێوی کردووە. بەڵام بێ باوکی وەکو بۆشاییێکی سایکۆلۆجی لە دەروونی خەلیل زۆر ناخایێنێ لە تەمەنی دە ساڵیدا بێ دایکیشی دێتە سەر، بەکۆچی دوایی دایکی بەتەواوی کۆستی دەکەوێ و هەتیوی بەخۆیەوە دەبینێ و ناچار دەگەڕێتەوە مەڵبەندی باب و باپیرانی و لە خوێندن بەردەوام دەبێ.

شاعیر هێشتا لە تەمەنی لاویدا دەبێ کە لە دێی عەرەب کۆیی وانە بەمنداڵان دەدا و خەریکی وردە کشتوکاڵیش دەبێ. بەڵام لەم هەوارەدا ئەوەندە ئۆقرە ناگرێ و ڕوو دەکاتە تۆبزاوە و زۆری پێ ناچێ لەگەڵ کاربەدەستان ڕێک ناکەوێ و دەکەوێتە مشتومڕ، ناچار بەرەو کفری دەچێ و لەوێ خەریکی کار و کاسبی دەبێ. لە دوا ساڵانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم میرزا خەلیل هەر لە کفری بووە، پێش جاڕدانی جەنگی یەکەمی گێتی (سەفەربەر) کفری بەجێ هێشتووە لە پاش مردنی مەنیجەی خێزانی کە کارێکی گەورەی تێ کردووە. ئیتر لە مەڵبەندی بنەماڵەیی خۆی، هەرێمەکانی کاکەییان نیشتۆتەوە، بەشوێن کار و گوزەران گەڕاوە تا لە عەلی سەرای بێوەژنێکی دۆزیوەتەوە و بۆ جاری سێیەم بنەماڵەیێکی هەشت کەسی پێکهێناوە، خەریکی فێرکردنی منداڵان و جووتیاری و گاوانی بووە.

کە سەفەر بەر جارِ دراوە لە لایەن دەسەلاتی عوسمانلییەوە میرزا خەلیل لە تاووغ (داقووق) بووە، ناچار گەڕاوەتەوە شوێنەواری خۆی، لەم کاتەدا ڕەشبگیری و گرانی گەورە دەستی پێ کردووە، سوپای عوسمانلی کەوتۆتە تالانکردنی خەڵکی، زۆرداری و گرانی و جەنگ تەنگیان بەخەڵکی هەژار و بێ دەسەلات هەڵچنیوە، هەزاران کەس بوون بەقوربانی جەنگی تورک و ئینگلیز، لەناو ئەمانە ژن و منداڵی میرزا خەلیلیش کۆتاییان پێهاتووە.

ئیتر شاعیر ناچار بووە ڕوو بکاتە ناوچەی داوەدە، کە لە ڕۆخانە دەپەڕێتەوە کتێب و دەفتەرەکانی ئاو دەیانبا، بەم جۆرە بەتەنیا بەرەو دووز دەڕوا و لەوێوە بۆ کفری، بەلام چاوی بەرایی نادا لە کفری بمێنێتەوە و بیکا بەمەڵبەندی دوارۆژانی ژیانی، ئیتر سەری خۆی هەڵدەگرێ و ڕوو دەکاتە سیروان و لێی دەپەڕێتەوە، ئینجا دەچێتە ناو هۆزی کاکەیی و دوایی ژیانی بەگۆشەگیری و لات و هەژاری دەباتە سەر تا لە ساڵی ١٩٢٣ کۆچی دوایی دەکا. بلاوکەرەوەکانی شیعری خەلیل منەوەری شاعیر هەردەوێڵ کاکەیی و مستەفا نەریمان ڕاستییێکی گەورەیان خستۆتە ڕوو کە ناویان ناوە «شاعیری چەوساوەکان».

## شیعری شاعیر

شیعری میرزا خەلیل لە ڕووی ناوەڕۆکەوە خەریکی تۆمارکردنی ڕووداوی ڕۆژانەیە، ئەمە بەشێکە لە جموجۆڵی کۆمەلایەتی، لە پاشانا دەبێتە ڕووداوێکی مێژوویی، لەبەر ئەوەیە چوارچێوەی مانای شیعری میرزا خەلیل گەلێ فراوانە و بەشێوەیێکی ئەنسیکلۆپیدی خۆی پیشان دەدا. ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەین ئەگەر پەخشانی کوردی لە نووسیندا، لەو سەردەمەدا باو بووایە شاعیر هەست و نەستی ناوەوەی بەپەخشان دەردەبڕی. بەلام بێ گومان شیعر شێوەی هەرە گرنگ بووە لە ڕۆشنبیری کۆمەڵی کوردەواریدا لەبەر ئەوە تۆمارکردنی هەموو سووچێکی ژیانی خوێندەواری هەر بەشیعر خۆی نواندووە، ئەمەش لە بەرهەمی گەلێ لە شاعیرانی کورد دەردەکەوێ بەتایبەتی لە ناو شاعیرە میللییەکان کە میرزا خەلیل جێگەییێکی دیاری لە ناویاندا هەیە.

شیعری میرزا خەلیل لە ڕووی زمانەوە ساکارە، بەزمانێکی تێکەلاو دەنووسێ، ئەگەرچی لە بنجدا خۆی خاوەنی دیالێکتی گۆرانییە بەلام دیالێکتی کرمانجیی خوارووی گەرمیانی (ناوچەی کەرکوک) کاری تێ کردووە. ڕستە و لێکسیکۆنی سفت و ڕەوانە، کێش دە سیلابی و جووت قافیەیە وەکو زۆربەی هەرە زۆری شیعری دیالێکتی گۆرانی، هەندێ جار یەکێتی قافیەش لە شیعرەکانی دەبینرێ.



لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لە شیعری میرزا خەلیل ئەم تێبینییانە دەبن بەدیاردەی سەرەکی بۆ ناسینی شیعرەکانی:

١- شێوەی چوارینی هەیە، واتە هەر چوار نیوە دێر لەسەر یەک قافیە (ا ا ا ا، ب ب ب ب...) دەبێ؛ وەکو شیعری «ستایشی کوێخا ڕەمەزان» و شیعری «لە کوردە مالان».

٢- یەکێتی قافیە بەکار دێنێ، واتە نیوە دێرەکان هەموویان لەسەر یەک قافیە دەبن؛ وەکو «فەسڵ خەزانەن» و شیعری «لەیلێ گوڵنازەن».

٣- هونەری «شەشین» بۆ دانانی شیعر هەڵدەبژێرێ، واتە دروستکردنی شیعر لەسەر بنچینەی بەند، هەر بەندی شەش نیوە دێر شیعر، بەمەرجێ پێنج نیوە دێری هەر بەندێک لەسەر یەک قافیە دەبێ، دێری شەشەم لە هەموو بەندەکاندا دووبارە دەکرێتەوە؛ وەکو شیعری «مەنیجە خان»، دێری شەشەم «مەڵلا بێ حەیران شوعلەی جەماڵت» لە هەموو بەندەکاندا دووبارە دەکرێتەوە.

٤- بەکارهێنانی چوارین وەکو هونەرێکی سەربەخۆ، بەلام لای شاعیر چوار نیوە دێرەکەی چوارین هەموویان لەسەر یەک قافیە دەبن و بەشێوەی دوو بەیت خۆیان دەنوێنن.

***

شیعری میرزا خەلیل لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دەکرێ بەدوو بەشەوە:

١- شیعری لیریکی (غەزەل و قەسیدە و چوارین = دوو بەیت).

٢- داستان = چیرۆکی شیعری = قەسیدەی درێژ = پۆێم (ناوەڕۆکی لە بەسەرهاتی کۆمەلایەتی و ڕووداوی مێژوویی دەدوێ).

## شیعری لیریکی

ناوەڕۆکی شیعری لیریکی لای میرزا خەلیل دەوڵەمەندە، گەلێ سووچی هەست و نەستی دەروونی ناوەوەی خۆی و تەنگوچەڵەمە و ناگزووری کۆمەڵی دەرەوەی گرتۆتەوە. زۆربەی مەبەسەکانی شیعری نەتەوەکانی ڕۆژهەلاتی لە غەزەل و قەسیدە و چواریندا لە قالب داوە. نموونەی داهێنراوی جوانی لە هەموو مەبەسەکاندا هەیە.

### موناجات و نەعت

موناجات بۆ خودا و نەعت بۆ پێغەمبەر وەکو دوو مەبەسی شیعری جیاواز لە شیعری میرزا خەلیلدا تێکەلاو و تێکهەڵکێش کراون. لە ئەدەبی کوردیدا دەستووری تایبەتی

هەیە بۆ دانانی ئەم دوو جۆرە شیعرە وەکو باسکردن و ناوهێنانی چوار خەلیفەی ڕاشیدین و ئیمام و شێخ و ئەولیای ئایینزاکانی ئیسلام و سەرۆک و سەردارانی تەریقەتەکانی دەروێشی و شتی تریش. ئەوەی لە موناجات و نەعتی میرزا خەلیل دەردەکەوێ ئەوەیە کە بەگشتی لەو دەستوورە لایداوە چونکە لە هۆزی کاکەیی و لەسەر ئایینی یارسان بووە. بەڵام ژیرانە هەندێ شتی لەو دەستوورانە وەرگرتووە کە برا کوردە موسوڵمانە سوننییەکانی باوەڕیان پێی هەیە وەکو گەورە گرتنی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان کە لە بنجدا بۆ ئایینی یارسان هیچ تەنگوچەڵەمەیێک دروست ناکەن، لە سەرانسەری ئەدەبیاتی ئایینییاندا بەچاک و خراپ ناویان نەهێناون، تەنیا موسوڵمانی شیعە بەو کەسانە گرژ دەبن، هەر لەو کاتەشدا شاعیر بایەخێکی زۆری بەعەلی و حەسەن و حوسێن و فاتیمە داوە کە ئەمە بەتەواوی لەگەڵ بیروباوەڕی ئایینی خۆی و ئایینی موسوڵمانیش بەهەردوو ئایینزا گەورەکەیەوە (سوننی و شیعی) دەگونجێ.

میرزا خەلیل بایەخێکی تەواوی بەپێغەمبەر داوە، ئەگەر ئەمەی بۆ ڕازیکردنی کۆمەڵی موسوڵمانی دەوروپشتیشی بووبێ، بەهیچ جۆرێ لە دەستووری ئایینەکەی خۆی نەچۆتە دەرەوە، چونکە پایەی محەممەد پێغەمبەر لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لای یارسانان بەرامبەر بەپلەی پێغەمبەری لای موسوڵمانان بووە. لای ئەوان یەکێک بووە لە یارانی چار مەلەک یا پێنج مەلەک، واتە کە کردگار لەو دەورەدا بەپێی تیۆری دۆنا دۆن لە عەلی خۆی نواندووە، پێغەمبەر یەکێک بووە لە یارانی چار مەلەک. ئیتر میرزا خەلیل کە لە پاڕانەوەکەیدا بایەخێکی تەواوی بەپێغەمبەر داوە لە سنووری بیروباوەڕی خۆی (دۆنا دۆن و چوونە ناو) و بیروباوەڕی موسوڵمانی نەچۆتە دەرەوە، ئەو بیروباوەڕەی کە دەڵێ هەر لە بنەڕەتدا خودا کۆزمۆس (بوونی) لەبەر پێغەمبەری موسوڵمانان (پرتەوی محەممەدی) دروست کرد و ئادەمی خستە سەر ڕووی زەوی بۆ ئەوەی محەممەد پێغەمبەری دوارۆژی لێ بکەوێتەوە، بەم جۆرە میرزا خەلیل دەڵێ:

خەتمولمورسەلین گشت پێغەمبەرەن
شافیعولئومە ڕۆژ مەحشەرەن

لە شەریفی نوور ڕەسول مەننان
ئەنگوشتەر ئاما پەری سلێمان



جە نوور ئەو بی حەزرەت عیسا
مەردەی سەد ساڵە ئەو مەکەرد ئیحیا

جە نوورش ئاما پەی کەلیم تەورات
نازل بی پەرێش عەسای موعجیزات

جە نوور ئەو بی یووسف کەنعان
خەلاس بی جە ڕەنج میحنەت زیندان

جە شەریفی نوور حەبیب ڕەحمان
خەلاس بی ئەییوب جە ڕەنج کرمان

جە نوور مەحبووب ڕەحمانورڕەحیم
بی وە گوڵستان نار پەی ئیبراهیم

جە شەریفی نوور سەیید سەروەر
ڕۆشن بی دوو چەشم یەعقووب پێغەمبەر

خولاسە جە نوور ڕەسوولولئەمین
خەلق بی زی رووح سەما تا زەمین

حەق بەوێش واتەن: «لولاک لولاک
یا رسول الله ماخلقت الا فلاک»

## دڵداری

هونەری ئەڤین و خۆشەویستی و دڵداری لە شیعری میرزا خەلیلدا لەگەڵ شیعری وەسف، بەتایبەتی وەسفی پەیکەر و قاڵبی دلبەر تێکهەڵکێش کراوە. لە شیعری دڵداریدا شاعیر بەشوێن شتی هەست پێکراو و بینراو دەگەڕێ لە سروشتدا بۆ ئەوەی ئەندام و ڕەووشتی دلبەری خۆی پێ بەرامبەر و بەراوورد بکا، لە شیعرە «شەشین»ەکەیدا لە بابەت مەنیجەی تازە بووکییەوە دەڵێ:

مەنیجە خانی     مەنیجە خانی
مەعلوومەن نە عام مەنیجە خانی

عـــــاقڵ و دانا هەم خـــــۆش زبانـی
ســـەنگین و ســـالار هەم ســـام گـــرانی
تەشـــــریف ئاوەردی وەلای عـــــەبداڵت
مـــەڵڵا بی حـــەیران شـــوعلەی جـــەمـــاڵت
ڕۆژی بی مـــەسعـــوود مـــوبارەک ئەختـــەر
فـــــەڕ ووســـــتی وەمـــــاڵ خـــــزر منەوەر
ئێـــران تا تووران ڕۆمـــات ســـەرانســـەر
فــــیــــدای باڵای بۆ ســـــەوڵ نازپەروەر
های نەو شـــەعـــشـــەعـــەی پیـــرۆزە خـــاڵت
مـــەڵڵا بی حـــەیران شـــوعلەی جـــەمـــاڵت
ئێـــران تا تووران حـــەڵەب تا عـــەجـــەم
جـــیـــهـــان گـــەردی کـــەم من وەخـــاتر غـــەم
گـــشت ڕوبع مـــەسکوون بدەم لە قـــەڵەم
هەمـــــتـــــای حـــــوسن تۆ نمەوینم وەچەم
سەد تەحسین لە عـەقڵ فیکر و کـەماڵت
مـــەڵڵا بی حـــەیران شـــوعلەی جـــەمـــاڵت
ئەستەمـوول وەی تەخت سـەر تەخت باڵات
تەهران وەی بـەیان قـــــــەنـدیـل واڵات
مـووسڵ وەی عـەینان سورمەی تورماڵات
کـــرمـــاشـــان وەی بەرگ زەر بافت ئاڵات
مـیـــسـر وەفـیـدای ڕەنگ پڕ شـەوق لاڵت
مـــەڵڵا بی حـــەیران شـــوعلەی جـــەمـــاڵت
یەمـــــەن وەی ئەدەب ڕێزەی ڕێز باریت
عـــــەفـــــەج وەی دندان ڕێزەی مـــــرواریت
دەغـــــارا وەی نام نە عـــــام دیاریت
بەغـداد وەی لەنجـەی شـیـرین نیگاریت
هەولێـر وەی تەئریخ دوو هەفـتـە سـاڵت
مـــەڵڵا بی حـــەیران شـــوعلەی جـــەمـــاڵت



کەرکووک وەی ماران گێسووی کەمەندت
شـارەزوویل وەی شـەوەی شاهان پەسـەندت
ئەسـفـەهان وەی قـەند سـەرقـەمچ بەندت
بەسـرە وەفـیـدای گـوڵ غـونچـەی ڕەندت
بـەدرە وەی هـەیـکـەل ئـاویـزای بـاڵـت
مـــەڵڵا بی حـــەیران شـــوعلەی جـــەمـــاڵت
مـــــــەندەلی وەی تـاق نـەوتـاق دیدەت
سلێـمـانی وەی برۆی قـەڵەم کـەشیـدەت
چەمـچـەمـاڵ وەی زوڵف سیـاه چەمیـدەت
کـــفـــری وەی نەو توول تازە ڕەســـیـــدەت
بـازیان وە قـــوربان دوو لیـــمـــۆی کـــاڵت
مـــەڵڵا بی حـــەیران شـــوعلەی جـــەمـــاڵت
بەرزنجـــــە وەی بەرز بەرزی دەمـــــاغت
تاووغ وەی گـــۆنای شـــەم شـــەوچراغت
خـــورمـــاتوو وەفـــیـــدای باڵای قـــازاغت
حـــەڵەب وەقـــوربان ســـیلســـیلەی چاغت
شـــەمـــســـەوەی زرنگەی زیوو دەلالت
مـــەڵڵا بی حـــەیران شـــوعلەی جـــەمـــاڵت
حـیللە و مـەرکـەز مـونتـەفـیک شـام
بوخـــارا و شـــیـــراز تا بەیتـــولحـــەرام
بەڵخ و هیندســـتـــان قـــەندەهار مـــەقـــام
قـــیـــمـــەت باڵای تۆ ناکـــا تەمـــام
عـــالەم گـــشت مـــەلوول پەرێ ویســـاڵت
(خەلیل) بی حەیران شـوعلەی جەمـاڵت
لە غەزەلێکی تریدا بۆ گوڵنازی دڵخوازی دەڵێ:
لەیلێ گـوڵنازەن     لەیلێ گـوڵنازەن
ئیـــسم شـــەریفش مـــاچان گـــوڵنازەن

سەواش چون بولبول سوب خۆش ئاوازەن
پەی ســەیران گــول هەر جــە پەروازەن

کـــــالای کـــــراسش چیت نازنازەن
توحـفـەی قـافلەی شـار شـیــرازەن

ڕەووشت و لەنجـەش وەغـەمـزە و نازەن
شۆخەن سەرکەشەن وێنەی شاهبازەن

ســـفـــیـــد ئەندام چون پەڕ قـــازەن
مەر بانووی بێ عەیب شار بەنغازەن

چون نەخل شـمـشـاد بالاش درازەن
مەر جیهان ئەفرۆز یا قەمەر نازەن

نیمچە ئەگریجان قەقع میقرازەن
مەر توررەی نیشان بازووی قیتازەن

ئەبرووان قەوس شۆخ تیر ئەندازەن
زەوج موژگانان ویشەی دڵ گازەن

ئیشارەی عەینەین تیر وەققازەن
کاریگەر جە دڵ هەم بێ ئینجازەن

خالانش پڕ نەقش عەجایب سازەن
مەربانووی تەعریف خانوو نیازەن

خولاسە نازدار یەک پەری ڕازەن
ڕازش لە سەمتوور فەوج سەروازەن

مەحبووبەی حەنین نازک دڵوازەن
سەرتاپا بێ عەیب حۆری مەجازەن



(خەلیل) دێوانەی شۆخ سەرئەفرازەن
پەی مەدح دلبەر هەر لە پێشوازەن

ئەوەی لەم شیعرەدا سەرنج ڕادەکێشێ یەکێتی قافیەیە، واتە هەموو نیوە دێرەکان لەسەر یەک قافیەن، جگە لەوەش شاعیر هیچ وشەیێکی قافیەی، کە هەموویان لەسەر یەک کێشن، دووبارەی نەکردۆتەوە.

**وەسف**

وەسف لە بەرهەمی میرزا خەلیل تەنیا لە چوارچێوەی جوانی دلبەر و سروشت نەپارێزراوە، کە ئەمە خەریکی لایەنی شیرینی و بەدڵاچوونی ڕووداوی سەر ڕووی زەوییە کە لە ژن و سروشتدا خۆی دەنوێنێ، بەڵکو هونەری وەسف بۆ لایەنی ناشیرینی و ڕووداوی ناهەمواری ناو کۆمەڵیش بەکار دێنێ. ئیتر وەسفەکەی هەندێ جار دەبێ بەوێنەیێکی کاریکاتێری، یا شیعرێکی فێرکردن (دیداکتیکی)، یا هەڵوێستێکی کۆمیدی، بەم جۆرە دەبێ بەبەرهەمێک زیاتر مێشک دەجووڵێنێ نەک دەروون. بەم پێیە میرزا خەلیل تەنیا وەسفی بەهار و کچە جوانی کورد ناوەستی، بەڵکو وەسفی خانووە کەلاوەکەی ڕووخاو و تفەنگ و چەخماغسازی و خراپەی گوندی عارەب کۆیی دەکا؛ دڵداری و وەسفی پیربەتی پیرێژن و پیرەمێردیش دەخاتە وێنەیێکی کۆمیدییەوە.

**(١)- وەسفی سروشت**

بۆ کورد بەهار بێ نەورۆز نابێ، نەورۆزیش بێ کاوە نابێ. ئەم جەژنەیە لە ڕۆژێکی دیاریکراوی پاش مێژوو دروست نەبووە، بەڵکو لەگەڵ ئادەمزادی پێش مێژوو دروست بووە. لە پێشانا هەر بووە و لە پاشانیشا هەر دەبێ. زەماوەندی سروشتە. لەو ڕۆژەوە کە کردگار بوون و کرداری دروست کرد زەوی لە ئاسمان مارە کرد، بووک و زاوای نەمر و هەمیشەیی پەیدا بوو، ئەمانە هەر تازەن و کۆن نابن، هەمووساڵێکیش زەماوەندی سروشت بەئاهەنگی شووکردنیان تازە دەبێتەوە.

شاعیر لە وەسفی بەهارا دەڵێ:

دۆستان وەهارەن فەسڵ خەزانەن
فەسڵ گوڵزار و گرۆی یارانەن

یادی نەورۆز و عیدی قوربانەن
عیدی کاوە و گڕۆی کوردانەن

یادی فەرەیدوون مەرد نەهەنگەن
یادی سواران شێران جەنگەن

جەژنی مەلان و درەخت باغانەن
ساز و سەمتووری دیدە مەستانەن

هەر مەلێ نەغمێ ماچۆ پەرێ وێش
زام زامداران سارێژ مۆ نە ئێش

هەر گولێ رەنگێ مەدەرۆ نیشان
نە ڕەنگاوڕەنگش عاشق مۆ حەیران

توخوا یاری جوان قامەت عەرعەری
سینە مەرمەری ئەبرۆ قەمەری

یەک زەررە وەفا باوەرە وەکار
با بلمێ هەردو پەرێ نام گوڵزار

با شادی و خەنا باوەرمێ وە یاد
غەم ئی دونیا بدەرێم وە باد

خۆ من ئەسیری خاڵ و نەقشی تۆم
جە عەشقت ناویا بەندە یاسای مۆم

من (میرزا خەلیل) عاشق بەیارم
جە دیدار غار خەیلی بێزارم

### (٢)- وەسفی کەناچەی کورد

ئەوەی هەست و نەست و خورپە و جوانی دەداتە ئەم سروشتە بەلای میرزا خەلیلەوە کەناچەی کوردە، لەم لایەنەوە دەڵێ:



کەناچەی کوردەن خاوەن خەت خاڵەن
دەم نوقل و نەوات دوو لیمۆش کاڵەن

پەروەردەی سارای نام کوردستانەن
پەپوولەی ناسک نام کۆهسارانەن

پرچش لوول و خام چەنی زولفانش
پەخش واردەن چون حەی، وەبان مەمانش

دگان مرواری باڵاش چون چنار
خۆ لەبش ناسک گۆناش گوڵ هەنار

سینەش تازە دوو مێوە دارۆ
ڕەهرەوان دین جە دین بەر مارۆ

گۆ شوارەی شیرین مەکەرۆن وەگۆش
عاشقان گەردین مەکەفان بێ هۆش

وەختێ جە یانە بەرمشۆ بەدەر
شۆڵەی ئافتاو کزمە بۆ نەسەر

گەر دڵەش تەنگ بۆ بلۆ وەگوڵزار
بێ مەی سەرخۆش مۆ دۆستان و ئەغیار

گەر بەیۆ بلۆ وەنام زەماوەن
دڵ هەزاران مەدۆ نە پاوەن

هەنی من چەنی نەوۆم سەرنگوون
نە عەشقش چەنی دڵ نە بۆ بەهوون

یاران من چەنی بەمەجنوون نەبۆم
وێڵ دێوانە زوخ دەروون نەبۆم

یاران من چەنی جـــەرگ بیـــمـــار نەبۆم
بێ دەوا و دەرمــــــــان دڵ ئـازار نـەبۆم

(خـەلیـل) تا زیندەن جـە ڕووی ڕۆزگــار
مــەکـــەرۆ خـــزمـــەت پەپوولەی نازدار

### (٣)- وەسفی خانووە کۆنەی کەلاوە

کابراییێکی هەژاری وەکو میرزا خەلیل کە هەمیشە لە ناو خانووە کۆن و کەلاوە ژیاوە، تاقیکردنەوەی ژیانی لە ناو ئەم جۆرە خانووانەی هەیە و بەشێوەییێکی جوان ڕاستی ژیانی پڕ مەینەتی هەژاران لە ناو کەلاوە کۆناندا دەخاتە ڕوو، لەم لایەنەوە لە شیعرێکیدا دەڵێ:

پەی بەخت نـەگـبـەت پەی ڕەنجـەڕۆیی
ئەمن بارم کـــەرد پەی عـــارەب کـــۆیی

وەواتەی عـەلی ئاغـە و کوێخا ڕەمـەزان
داشان پێم خانگی قویل بی چوین قازان

خـــانگ چ خـــانگ پیـــســەن هەم قـــۆتر
ئیـــرادەم تاڵ کـــەرد فـــری جـــە زۆرتر

گـەر ئاغـە ڕۆسـتـەم بـەیۆ جە کـەرکـووک
ماچی ئازادم کەر نەی حەوشەی چرووک

خـانی پڕ مـار و عـەقـرەب و مـووشـەن
شـەو هەتا سـەبا گـشت نە خـرۆشـەن

مـیـاو مـیـاو پشـیل حـەوحـەو سـەگـان
بـاســــەوانـەتان وە درازی شــــــەوان

حـــەوشــە کـــەلاوەن فــرێ قـــەدیمەن
ئەنجـــام کـــەیل فـــرێ وەخـــیـــمـــەن



من (مــەلا خــەلیـل) مـــەلا بەزێنم
بزانـن مـنیـش جـــــو وەســــوێـنم

لە شیعرێکی تریدا دیسانەوە میرزا خەلیل باس لە کەلاوە کۆنەکەی دەکاتەوە و دەڵێ:

جـە قـەریە کـۆیی ئەسـیـل و ئەسـاس
نەکـەفت جە دەستم یەک خـانگێ خـاس

چەند نەفەر بار کـەرد یانەش بەرد وەچۆڵ
هیچ نەسـیب نەوی وەی بـەندەی کـولۆڵ

وە ئەمـر سـەی عـەلی گـفـتـەی ڕەمـەزان
هام جـە قـۆناغێ قـویلەن چون قـازان

خـانە سـەرسـەر و عـەقـرەب و مـارەن
عەنکەبووت چەنەش جە ئیستیغفارەن

مـوشـان مـوناجـات جـەنەش مـەوانان
وەمــولـک قــەدیم با بۆشـــان زانان

دیوار جـە قـیـام ئامـان وەقـوعـوود
دیرەگ پەی زەمین مـەکـەرۆ سـوجـوود

تەمـــەڵش باریک وێنەی یاڵ خـــەر
وەیەک مـــشت مـــەبۆ زێرش و زەبەر

ئنجا دێتە سەر وەسفکردنی دەوروبەری خانووەکە، بێ گومان لە گەڕەکی هەژاراندا بووە و وێنەی ڕاستەقینەی ژیانی دەست کورت و کەساسان بووە:

هەر سـوب تا ئێـوار بەوێنەی نازر
خـەریکم چەنی هەفت تیپ مـامـر

قـامـیـشێ دراز گـرتەنم وەدەس
وێنەی پاسـەبان نە پێش و نە پەس

وه زەرب قامیش مەنع مەکەم مامر
فائیدەش نیەن بەخت ما لە چامر

جه دەست مامر نەدارۆن دەرمان
چمان حەوش من بیەن وەخەرمان

بیم وەدێوانە نە دەست دەجاج
هەفت تیپ تەمام چون مەبۆ عیلاج

تیپێ پەروباڵ سفید وێنەی هەور
مەردە وەمینقار برماران جە قەور

تیپێ بولبولی تیپێ پلنگی
تیپێ سیاوەن چون عەبد زەنگی

تیپێ زەرد زاق زەواڵ خەلیل
جه زەرب ریقنە ئاواتم زەلیل

تیپێ بۆر بەد وێنەی مار شل
تیپێ جه دەس جنسێ مەدا زل

مەیان پەرێ قەسد ئی بەندەی کەمتر
چون موحارەبەی ڕەزم هەفت لەشکر

وەڕۆ ئی هەفت تا وەعدە ئێوار
ئیحاتە مەدان سیغار و کیبار

وە هەی کش هەی کش هەتا ئێوارە
فائیدەش نیەن، نەدارۆ چارە

چون مەرەزەپاس یا کە قوشچی باخ
تا وەخت مەغریب هام جە ئاخ و داخ



**(٤)- وەسفی تفەنگ**

میرزا خەلیل وەکو چەخماغسازێک شارەزایی تەواوی لە تەکنیکی دروستکردنی تفەنگ و هەموو پارچەکانی بووە. تفەنگێکی کۆنی لە کارکەوتووی دەدەنێ، لە وەسفی تفەنگەکەدا دەڵێ:

چەنی چووار نەفەر تەمام بیم ڕەفیق
لووانا وە دوکان چەخماغچی تۆفیق

ئافەرم وەتۆ ئاغەی سەرفراز
ئیحسان کەردی پێم تفەنگ شاواز

قیمەت تفەنگ یارم تومەن بی
ئالات نامش یەک یەک روویەن بی

بێ شویش و قایش لویلەی بریا بی
قۆناغش وەزەرب سیرم پێچیا بی

ئی تفەنگ ساواز چەن وەدەماغەن
چوواری گوڵەن و باقی قەپاغەن

قیمەت هێستر باڵا بانی بی
مەحکەم پەرێ شەڕ تالەبانی بی

**(٥)- وەسفی گوندی عارەب کۆیی**

ژیان و گوزەرانی میرزا خەلیل لە گوندی عارەب کۆیی خراپ بووە، لەبەر ئەوە دڵی تەنگ بووە و لێی ناڕازی بووە، بۆیە لە کاری نابەجێی ئەم گوندە دەگەڕێ، کردەوەی خراپی عارەب کۆیی گەیشتۆتە ڕادەیێک یارمەتیی بەئیمامی عەلی و بنەماڵە و خێزانی نەداوە. ئەم خراپەیەی گوندی عارەب کۆیی بەلای شاعیرەوە لەوەوە هاتووە چونکە خەڵکەکەی ڕەسەن و یەک نەژاد نین، بەڵکو لە هەموو لایێکەوە عەشیرەت و هۆز و میللەتی جیاواز ڕوویان تێ کردووە، لە بابەت گوندەکەوە دەڵێ:

عارەب کۆیی نام جاگەی سەرحەدەن
فەقەت پەی خەلیل قەبر و ئەلحەدەن

ئەهلەش پەی فیتنە بیەن وە بولبول
نمەدەن ئالک، یەک شەو وە دولدول

پەرێ کوڕ نانی جە عالەم بەلی
داڵدە نمەدان وە ئیمام عەلی

ئیمام حوسێن، ئاوراش بۆ وە دەو
نمەدان پەنەش کوتێ نان بەو

ئەحمەق ئەحمەقی ڕەزیل مەرد و ژەن
وە بینتولرەسوول نمەدان یەک چەن

یەک قەمەری وە قەرز وە سیدق و ئیخلاس
نمەدان وە دەس حەزرەت عەبباس

زەهدی جە لاشان وێنەی نوور عەین
دانەیە نمەدان وە ئیمام حوسەین

پەی یەک کاسە ئارد بەیان وەی مەکان
بێ قەدر و قیمەت مەحرووم مەمانان

مەکانێ وەی تەور ئەهلش وەکار بۆ
بەجاگەی غەزەب دولدول سووار بۆ

دوو چەهر بۆ وە قەهر شاه کەرەم دار
بخیزۆ نەجاش گۆل زرێبار

سەییدو باوە لێش بێ زەرەر بۆ
ماباقی نوگوون زێر و زەبەر بۆ



بەحس جە ئیدەن وەنەت بۆ عەیان
دە مییللەت چەنەش گردەنش مەکان

تیپێ کەوەڵە تیپێ قەوم لەک
تیپێ تورکمان یا عارەب بەڕەگ

تیپێ قەرەسەن تیپێ چۆل مەکی
تیپێ ساڵەیی تیپێ خێڵەکی

تیپێ ئێرانی وە ڕۆم دەربەدەر
تیپێ کاولی دۆم کڵاش کەر

رەسیدەی نامە وە تەعجیل و تاو
تەشریفت بشۆ تا وە ئاسیاو

ئەو بار تەحین باوە رووی مەئوا
غیرەت بگێرۆت پەی رۆژ دەعوا

شەش قسناغ حونتە پەرێ ئیرادە
حەق ئاشەوانم نە پێشین دادە

پارەی تەسلیم کەرد وە عەلەی خەمان
ئەی جومعە وەرین خۆش وەخت زەمان

عەلە عەمرش کەرد دووە ڕۆ بۆ مۆڵەت
مەهارێش پەرێت یەک شەو وە هەڵمەت

توم جە قەومان وە عێلان زانا
فەریاد و هانام وە لای تۆ کیانا

گشتش مەشانی وە چنگ سەپان
ببان وە فیدای محەمەد چۆپان

من میرزا خەلیل شوعەرای زەمانم
ڕەحمەت خوان رووح ئوستا چۆپانم

### (٦)- وەسفی پیرێژنە پەری

لەم شیعرەدا شاعیر جۆرە وەستاییێکی نواندووە، ئەندامەکانی لەشی پیرێژنە پەری وەسف دەکا، بەراووردەکانی دیمەنێکی کۆمیدی دەنوێنن و وێنەییێکی کاریکاتێری دەخەنە ڕوو، بەم جۆرە نەوەکو تەنیا ئەندامی لەشی پیرێژنە پەری دەکەوێتە ژێر بینینی شاعیر بەڵکو لە خوو و ڕەوشت و کردەوەشی دەدوێ و بەخراپە دەریدەخا. شاعیر هەر خۆشی لە پاشانا بەزمانی پیرێژنە پەری قسەکانی شاعیر ڕەت دەکاتەوە و وەسفی ئەندامەکانی خۆی دەکا لە سەردەمی هەڕەتی عازەبی و جوانی کە ئەندامەکانی لەشی بەپێچەوانەی دەوری پیری بوون.

شاعیر لە شیعرەکەیدا دەڵێ:

سینەی سیاهت چون ساجەگەری
قامەتت چون وورچ ناوگەڵ لەنگەری

سینەت چون ساجەن جۆ لە ناو برشیا
دوو مەمک زل زل دۆ لە ناو تورشیا

لووتت ترخێنە زوڵف وێنەی ڕەشکە
پەنجە وەک بسمار زک وێنەی مەشکە

دەس وێنەی مەترەق دەم وێنەی پاچە
کۆلات شیرینەن پەری تۆ واچە

ئەر دگان ماچی وێنەی دەمە بێڵ
روومەتت سیان وێنەی ماڵە خێڵ

ئەر چاوت ماچی یەکجار کز کۆرەن
ئاش دەستت تاڵەن نان دەستت شۆرەن



تەڕاح و تەمەڵ بێ هۆش و بێ ویر
هەردەم تورشیایە لە دەستت هەویر

پێم بڵێ پەری ماچ تۆ وەچەند
کۆلات جوانەن من کەرێش پەسەند

پەری داش جەواب وات: میرزا خەلیل
چەمم جوانەن عەقڵت بی قەلیل

من وەعازەوی باڵا بەرزان بیم
شاگوڵی عەشرەت نام ئێلاخان بیم

روومەتم سوور بی شەوقم وێنەی خۆر
پەرێم عاشق بی پیاوان هەمەجۆر

دگانم ورد ورد مەدرەوشایەوە
زوڵفم وەک ڕەیحان ئەگەشایەوە

مەمک وەک هەنار سەر گۆنام پڕ خاڵ
دەستم نەرم و شل پەنجە وەک شمشاڵ

سینەم وەک بللوور بێ عەیب و عار بی
هەزار هەرزەکار دڵ پێش بیمار بی

ئارۆ من پیرم دیدە پڕ تەمم
قامەتم چەفتەن تۆ مەکەی زەمم

ئەر ئەوسا بیا پەرێم مەویای شێت
وەس بکەر زەمم نمە ژنەوی لێت

با یەک گونک جە هەویر ڕەق
نەدی وە فەرقت مەژگت کەرۆن شەق

نه ترسی هەویر ئامام وە جواو
واتم دەخیلەن پەنەش دام سلاو

من چێشم واتەن حورمەی پڕ حورمەت
پەوسە تورە بیت مەبۆ دەنگ گرمەت

هەنی باوەس بۆ گفتوگۆ پەری
(میرزا) هەتا مەرگ توشەن لەنگەری

## کۆمەڵایەتی و پەند و ئامۆژگاری

میرزا خەلیل هەموو کەموکوورییێکی کۆمەڵ دەباتەوە سەر ئەوەی کە خەڵکی لە ئایین لایانداوە و دەستوور و ماریفەتەکانی ڕەچاو ناکەن. هەرچەندە ئاشکرا و دیاریشە کە مەبەسی لە ئایین ئایینی موسوڵمانییە، بەڵام جار جارە مەسەلەکە بەئایینی ڕاستی (حەقیقەت)یش دەبەستێتەوە، دیارە مەبەسی ئایینی یارسان (ئەهلی حەق)ە و بێ گومان یارسانیش بۆ بەربەرەکانی ئەم دیاردە ناهەموارانەی کۆمەڵ لەگەڵ ئایینەکانی تر یەک دەگرێتەوە. تەنگوچەڵەمە و ناگزووری کۆمەڵایەتی بەشێکی زۆری لە ناوەڕۆکی بەرهەمی شاعیر بۆ خۆی وەرگرتووە، گەلێ سووچ و کون و کەلەبەری گرتۆتەوە، هەمووشی پێوەندیی بەرژێمی دەرەبەگی دەسەڵاتی عوسمانلییەوە هەیە. هەندێ لەم دیاردانە ڕەنگیان لە شیعری میرزا خەلیل داوەتەوە.

### (١)- ناگزووری کۆمەڵایەتی

لە ڕۆژگارانی دەسەڵاتی عوسمانلی لە شیعرێکیدا میرزا خەلیل وێنەی تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵ دەکێشێ لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانلیدا.

شیعرەکەی بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

ئاخر زەمانەن    ئاخر زەمانەن
یاران نیشانەی ئاخر زەمانەن

نیزاع عەشرەت جوملەی جیهانەن
تایفوملوک ڕۆم و ئێرانەن



فرزەند وە بابۆ بێ موراعاتەن
رەعیە وە سەردار بێ ئیتاعەتەن

بێ فەرقەن چون یەک بەین زەن و مەرد
ئەر مەرد باچۆ گیان زەن مەواچۆ دەرد

شێخ بێ کەرامات مەڵڵا موقلاجی
دەروێش کەم زیکرەن وە ناعیلاجی

شەرع محەمەد بیەن سەرنگوون
رەواجەن فەتوای نیزام و قانوون

گوم بیەن ئیجرای عەدل و عەدالەت
سەردان لە عالەم زولم و زلالەت

هامسا وەهامسا مەکۆ خیانەت
نەمەندەن ئەرکان ئەمن و ئەمانەت

لە پاشانا نویشکی بیروڕاکانی دێتە سەر ئەوەی کە زۆربەی خەڵکی بەتایبەتی کاربەدەستان تەنیا بەناو موسوڵمانن نەک بەناوەڕۆک، ئنجا لەسەر شیعرەکەی دەڕوا و دەڵێ:

جە فیسق و فەساد جە بێ رەحمی عام
بەرەکەت لە ئەرز هور گریان تەمام

قەتڵ ئیسلامان ئەووەن بوسیارەن
لە هەر ئەترافێ قەتڵ و کوشتارەن

لە گشت ئیقلیمێ هەر فەتارەتەن
هەر حەرب و زەربەن قەتڵ و غارەتەن

زەنگباد جربە قەرەبولاغ شامار
پالانی سنجەر نە ڕووی ڕۆزگار

داوده قارسی زەنگنە وەزنەشار
کفری لە ناوڕاست قەلای سەوزەدار

لە خەوف جەردە کەس نیەن وەکەس
ئەتراف شاران گشت لوان وەبەس

ئنجا دێتە سەر ژماردنی ئەو بۆجەوسەرانە زۆرانەی کە دەسەڵات سەپاندوویەتییە سەر هەژار و بێ دەسەڵاتان و دەیان ڕووتێنێتەوە:

ئەتراف عیراق بیەن یەختەسار
عالەم ها جە زوڵم مەکەرۆ فیرار

جارێ سەرانە جارێ کەرانە
جارێ ڕەشبگیر زوڵم زەمانە

جارێ شەخسیە جارێ ئەسنافی
(عوسمانلیلرن بودر انصافی؟)

یاران بزانن ئاخر زەمانەن
عالەم جە تەمەع وێنەی شەیتانەن

لەم شیعرەدا خەلیل ڕستەیێکی بەزمانی تورکی بەکارهێناوە «عوسمانلیلرن بودر إنصافی» بەواتای (عوسمانییەکان ئەمەیە ئینسافیان) هاتووە.

### (٢)- پارەپەرستی

هەژاری و دەست کورتی وای لە میرزا خەلیل کردبوو کە زۆر بیر لە پارە بکاتەوە، چونکە پارە هەمیشە هۆی ژیانی بەختیاری و خۆش گوزەرانییە. ئەمە ئەگەر لە هەندێ کاتی سەردەمی ژیانیدا کردبێتییە پارەپەرست، لە زۆربەی سەردەمی ژیانی هەژاری و دەست کورتیدا کارکردنی بەپێچەوانە بووە و ڕق و کینی لە پارە هەڵساوە، بەتایبەتی کە بۆی دەرکەوتووە پیاو لە کۆمەڵێکی وەکو ئەو تێیدا دەژی ئەگەر بەتەڵەکەبازی نەبێ ئەو پارەیەی دەست ناکەوێ. هەروەها شاعیر تەنیا باسی پارەی نەکردووە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە بەڵکو وەسفێکی جوانیشی هەیە بۆ پارە وەکو مەتریالێک. ئەو پارەیەی لە



زێڕ و زیو و مەعدەنی جوان لە قاڵب دەدرێ و هونەرێکی بەرزی نەخش و نیگار و کۆڵینی تێدا خەرج دەکرێ.
لە شیعرێکیدا دەڵێ:

دادمەن جە دەست لیرەی قرمزی
(مأیوس ایلەدی عالمدە بزی)
«ئێمەی ڕەشبین کرد لە هەموو گێتیدا»

دادمەن جە دەست زات مەجیدی
سوخەن حاسل کردلیش نائومێدی

دادمەن جە دەست فرەنکی فرەنگ
جە لای گەوادان رەنگس بەستەن ژەنگ

دادمەن جە دەست روپیەی ئینگلیزی
(مغرور ایلەدی هر پوشت و حیزی)
«هەموو پوشت و حیزێکی مەغروور کرد»

دادمەن جە دەست پوول مەمدووحی
سەخی دوشمنی بەخیلەن رووحی

دادمەن جە دەست جفتەی تەهرانی
سککەی شێر لە پشت توررەی ئێرانی

دادمەن جە دەست سککەی مەغشووشە
(خالصە گیچر سکز غروشە)
«خالیسە نرخی هەشت قرووشە»

دادمەن جە دەست ماباقی فلووس
خالیس و رایج کارخانەی عرووس

دادمەن جە دەست دەور بێ ناමووس
زەمانەی زەن خوی ڕەزیل و دەیووس

لەم بڕە شیعرەدا سێ نیوە دێر شیعر بەزمانی تورکی هۆنراوەتەوە و خراوەتە ناو کەوانەوە و ئینجا مانایان بەکوردی لێکدراوەتەوە. دەتوانرێ ئەم شیعرە بەجۆرە مولەممەعێک بژمێررێ.

له شیعرێکی تریدا لەبەر ڕۆشنایی تێڕوانینی خۆی دەوری پارە لە ژیانی ئادەمزاددا دەخاتە ڕوو، بەرهەمەکەی بەشێوەی دیالۆج دادەڕێژێ لە نێوان خۆی و پارە.

شیعرەکە بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

پارەی پەیتارە    پارەی پەیتارە
باعیس هەر تووەنی پارەی پەیتارە
شووم شەرەنگێز شادی بێکارە
غەددار غەزەب غەزای هەژارە

ئنجا دێتە سەر باسکردنی داوا و ئارەزووی ناوەوەی خۆی کە لەناوبردنی پارەیە، ئەوەی لە دڵیدایە هەڵی دەڕێژێ:

کارخانەت قەهار قەعر جەیحوون بۆ
قالبت نگوون گەنج قاروون بۆ

کۆر بوو دوو دیدەی کۆنە ئوستادت
چونکە وەی تەورە نیان بنیادت

ڕەزیل و ریسوای رووسیای جیهان
تابیع وە بەخیل ناکەس زەمان

عەدووی جوان مەرد ناسزای بێرام
تفوو لە چارەت هەر سوبح و هەر شام

تفوو لە چارەی ئیجاد کەرت بۆ
کیمیازەن دایم رەنج بێوەرت بۆ

ئوستادت رەزیل سەگ پدەر بیەن
گەواد دەوران حیز مادەر بیەن

لە پاش ئەمە میرزا خەلیل پارە دێنێتە زمان و دەڵێ:



پارە ئێد شونەفت ئاما وەکەلام
وات: میرزا خەلیل عەلەیکەسسەلام

گوفتارت قبووڵ مەسمووع هۆشەن
چون گۆشەوارە ئاوێزەی گۆشەن

بەڵێ عەفووت کەرد بواچۆن سەبەب
گۆشدەر وەکردار پارەی بێ ئەدەب

بواچۆن پەرێت جە پا تا وەسەر
پێم نەدی سەلام مەکێشی زەرەر

هەر کەس من بێ قەدر وانۆ لە جیهان
ئاخر سەرەنجام مەبۆ پەشیمان

دایما موحتاج مەدر مەدیوونەن
ئەنگوشت نیهادەی ژێر سەر ستوونەن

خوسووس کە ئیستە دەوران پارەن
بێ پارە شێر بۆ دایم بێ کارەن

دەور عوسمانلی (اوچیوز اون اوچ)ەن
بێ پارە موفلیس هەم مایە پووچەن

پارە رەوشەنی چەشم عالەمەن
بێ پارە بێ قورب سەد کە حاتەمەن

پارە شەهنشاە سەر رووی زەمینەن
باعیسی قووەی ئیمان و دینەن

نە جای (أخ و أخت) فرزەندەن پارە
پدەر و مادەر دڵبەندەن پارە

سـوخـتـەن رەواجی وە حـوکم پارە
باجگیـر باجی وە حـوکم پارە

نا ئەهلان ئەهلن وە حـوکم پارە
مـوشکیـلات سەهلن وە حـوکم پارە

دینار دین بەردەن ئەغـوای هەزارە
رۆستەم وە بێ پوول مەبۆ بێ کارە

لوقمان بێ فلووس عەقڵش مەبۆ کەم
بێ قورب و قەدرەن بێ پارە ئادەم

قازی بێ پارە شەرع نمەکەرۆ
مەلا بێ پارە ئازان نمەدۆ

سەییـد سەر سەوز موحتاج پارەن
عولەمای پڕ عیلم ئیحراق پارەن

هەفت دەوڵەت موحتاج دیدار پارەن
سۆفی بێ پارە نە ئیستیخوارەن

حاجی بی فلووس نمەشۆ وە حەج
بێ پارە پەرێت موشکیلەن فەرەج

پارە موشکیلان پێش مەبۆ ئاسان
پارە ماوەرۆ تیپ خاڵ خاسان

پارە زیکر و فیکر عەوام و ناسەن
موشتەری بێ باک بایع کەساسەن

پارە قیبلەگای گشت ئەمیرانەن
باعیس فیتنەی رۆم و ئێرانەن



زەمانەی زەندیق دەور ئینگلیزەن
پارە لە پدەر یەکجار عەزیزەن

لەم شیعرەدا ڕستەی (أوچیز أون أوچ) بەتورکی نووسراوە، کوردییەکە «سێ سەد و سێزدە» دەگەیەنێ.

لە پاشانا شاعیر دێتە سەر ئەو باوەڕەی کە پارە نەوەکو تەنیا لەناو ناچی، بەڵکو لە دواڕۆژدا ڕێز و حورمەتیشی زیاتر دەبێ:

زەمانە مەیۆ بکەن شمارە
عالەم سوێن بخوا وەسەرە پارە

قەسەم وەجبەی جەناب لیرە
بەو زات قرمز بەو بێ نەزیرە

قەسەم بۆ وەمەرگ مەجیدی سفید
وەسەر سەردار تەهرانی رەشید

وەروح روپیەی قەمەر قەسەم
هەنی کافیەن سوێن زیاد و کەم

چونکە نیشانەی ئاخر زەمانەن
پارە زیکر و فیکر گشت موسوڵمانەن

ئنجا ڕۆژگاری سەردەمی ژیانی خۆی بەڕۆژگاری پارە دەژمێرێ:

ئێستە زەمانەی دەور فلووسەن
چە وەخت غیرەت حەیا و ناموسەن
دەوڵەتیش وەدەست حەی داوەرەن
وەکەسیش مەدۆ بەختش یاوەرەن
گاه وەناکەسان مەدۆ ماڵ و گەنج
وەخانەدانان مەدۆ دەرد و ڕەنج
قەدیم خانەدان خاتر غەمینەن
زومرەی ئەحمەقان سەدرنشینەن

ئەبوو فێس قرمز ئەوەڵ بەقاڵ بین
وەسایەی پارە مدیر ماڵ بین
لایق وەسەر تەخت زەڕین شاهی
تەمام بین لە عام سوخەن رەواهی

لە پاشانا شاعیر بەم دێرانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

ئەرێ هەی فیرقەی گشت پارەپەرست
ڕوو سیاه ببان جە یەمولئەلەست

قەمەری پدەر قران براتان
مەجیدی وە شوێن گشت ئەقرەباتان

کاولی لاتان زۆر وەحەیایە
ئەر وەک دۆم بان خێر خودایە

ئەرچون قەرەج بان کەمێ خاسترەن
وەک بێژەنگ کەر بان بێ وەسواسترەن

هەنی کافیەن حیکایەت بەس بۆ
حەرفێ کافیەن ئەر کەسێ کەس بۆ

ئەفەندی شاران هەزار میللەتن
لە چارەی ئەوشان باران قیللەتن

ئومێدم هەنەن وەدانای داوەر
ڕۆژ وەڕۆژ ببۆ بەد لەبەد بەتەر

خوداوەند غەزەب بگیرۆ لە عام
دەور ئیبنولوەقت سەردان لە ئەییام

قانوون و نیزام حوکم لەتیفەن
تەوقیف کەردەی ئەمر شەرع شەریفەن



بەدیدەی پڕ سۆز بکەم موناجات
بەدەرگای کەریم قازییەلحاجات

یا ڕەببی عومەر پەرێ عەدل و داد
با عەلی پەی جەنگ دوشمەن کەر ئیجاد

با مەهدی مەسیح زوو بکەن ئیزهار
رەواج دەن وەدین ئەحمەد موختار

وەرنە دین باتیل ئیسلام پامالەن
نیشای سۆفییان چەرخ دەجالەن

تا (میرزا) ساکین کفری مەکانەن
دایم نە شەکوای وەخت و زەمانەن

موختەسەر کەریم گفتوگۆی کەلام
بەر محەمەد بۆ سەڵات و سەلام

## (٣)- ناکۆکیی ناو کۆمەڵ

«مەرد» و «نامەرد» دروشمی کەسی هەقپەرست و تەڵەکەباز، ڕاستگۆ و درۆزن، دڵسۆز و قین لە زگ، چاوتێر و چاوبرسی، ئازا و ترسنۆک، خۆپەرست و گەلپەرستە لە لای میرزا خەلیل. جگە لەمە تەنگوچەڵەمەی ناو کۆمەڵ شاعیری بێزار کردووە، ناچار پەنجە بۆ ناکۆکیی ناو هێزەکانی کۆمەڵی کوردی درێژ دەکا، کە خۆپەرستی و خۆخۆیی ئەم هێزانە بووە بەهۆی دواکەوتنی کۆمەڵ، زیاتریش ئەمە لە پێوەندی نێوان سەرۆک عەشیرەتەکان دەردەکەوێ کە لە ڕاستیدا نوێنەری چینەکانی دەرەبەگی سەرەوەن، بەڵام چاکەی بنەماڵەیی تایبەتی پاڵیان پێوە دەنێ کە بۆ یەکتری بچنە مەیدانەوە و لە ئەنجامدا زیان بەهەموو کۆمەڵ دەگا:

یا ڕەب پیاو مەرد ڕوو زەرد نەکەری
مێرد مەرد موحتاج نامەرد نەکەری
نامەرد نامەردەن نمەبۆ وەمەرد
مەردان وەدەسشان نەکەری ڕووهەرد

لە سەرانسەری ئەم لیریکە شاعیر خۆی لەگەڵ فەرهاد بەراوورد دەکا، یا دەیەوێ دڵداریی خۆی و فەرهاد بەیەکتری بچوێنێ بەرامبەر بەشیرینی ئەرمەن. لەو شیعرەدا چەند جارێک ناوی فەرهاد دەبا. شیعرەکە بەهەناسەی ڕەشبینی و نائومێدی قانگ دراوە چونکە چیرۆکەکەی شیرین و فەرهاد خۆی نموونەییێکی تراجیدییە لە دڵداریدا. ئەم جۆرە ناوەڕۆکە لە ئەدەبی نەتەوەکانی گێتی ڕەنگی داوەتەوە. بێ گومان پێویستە ئاگاداری ئەوەش بین لە بنجدا چیرۆکی دڵداری شیرین و فەرهاد لە ناو چیرۆکی شیرین و خوسرەو دروست بووە. واتە دلبەر تەنیا یەکێکە شیرین، دڵدارەکانیش دوو کەسن خوسرەو و فەرهاد. لە ناو کوردەواریدا چیرۆکەکە زیاتر بەناوی «شیرین و فەرهاد»ەوە ناوبانگی دەرکردووە، نەک «شیرین و خوسرەو» ڕەنگە ئەمەش لەبەر ئەوە بێ فەرهادی کێو هەڵکەنی شاخی بێستوون لە نەتەوەی کوردی ئێستاوە نزیکتر بێ، نەک نەتەوەکانی دیکەی ئێرانی.

شانۆی دڵدارییەکەش کەوتۆتە ناوچەی قەسری شیرین و شاخی بێستوون، ئەمانەش لە ناوجەرگەی کوردستانی ئێستان.

***

عوسمان پاشای جافی ناوچەی هەڵەبجەی ڕەنگینی مەڵبەندی بووژانەوەی شیعری کوردی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لەگەڵ عادیلە خانمی خێزانی دوو برای شاعیری نازداری پێشکێش بەمەدەنییەتی کورد کردووە. ئەم دوو برایە یەکێکیان تاهیر بەگی جاف و ئەوی دیکەیان ئەحمەد موختار بەگی جاف بوون.

تاهیر بەگ شاعیرێکی ڕەسەن بوو، ماوەی ژیانی کورت بوو، بەرهەمی شیعری کەم بوو. ئەو شیعرەی لە ناوەوەیە زۆربەی پێوەندی بەئەڤین و دڵدارییەوە هەیە، لەبەر ئەوە ئاسۆی فرە بابەتی تەسکە لە ڕووی مەبەس و هونەرەکانی شیعرەوە. ئەو کێشە عەرووزییانەی بەکاری هێناون کەمن، بەڵام هەموو دەستوورەکانی شیعری کلاسیکی ڕەچاو کردووە. زمانی سووک و ئاسانە، ئاواز و مۆسیقای شیعرەکانی نەرم و ڕەوانن.

تاهیر یەکێکە لەو شاعیرە دەگمەنانەی کوردستانی باشوور کە دیالێکتی کرمانجی خواروویان کردووە بەزمانی شیعر، بەڵام شیعریان بەدیالێکتی گۆرانیش وتووە. شاعیر لەم جۆرە شیعرە نموونەی هەیە و تیایاندا سەرکەوتووە.

## بەشی بیست و سێیەم

# شیعری بەرزی هەندێ لە شاعیرە

### کەم ناسراوەکانی کورد

ئەدەبی نەتەوەی کورد هەموو ئەو بەرهەمە بەرز و سەرکەوتووەیە کە بەزمانی کوردی بەشیعر یا پەخشان لە کۆنەوە تا ئێستا بەدرێژایی ڕۆژگار دروست بووە و سامانی نەتەوایەتیی لە قسەی جوان پێکهێناوە. لێرەدا ئەوە مەرج نییە ئەو بەرهەمە دەبێ لە لایەن شاعیرێکی بەرز و ناسراو و خاوەن دیوانێکی گەورەوە کەوتبێتە ناوەوە، چونکە کە دەوترێ «ئەدەبی کوردی» مەبەس لە هەموو ئەو بەرهەمانەیە کە بەزمانی کوردی داهێنراون و شایانی ئەوەن ببنە سەرچاوەی مشتومالّکردنی چێژی کورد و فراوانکردنی ئاسۆی بیری.

کورد لە پەندێکیدا دەڵێ «بەگوڵێک بەهار نایە»، قسەیێکی جوانە چێژی هونەری بەرز دێنێتە ناو دڵ و دەروونی ئادەمزادەوە، کەچی ئەگەر لە ڕووی زانستی و بیرییەوە لەم قسەیە ورد ببینەوە وەک بیر و بۆچوونێکی ناڕاست دەکەوێتەوە، چونکە لە مەیدانی ئەدەبدا تەنیا شیعرێک بۆی هەیە دیوانێکی شیعر یا گێتییێکی شیعری دروست بکا. کورد لە هەموو ڕۆژگارێکدا شاعیری وای بووە بەشیعرێک ناوبانگی دەرکردووە و شیعرەکە بووە بەسەرتۆپ بۆ شاعیرێک یا سەردەمێکی ژیانی مرۆڤ یا ناوچەیێکی وڵاتی ئادەمزاد.

بەپێی ئەم بۆچوونە و دەرخستنی ڕووی ڕاستی ئەدەبی کوردی ئەم بەشە تەرخان کراوە بۆ ئەو شاعیرانەی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم ژیاون و شیعریان کەم بووە، لە ناو ئەو کۆمەڵەدا شیعری سەرتۆپ و دەگمەن دەست دەکەون.

# تەیموور

## ١٨٣٠ - ١٨٥٦

تەیموور کوڕی ڕەزای بانیارانییە، لە ساڵی ١٨٣٠ لە ئاوایی بانیارانی کرماشان لە دایکبووە. وەکو خۆی دەڵێ لە گوندی تووت شامی پێگەیشتووە. خوێندنی سەرەتایی لە بانیاران و دواتری لە تووت شامی بووە، ئینجا چۆتە کرند و لە نزیکەوە ئاشنایەتی لەگەڵ یارسانانی ئەهلی حەق پەیدا کردووە، کتێبی «سەرەنجام» و ئەدەبیاتی ئایینی دیکەیانی خوێندۆتەوە.

لە تەمەنی بیست و یەک ساڵیدا تەیموور لە لەشکری مەلک نیازخانی گۆران بووە بەسەرباز. لە ساڵی ١٨٥٢ کە تورکمانەکان هێرشیان بردە سەر شاری تاران و تاڵانیان کرد، تەیموور بەخۆی و لەشکریەوە تورکمانەکانی تەفروتوونا کرد و تارانی ڕزگار کرد. ئەمە بووە هۆی ئەوەی لەشکرەکە لە لایەن ناسرەدین شای قاجارەوە پاداش بکرێ. بەم جۆرە لەشکرەکە لەسەر داوای شا لە تاران مایەوە و ئیتر تەیموور خەریکی ڕێبەری ئەهلی حەقی یارسانان بوو، بۆ ئەم مەبەسە جموجۆڵییێکی زۆری نواند.

نەیارانی تەیموور کەوتنە بەربەرەکانێ و ڕاوەستان لە ڕووی. لە دوای بوختانێکی زۆر لە لایەن ناسرەدین شاوە گیرا و خرایە بەندیخانەوە. ماوەییێک بەزیندانی لە تاران مایەوە ئینجا گوێزرایەوە کرماشان. شەش مانگێک لەو شارەدا لە بەندیخانە مایەوە، ئەوجا بەفەرمانی شا بەتاوانی زندیقی و دەرچوون لە ئایینی ئیسلامی لە ساڵی ١٨٥٦ لە سێدارە درا. ئەمەش بوو بەشەهیدێکی دیکەی بیر و فیکری ئازاد. پێڕەوان و یارانی یارسانان جەستەکەی وەردەگرنەوە و لە کرماشان دەینێژن.

تەیموور لە ڕێکخراوی یارسانان و نێوەندی ئایینییان بە«شا تەیمووری بانیارانی» ناوی دەرکردووە. دیوانی شیعری نزیکەی هەزار دێرێک دەبێ بە«دەفتەری تەیمووری» ناسراوە و لە نامە پیرۆزەکانی ئایینی یارسانە. تەیموور پێوەندی بەهەموو شاعیرانی گۆرانزەمینی سەردەمی خۆی بووە بەتایبەتی سەید براکە کە ئەویش یەکێکە لە گەورە یارسانەکان.

شیعری تەیموور ڕەنگدانەوەی ئایینەکەیە لە چوارچێوەی سۆفیزم خۆی دەنوێنێ، خەریکی تیۆرییەکانی دۆنا دۆنە و شێوەی کردگار لە هەموو شتێکدا دەبینێ.

تەیموور و یارانی هەمیشە وێڵن بێ سەروشوێن لە «حەقیقەت» دەگەڕێن، شاعیر بەناوی



خۆیەوە قسە دەکا و دەڵێ:

من وەی دەردەوە من وەی دەردەوە
تا کەی بناڵم من وەی دەردەوە
وەی دەرد خواجەی ساحێب شەردەوە
ڕای قەرار نوخت کەس نەکەردەوە
زووان وەلاڵە و چەم وەهەردەوە
دڵ وە زوخاوان داخ و دەردەوە
تا کەی بگێڵم وە سەر هەردەوە
وەی هەردەی دوجەیل مەجنوون بەردەوە
سۆزیام وەی شەوق دانەی زەردەوە
دانەی زەرد تا کەی ها وە گەردەوە

لە شیعرێکی دیکەیدا تەیموور موناجات لەگەڵ کردگار دەکا:

تاک تەنیای فەرد تاک تەنیای فەرد
واحید و ئەحەد تاک تەنیای فەرد
فەرد بێ هەمتا نەزاد و نەمەرد
کونەندەی نەقشاش جەرخ لاجیوەرد
نە تەنیایی حەپس عەزابم سەختەن
ئەسرم چون ڕێزان بەرگ درەختەن
بینام تۆ خودای لامەکانەنی
تۆ خەزانەی سر کەسی نەزانەنی
تۆ ساحێب ئەرز و ئاسمانەنی
تۆ خالیق خەلق سفید خوانەنی
هەرچەند عەزابم نە حەد بێ شۆوەن
بەڵام ئومێدم تەمام بەتۆوەن
بێدار نەخاو پادشای بەختم
گوشاد کەر کلید قاپیەکەی تەختم
(تەیموور)م دوچار عەزاب سەختم
چەمە ڕای کەرەم جوودت وە جەختم

لە شیعرێکی دیکەیدا تەیموور باس لە جەوهەرەکانی ئایینی یارسان دەکا و بەیەکەیێکی دادەنێ لەو ڕۆژەوە کـە ئادەمـزاد لەسـەر ڕووی زەوی پەیدا بووە و ئێـستـا و دوارۆژیش تا ڕۆژی حەشر بەپێی گیانی کردگار و گەڕانی بەناو لەشی مرۆڤ.

دانەی مـــەکـــانم دانەی مـــەکـــانم
پیـــاڵەی پڕ مـــەغــز دانەی مـــەکـــانم
بەلـەیل چون خـــــرۆش تاوتەکــــانم
پەرێ گـــەوهەری هەر نە فـــغـــانم
کـــیـــبـــاری کـــەرەم ســەغــیــر عـــامم
دوڕ ســاغ حـەڵقـەی مـەحـبـووس دامم
شکست تەلەسم جـادووی پیل ســامم
ئیـــســا نەی دوونم ڕۆســـتـــەم بێ نامم
شـــاباز شـــوجـــاع وە ڕدا گـــیـــرم
کـــەمـــانم پەڕم تـەرکـــەشم تیـــرم
ئەسـیـــر عـــومـــانم بەحـــرم غـــەواسم
گـــــەوهەرم دوڕم دانەم ئـەڵـمــــاسم
(تـەیـموور)م ڕەهبـــــــەر ڕەواج ڕاسم
شـەهیــد شـەیدای هوونی قـەســاسم

تەیمووری بانیـارانی بەشدارییێکی چالاکانەی بووە لە دەوڵەمەندکردنی شیعری ئایینی یارسانی گۆرانزەمین ئەوەی ڕوخسـارێکی سۆفـیزمی کۆزمۆسی وەرگرتووە لە فەلسەفەی «یەکێتیی بوون»دا

# کۆشکی

**...... - ١٨٨٢**

زانیاری لە بابەت شاعیرەوە یەکجار کەمە، لەو کەمتریش شیعریەتی. شاعیر ناوی شاوەیس بووە، لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم لە گوندی کۆشک لە دایکبووە. ئەم ئاواییە لە ناوچەی قەرەداغی سلێمانییە. شاوەیس لە دواییدا ناوی گوندەکەی خۆی کردووە بەنازناوی شیعری. لە ناو خەڵکیدا بەمەلا شاوەیس ناوبانگی دەرکردووە. هەر چۆنێ بێ شاوەیس قۆناغەکانی حوجرەی مزگەوتی تەواو کردووە، لەبەر ئەوە مەلایان پێ وتووە. لە سەرچاوەکاندا ساڵی ١٨٨٢ بۆ کۆچی دوایی کۆشکی دانراوە.

شیعری کۆشکی ئاساییە، بەهرەی شیعری هەیە، ئەمەیان سنووری خوێندەواریشی تا پلەیێک دیاری دەکا. لە شیعری دڵداری کلاسیکی سەردەمی خۆی گەیشتووە بۆیە دەتوانێ دلبەرەکەی بکا بەخوێنرێژێکی دڵڕەق، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستە.

لە غەزەلێکیدا کۆشکی دەڵێ:

دێتو دەچێتە پاشەوە قەتلی خەلق بەڕوو دەکا
شەرمی حوزووری غالیبە تەقیەیی ڕووبەڕوو دەکا
خوێن بەری چاوی گرتووە عاشقی هێندە کوشتووە
دەست دەوەشێنی ڕاست و چەپ نە یەک نە سێ نە دوو دەکا
لادە لە سەروو و بون لەشی بێ سەمەر و نەتیجەیە
قامەتی نەخلی دلبەرم شکۆفە زوو بەزوو دەکا
کەللەیی پڕ لە بادەیە دڵی چ ساف و سادەیە
مەستە جنێوی خۆی دەدا نە فەرقی من نە تو دەکا
ڕوویی فریبی دڵ دەدا ڕەنگی لە ڕەنگی گوڵ دەدا
خوویی شکستە مل دەدا وەختی شەرم کە خوو دەکا
هەرچی ڕەقیبی سەگ دەڵێ بیدەرە دەستی قەت مەڵێ
زەحمەتە ڕووحی دەرپەڕێ زگی دەچێت گوو دەکا
نالیی و زولفی دلبەری کوردیی و گەردی عەنبەری
حاجیی و کاکۆڵی سەری (کۆشکی)ی و مەیلی ڕوو دەکا

# ئاهی

**١٨٤٥ – ١٩٠٦**

ناوی ساڵح کوڕی ئەحمەدە، نازناوی «ئاهی»یە، لە ساڵی ١٨٤٥ لە سلێمانی لە دایکبووە. قۆناغەکانی خوێندنی حوجرەی تەواو کردووە. وەک دەستووری ئەو سەردەمانە بۆ وەرگرتنی زانستی هەندێ گوند و ئاوایی کوردستان گەڕاوە ئەوانەی مەدرەسەی عیلمی ئایینی و مەلای گەورەیان لێ بووە. دوا قۆناغی خوێندنی لە کۆیە بووە و ماوەییێکی زۆر بەمەلایەتی لەوێ ژیاوە. لە ئەنجامدا گەڕاوەتەوە مەڵبەندی خۆی لە سلێمانی، لە ساڵی ١٩٠٦ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.

ئاهی شاعیرێکی خۆڕسک بووە توانیویەتی بەخەیاڵی ناسکی بەسەر زانست و زانیاریدا زاڵ بێ و هەناسەییێکی دانایانە و سۆفیزمیانە بداتە شیعرەکانی. شاعیر لە دۆخی شیعری کلاسیکی نەچۆتە دەرەوە، لاسایییێکی هوشیارانەی ئەو شیعرە کۆنانەی کردووە و بەرهەمێکی نوێی پێشکێش کردووە.

لە شیعرێکی دانایانەیدا دەڵێ:

خودا هەڵناگرێ چاوم ئەمەندە شێت و شەیدا بم
لە مابەینی خەلایقدا وەها مەهتووک و ڕیسوا بم
گەلێ دەفعە دەڵێم بێم دڵ بگۆڕم خۆم لەوێ لادەم
لە دوو ڕێدا خەریک ماوم بەڵام وا چاکە یەک ڕا بم
چ ئینسافێکە ئەی نەی قامەت و غونچە دەهان و شۆخ
وەکو بولبول هەمیشە هەر بەهاوار و بەغەوغا بم
هەتا کەی سازەقوومی میحنەتی دووریت بچێژم من
بەشێتی وێڵ و سەرگەردانی دەشت و کێو و سەحرا بم
دەبێ (ئاهی) لە جەژنی وەسڵی دلبەردا بەقوربانی
قەدی باریک و لێوی ئاڵ و چاوی مەست و شەهلا بم

لە شیعرێکی دیکەیدا بەشێوازی پێشوو ئاهی دەڵێ:

نوکتەی دەمی مەخفی لە فلاتوونی خەیاڵە
سیرڕێکە بەسەد فەلسەفی ئیزاحی مەحاڵە



من سەتحیی ئەم عیلمەمە لەو وەقتەوە قوربان
نەوخیزی خەتت حاشیەیی فەننی جەماڵە
پەروانە سیفەت دڵ بەچرای عاریزی پاکت
سەرباختە وو سوختەیی بێ پەڕ و باڵە
سەرمەست و برینداری مۆژە و چاوی خومارە
ماتەمزەدە وو شیفتەیی پەرچەم خاڵە
(ئاهی) کە غولام و خەدەمی حەزرەتی یاری
ناڵێ بخەرە گوێتەوە وەک حەلقە لە ناڵە

لەم لیریکەشدا ئاهی بەشێوازە تایبەتییەکەی خۆی دەڵێ:

بەدەست ئەم چەرخی کەچ ڕەفتارەوە چ مەزلوومم
چ ماڵوێران و ڕەنجوورم چ مەهموومم چ مەغمومم
نییە مومکین لە دڵدا زەڕڕەیێ شادی چ خاکێ کەم
مەگەر ڕۆژی ئەزەل غەم بوو بەڕۆژی و ڕزقی مەقسوومم
لە مەکتووبی زەمانە گەرچی زۆر وەقتە نەزەربازم
نەبوو حەرفێ بەغەیری میحنەت و دڵ سەردی مەفهوومم
عەلاوەی دەردی دنیایی لە لایێکەوە خۆ من
گرفتاری ڕەقیبی شووم و بەدکرداری مەزموومم
هەتا دەمرم بلا مەشغوولی ئاه و شین و زاری بم
کە دنیا وابێ تالیع وابێ دوژمن وابێ مەعدوومم

## خاکی

**١٨٤٥-١٩٠٦**

ناوی محەممەدە لە گوندی ئەحمەد برندەی هەڵەبجە لە ساڵی ١٨٤٥ لە دایکبووە. قۆناغەکانی خوێندنی حوجرەی مزگەوتی لە سلێمانی و سنە تەواو کردووە، لە مەلایەتیدا زانا بووە. ماوەییێک مووچەخۆری دەوڵەت بووە مەئمووری زەویوزاری سەنییەی عوسمانی لە سەرچنار دانیشتووە. زۆربەی ژیانی بەمەلایەتی بردۆتە سەر لە سلێمانی و هەر لەوێش لە ساڵی ١٩٠٦ کۆچی دوایی کردووە.

مەلا محەمەد ناوی «خاکی» کردووە بەنازناوی شیعری. شاعیرێکی ڕەسەنی لێهاتوو بووە، بایەخی زۆری بەرەوانبێژی شیعری کلاسیکی عەرووزی داوە، لە شیعری ئایینیدا دەستێکی باڵای بووە، بەتایبەتی لە نەعتی پێغەمبەر و حیکایەتی میعراج و ستایشی یار و یاوەرانی. ژمارەی دێرەکانی ئەم قەسیدانەی لە سەد تێپەڕیوە. لە هەموو ئەم شیعرانەیدا لاسایی نەعتەکەی نالی کردۆتەوە «ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا...» ئەم لاساییە بەتەنیا لە کێشی شیعرەکەدا نییە، بەڵکو هەموو قەسیدەکانی لە ڕووی قافیەوە لەسەر قافیەی شیعرەکەی نالی ڕێکخراون.

لە سەرەتای نەعتەکەیدا دەڵێ:

ببارێنی خودا بارانی هەرچی فەیز و ئیحسانە
بەسەر ئەو باعیسی خەلق و گوزیدەی جەمعی ئەکوانە

بەم دێرە کۆتایی پێ دێنێ:

مەگەر شاهی روسول هادی سوبول سەرخێڵی جوملە و کولل
بەئیحسانی بکا تەحسین بلێ وەک شیعری حەسسانە

ئەوە ئاشکرایە گەلێ لە شاعیرانی کورد لە نەعتدا لاسایی نالییان کردۆتەوە، شتی تازەیان داهێناوە، بەڵام هیچ یەکێکیان نەگەیشتوونەتە پلەی نالی. هەرچی ئەم نەعتەی خاکییە، هەروەها شیعرە ئایینییەکانی دیکەشی لە شیعرە چاکەکانی ئەم بابەتەی شیعری کلاسیکی کوردین.

جارێکیان خاکی لە یاریی کەوشەکی سەیرانی مەلا و فەقێیانی بەهار دوا دەکەوێ. سەید ئەحمەدی نەقیب ئەم شیعرە بۆ خاکی دەڵێ:



لە مەیدانی عیبادەتدا بەجێما هەر کەسێ بێ شک
بەدایم چاو بەرەوژێرە دەبێ مەهتووک و ڕیسوا بێ

خاکی بەقەسیدەیێک وەرامی سەید ئەحمەدی نەقیب دەداتەوە:

ئەگەر دەروێش ئەگەر سۆفی لە تەکیە و خانەقادا بێ
گەدا بێ یاخو پاشا بێ خەلیفە یاخو وەستا بێ
لە عەرسەی کەوشەکا جێما وەکو دابە دەبێ دابێ
دەبێ سەرحیز و مل کز بێ دەبێ داماو و ڕیسوا بێ
قبووڵ نابێ بەهیچ بابێ کە کوڕ دابێ لە جێی بابی
ئەگەر سوختە مەلای جێ هێشت مەلا مل کەچ نەبێ نابێ
(لە مەیدانی عیبادەتدا بەجێما هەر کەسێ بێ شک
بەدایم چاو بەرەوژێرە دەبێ مەهتووک و ڕیسوا بێ)
بەجێمان باعیسی بەدناوییە حەتتا لە یاری دا
کەسێ مەقبووڵ و ماقووڵە کە چاپوک دەست و ئازا بێ
قەدی ئەلفی دەبێتە دال لەبەر سستی لە یاری دا
بەجێماو هەر دەبێ دابێ بەزیللەت گەرچی وەستا بێ
مورید گەر مورشیدی جێ هێشت لە یاری دا دەبێ دابێ
بەسەریا هەر دەبێ هەڵچێ لە ژێر باری دەبێ دابێ
کەسێ پاشکەوت ئەگەر فەرزەن خەڵاتی شای لەبەر دابێ
وە یا عەینەن عەمامەی شێخولئیسلامی لەسەر نابێ
دەبێ پشتی کەمانی بێ وەکو گۆ سمتی هەڵنابێ
بلێ پشتم شکا با بێ کەسێ مابێ بەسەرما بێ
بەجێماویش لە کەوشەکدا ڕەفیقان هەر دەبێ دابێ
قیاس، ڕۆشن دەلیلێکە دەبێ ئەحکامی موجرا بێ
ئەمە مەعلوومە لای هەر کەس چ نادان و چ دانا بێ
کە دابوون کاری نادانە کەسێ دانا بێ دانا بێ
فیداتان بم وەرن یاران لەمەولا ڕوو لە مەولا بێ
دەروون عاجز لە دنیا بێ لە ماڵا یەعنی دڵ لا بێ

چ خۆشە تەرکی خوو هەر شەو هەموو چاوی لە خەودا بێ
نەسیمی نیسبەتت بووبێ وەکو شەوبۆ لە شەودا بێ
کەسێ کەوشەک بکا (خاکی) موحەللەق باز و ئازا بێ
بەسورعەت هەروەکو بابێ بەهیممەت میسلی بابا بێ
حەریفی دووی لە چایخانە دڵی مەعموور و ئاوا بێ
بەتەجنیس بازی دەیفەرموو جەزای چاکە دەبێ چا بێ

## سالمی سنه

**۱۸٤۸ - ۱۹۱۱**

سالمی سنه ناوی سەلیم کوڕی شێخ ئەحمەدی تەختەییە، باپیرانی بەبنەچە دەچنەوە سەر شێخ مستەفای تەختە لە بنەماڵەی مەردۆخی. سەلیم لە ساڵی ۱۸٤۸ لە گوندی تەختە لە دایکبووە، ئەمە گوندێکە کەوتۆتە لای باشووری شاری سنەوە. سەرەتای خوێندنی لای باوکی بووە. لە قۆناغی سوختەییدا لە سنە خوێندوویەتی، ئینجا چووە بۆ بیارە و لەوێوە بەرێگەی مەریوان گەڕاوەتەوە سنە.

لە دوای ئەمە ڕووی کردۆتە سابلاغ (مەهاباد) و لای مەلا عەبدوللای پیرەبابی خوێندوویەتی. دوا قۆناغی خوێندنی لە سابلاغ تەواو کردووە و لە ساڵی ۱۸۷٤ ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ئەوجا گەڕاوەتەوە سنە و بووە بەمودەریس لەو مزگەوتەی لە دواییدا بەناوی خۆیەوە ناوبانگی دەرکردووە، واتە «مزگەوتی شێخ سەلیم». لە پاش ماوەیێک ئیجازەی تەریقەت لە شێخ عومەری بیارە (زیائەدین) وەردەگرێ و دەبێ بەسۆفیی تەریقەتی نەقشبەندی.

سالمی سنە هەمـوو ژیانی بەوانەوتنەوە بردۆتەسەر و لە ساڵی ۱۹۱۱ لە سنە کۆچی دوایی کردووە و لە مزگەوتەکەی خۆیدا نێژراوە.

شێخ سەلیم ناوی «سالم»ی کردووە بەنازناو بۆ شیعری خۆی. لە نێوەندی ئەدەبییدا بەناوی «سالمی سنە» ناوبانگی دەرکردووە بۆ ئەوەی لەگەڵ «سالم»ی ساحێبقرانی سلێمانی تێکەڵی یەکتری نەبن.

شیعری سالمی سنە دەچێتە ناو شیعری کلاسیکی کوردستانی باشوور، کردەوەی شاعیر شۆڕشێک بوو لەو ناوچەیەدا چونکە زمانی ڕەسمی میرنشینی ئەردەلان و زمانی نووسین و قسەکردنی ناو خەڵکی دیالێکتی گۆرانی بوو، لەبەر ئەوە شیعری تازەی لەم بابەتە دەوری گرنگی هەبوو لە بڵاوبوونەوەی بزووتنەوە ئەدەبییەکەی سلێمانی.

شاعیر بەگشتی وەک سۆفییێکی تەریقەت خۆی دەخاتە ڕوو. وشە و زاراوەی سۆفیزم بەکار دێنێ، بەمە بەرهەمی لە شیعری پەروەردەیی نزیک دەبێتەوە دوور لە شیعری سۆفیزمی کۆزمۆسی.

بەهەناسەییێکی فەلسەفی و دانایانە دەڵێ:



زەهری مارە عەیشی دنیا چون لە ڕێ دایە مەمات
ئەهلی دڵ بۆ خاتیمە دایم هەیە مەبهووت و مات
تەن لە نوقسانی جیهاتا وەقتی ئیمکان و مەکان
مەرکەزی دەردە لە بەینی شەشدەری هات و نەهات
ڕووحی لاهووتی کە زیندانی تەنی ناسووتییە
ئەم قەفەزخانەی هەیوولایە دەکا عەزمی نەجات
چون حەزیرەی قودس و تەجریدە مەقام و مەنشەئی
ئارەزووی پەروازییە بۆ ئەوجی ما فەوقی جیهات

لە لیریکێکی دیکەیدا شاعیر موناجات لەگەڵ شێخی خۆی دەکا (شێخ عومەری بیارە). بەڕاستی دەڵێی موناجاتێکی دڵدارییە لەگەڵ دلبەرێکی لەوانە ئەڤینیی مەجازی، کەچی مەبەسی شاعیر عیشقی حەقیقییە:

پیری سددیقی تەریق و تاجی فارووقی لەسەر
واریسی عوسمانی زیلنوورەین و کەڕڕاری سەبات
ڕووحی شیرینم لە دەوری قەددی شمشادت گەڕێ
تا تەسەددوق بێ لە بۆ ڕەددی هەموو دەرد و بەڵات
خاڵی هیند وو زولفی چین و ڕۆمیی ڕووی ڕوومەتت
وان لە قەبزەی قەهری شمشێری برۆی جەنگ ئازمات
چاوی مەستت چون لە هەر لا مەردمی دڵ بردووە
بێ دڵان بۆ دڵ لە هەر لا بێ تەحاشا دێنە لات
هەر نیگاهێ سەیقەڵێکە بۆ مسی پڕ ژەنگی دڵ
بەل تەڵای خالیس دەبێتن مس بەئەکسیری نیگات
گیان فیدای گوفتاری شیرینت کە عەینی حیکمەتە
کەشفی ئەسراری تەریقەت حەللی کونهی موشکیلات
دڵ بەقوربانی نیگای قەلبولعەیانی کاری تۆ
وا دەکاتن قاعیدەی حیکمەت بەتاڵی وا سەبات
قامەتی زێبای قیامەت خێزی تۆ بی ببڕێ ڕێی
مەحشەری بەرپا دەکا بۆ سەرخۆشی جەور و جەفات

کارنامەی خاس ئادابی تەریقی بەندەگیت
مونتیجی حەققولیەقین قەتعی عەلاقەی مومکینات
فەیسەڵی حەققوولیەقین فەسڵولخیتابی عاریفان
تەرجومانی سرری ئایاتی دەلالەت موعجیزات
بێنە مەیدانی سەداقەت (سالم)ا قەلبی (سەلیم)
تا موشەررەف بێ بەیومنی دەوڵەتی بیری خودات

له شیعرێکی دیکەیدا سالمی سنه دەڵێ:

یاری نیکوو نەژادی سیلسیله موو
دڵی بردم بەنێرگسی جادوو
یا ئەگەر ڕێ نییە بەتوڕڕەی یار
بۆ دەماغم بە بۆ موعەتتەر بوو
دڵی مەجنوون مەکانی لەیلایە
مونعەکیس بوو نێوی ئایینە ڕوو
کەرەمی کرد سیاهی و مەستی
نێرگسی ئەو بەدیدەیی ئاهوو
هەستە ئەی دڵ بچینە لای مەجنوون
ڕشتەی عاقلی لە دەست دەرچوو
دڵی پێکام بەعیشوەی تیری موژەی
تورک ئەندێشەیی کەمان ئەبروو
چووە سەر شاخی گوڵ و وتی بولبول
هەرکە زانی لە داوی شەو بەر بوو
هەر یەکێکە خودای ئەحەد نەک دوو
وەحدەهو لا ئیلاهە ئیللا هوو
(وَحْدَهُ لا إلـه إلاّ هُـو)

# جیهان ئارا

**۱۸۵۸ – ۱۹۱۱**

جیهان ئارا کچی مەلا نەشئەتی پاوەییە، لە بنەماڵەیێکی ئوروستوکراتی لە ساڵی ۱۸۵۸ لە پاوە لە دایکبووە، لای باوکی و مامۆستایانی دیکە خوێندوویەتی، بایەخی بەزمانی عەرەبی داوە. وەک هەموو کچێک ژیانی منداڵی و عازەبی لە ماڵی باوکی بردۆتە سەر. سەید تاهیری هاشمی بەڕێزەوە ناوی جیهان ئارا دەبا، بەیەکێ لە زانایانی پاوەی دادەنێ، دەڵێ لە جوانیدا شۆخ و شەنگ و بێ وێنە بووە، شیعری جوانی نووسیوە. جیهان ئارا هێشتا بچووک بووە کە حەمە بەگی وەکیل حەزی لێ کردووە، چووە بۆ خوازبێنی بەڵام شووی پێ نەکردووە. لە پاشانا شووی بەعەلی ئەکبەرخانی ئەردەلانی کردووە، ئەمە پورزای خۆی بووە لە باوکییەوە. لە دوای ماوەیێکی کەم لە ساڵی (۱۸۸۰) عەلی ئەکبەر لە لایەن ناسرەدین شای قاجارەوە بانگ کراوەتە تاران و کراوە بەبەڕێوەبەری ئازربێجان. ئیتر ئەم کابرایە لەو خۆشییەدا جیهان ئارای لە بیر دەچێتەوە، کچێک لە شازادەکانی قاجار دێنی و بەم هۆیەوە تەلاقنامە بۆ جیهان ئارا دەنێرێ. زۆری پێ ناچێ جیهان ئارا مێرد بەحەبیبوڵلاخانی سەرەک عێلی بابەجانیی جاف دەکا. لەمە چەند منداڵی دەبێ و ژیانی وەک خانمی ماڵ دەباتە سەر. ئەم ژنە شاعیرە لە ساڵی ۱۹۱۱ لە جوانڕۆ کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش بەخاک سپێرراوە.

جیهان ئارا شاعیرێکی خۆڕسک و هەست ناسک بووە، مێردی یەکەمی زۆر خۆش ویستووە، لەبەر ئەوە بەکوڵ بۆ ئەو جیابوونەوەیە شیعری موناجاتی گلەیی و لاواندنەوەئامێزی هۆنیوەتەوە. ئەم کردەوەیە لە ئەدەبی ئەو سەردەمەدا شتێکی نوێ بوو. کارێکی ئاساییە دلبەر پشت لە دڵدار بکا و بەجێی بهێڵێ و پیاوەکە ببێ بەکۆیلە و لێی بپاڕێتەوە، کەچی لێرەدا جیهان ئارا پشتگوێ خراوە و لەگەڵ ئەوەشدا بەشیعر شین و شەپۆڕ بۆ جیابوونەوەی مێردی دەکا. ئەم هەڵوێستەی جیهان ئارا لە هەڵوێستی مەستوورە ناکا بەرامبەر بەخوسرەو خانی والیی ئەردەلان چونکە خوسرەو خان کە یەکێ لە کچەکانی بنەماڵەی قاجاری هێناوە مەستوورەی تەڵاق نەداوە و خۆشی ویستووە، شیعری مەستوورە بۆ مردنی خوسرەو جیاوازە لە شیعری جیهان ئارا بۆ ئەو مێردەی تەڵاقی داوە، بەڵام ئەو هەر خۆشی ویستووە.



جیهان ئارا درۆی لەگەڵ خۆیدا نەکردووە، ئەو دڵدارییەی لەگەڵ ئەو پیاوە لە گیانێکی خاوێن و بێ گەردەوە هەڵقوڵاوە. جیهان ئارا بۆ جیابوونەوەیە قەسیدەیێکی (پۆیێمێکی) درێژی داناوە، ژمارەی دێرەکانی لە سەد تێپەڕی کردووە، لەو شیعرەدا وەک موناجاتێک لەگەڵ مێردی کۆنی دەدوێ.

لەم ماوەیەدا بەشێکی ئەو شیعرە بلاو دەکرێتەوە.

سەرەتا بەم دێرانە دەست پێ دەکا:

قیبلەم دەماغم قیبلەم دەماغم
نەمەندەن نیەن بەرزی دەماغم
دوور جە تۆ بەردەی دەروون داغ داغم
زنجیر تەقدیر کەردەن یاساغم
کەم کەم کەردەن سۆمای چراغم
پەژمەوردەن غونچەی گوڵاڵەی باغم

ئینجا دەڵێ هەموو شتێکی گێتی و هەموو دڵدار و دلبەرانی ڕۆژگار گرفتار و گیرۆدەی تۆن:

جەفای بەدکاران گشت جە بۆنەی تۆن
تانەی ئەغیاران گشت سەرگۆنەی تۆن
خوسرەو و شیرین وێڵ جە سۆنگ تۆن
مەجنوون لەیلێ ڕیسوای لۆنگ تۆن
سەنعان تا مەحشەر تەرسا یار تۆن
یووسف زلێخا گرفتار تۆن

لە پاشانا دەڵێ تا کەی بۆ کۆچی دڵداریم بناڵێنم:

تا کەی ئەسرینم ئاوپاش خاک بۆ
تا کەی هەناسەم پەخش ئەفلاک بۆ
تا کەی دەروونم جە ئەندۆ پەڕ بۆ
تا کەی باڵینم وە هووناو تەڕ بۆ
تا کەی لەرەم بێ چەنی پەژاران
تا کەی خزمەت کەم من وە هوونخواران

ئەوجا دەڵێ هەموو مەینەتیی ژیانم لەبەر تۆ بووە:

پەی تۆ وێم کــەردەن وە پەند شـــاران
مـەحرووم جـە سـەیران بەرز کـۆسـاران
پـەی تـۆ دەروونم پڕ نیێـش خـــــــارەن
سـەد کـۆ چون شـاهۆ خـەم و نەم بارەن
پـەی تۆ غـــەم گــەلای جــوانیم بەردەن
پەی تۆ وەهارم خـــەزانش کـــەردەن
پەی تـۆ وێم کـــــەردەن دەیری دێـوانە
پەی تۆ پابەندم جــە مــەینەتخـــانە
پەی تۆ کـێـشـــانم جـەور ئەغــیــاران
تـیـــــــر تانـەی تـاڵ نـا ئـەهلی یـاران
من بادەی حـەسرەت هـیـجـرانت وەردم
جەفات پەی من بێ سەفات پەی مەردم

لە کۆتاییدا دەڵێ:

غـــەرەز وە هەر نەوع کـــارێ بســـازین
من و تـۆ جـــــە بەیـن من و تـۆ ناریـن
ئەوسا وەشەن عەیش هەر شەو تا سەحەر
خــودا خــۆش نوود بـۆ بەندە بێ خــەتەر
وەرنە خـــــۆ لەیلـت ئارامش نـیــــــەن
سـیــوای تۆپەی کێ ڕیســوای عــام بیــە

جیــهـان ئارا بەکـوڵ داوا لە مـێـردی پێشـووی دەکـا بگەڕێتـەوە لای و شـەو بەخـۆشی ڕابوێرن. پێی دەڵێ لەبەر تۆ ئارامم نییە، لەبەر تۆ لە ناو خەڵکی ڕیسوا بووم.

## میهرەبان

**١٨٥٨ - ١٩٠٥**

میهرەبان کچی مەلا حەسەنی مایییە. مایی گوندێکە لە ناوچەی عەشرەتی بەرواریی باڵا لە باکووری ئامێدی. میهرەبان لە ساڵی ١٨٥٨ لەو گوندەدا لە دایکبووە، دەبێ لەماڵەوە بەهۆی باوکییەوە فێری نووسین و خوێندەواری بووبێ.

میهرەبان کچێکی شۆخ و شەنگ و ژیر و دەست ڕەنگین بووە، لە چنین و نەقش و نیگاری مافوور هونەری نواندووە. لە ناو خەڵکی بەمیهرەبان خاتوون ناوبانگی دەرکردووە. خەڵکی عەشرەت و دەوروبەر ڕێزیان لێ ناوە. لاوان گرفتاری بوون و خەونیان پێوە دیوە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێتە هاوسەری یەکێکیان، میهرەبان لە لای خۆیەوە دڵی چووبووە ئامۆزای خۆی ناوی فەقێ ئەحمەد بووە.

میری بەرواری وەکو خەڵکەکە هەواڵی جوانی میهرەبانی بیستبوو، ئارەزووی ئەوەی هەبوو بیخوازێ، بۆ ئەم مەبەسە ڕووی کردۆتە گوندی مای و بۆتە میوانی ماڵی میهرەبان و لە مەلا حەسەنی باوکی داوای کردووە. بێ گومان باوک بەخۆشییەوە ڕازی بووە.

ئەم ڕووداوە بۆتە مایەی کارەساتێک بۆ میهرەبان و هەستی شاعیرییەتی بزووتووە و ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە وەک وەرامێک بۆ میری بەرواری:

ئەز چی بێژم چی بەیان کەم کی بەحالی من دزانی
مەخفیاتان ئاشکرات کەم ئاه ژ ڤێ دەردێ گران
ئاه ژ دەست عیشق و ئەڤینا کەفتمە تازیی و شینا
کی دێ ساغ کات ڤان برینا چو ژ دل سەد ئاخ و ژان
دەردیکی زۆری گرانە عەقل و هۆش من چ نەمانە
مام پەپیکو بێ خووانە کی دییە ئەڤ چ زەمان
من نەما سەبر و قەرارە دل ژ من بوو پارە پارە
جەه نە زۆر و گەرم وهارە لەو ژ من چوون هەست و خوان
یێکە دل نابیت دوو چوار نابیتن مەحەببەت چەپ و خوار
تشتەکە ناچیتە بازار نە بەدەست شێخ و مەلان



دوو دلا یەکدو حەباندن زەحمەتە ژ یەکدی ڕەڤاندن
ئایەتا عیشقێ ب خواندن نایێتە شەح و بەیان
عیشق نەزانیتن گەداهی عیشق نەزانیت پادشاهی
شوعلەکە ژ نوورا ئیلاهی هەر وەکی ڕووح و ڕەوان

لەو کاتەی ئەم شیعرە دەکەوێتە بەر گوێی میری بەرواری، بۆی ئاشکرا دەبێ، میهرەبان پێوەندیی دڵداری لەگەڵ کەسێکی دیکەدا هەیە. میر دەستی لێ هەڵدەگرێ ئەم دێرە شیعرەی بۆ دەنووسێ:

بۆ ئەڤینی نینە چارە تشتەکی ڕوهنە دیارە
ژ داستانا تە دە بارە هەر شوکور ئەی میهرەبان

لە شیعری میهرەباندا هەست بەدڵ گەرمی و سۆزێکی ڕاستەقینە دەکرێ. میهرەبان زیرەکانە توانیویەتی بەم شیعرە ئەوەی ناو دڵی بکاتەوە و وەسفێکی قووڵی دڵداریمان بۆ بکا. ئەوی ڕاستی بێ ئەم بیروڕایانە لای شاعیری دیکەش دەکەونە بەرچاو بەتایبەتی لای فەقێ تەیران، بەڵام میهرەبان خاتوون لە ئاسۆیێکی دیکەوە تەماشای مەسەلەکە دەکا.

لە بابەت مردنی میهرەبانەوە هەواڵ هەیە لە ساڵانی سەرەتای سەدەی بیستەم، لە مەڵبەندی ژیانیدا لە ئاوایی مای کۆچی دوایی کردبێ.

# حەسەن و ئامینە

حەسەن و ئامینە دوو شاعیری کوردن لە ڕۆژگارانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم زیندەگانییان کردووە، ئەمانە دڵدار و دلبەر بوون و حەزیان لە یەکتری کردبوو.

«حەسەن و ئامینە» بەناو و ناوەڕۆک لە چیرۆکەکانی دڵداریی ئەدەبی میللی هەموو میللەتانی سەر ڕووی زەوی دەکا وەکو «لەیلا و مەجنوون» و «ڕۆمیۆ و جوولێت».

حەسەن ئامینەی خۆشویستووە، گیانی ئەڤینییان زەمینی و ریالیزمی بووە، دوور لە ئاسمان و خەیاڵی دەروێشی. موشتاق و گیرۆدەی لەشولاری جوانی ئامینە بووە، وەک «ئەدەب» میسباح-دیوان، بەڵام شێوەی تەعبیر و وێنەکانی لەو ساکارتر و میللیترە. حەسەن بەجۆرێک ئامینەی خۆشویستووە و ئارەزووی کردووە کە شۆڕشی سێکسی پێ دابمرکێنێتەوە، کەچی ئامینە خۆی دەخاتە ڕیزی دلبەرە عاشقەکانی ڕۆژگارەوە، ئەوانەی دڵدارییان بۆ دڵداری کردووە، لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێ چونکە ئامینە ژنە و ئەوەی بۆ ناکرێ. ئەوەی لە ژیانی ئەم دڵدار و دلبەرە ئاشکرایە ئەوەیە حەسەن تووشی دەردیسەرییێک بووە لە ئەنجامدا لە لایەن دەسەڵاتی عوسمانییەوە گیراوە و دراوەتە دادگا و لە شاری مووسڵ خراوەتە بەندیخانەوە.

ئەم غەزەلەی کە لەم ماوەیەدا بڵاو دەکرێتەوە دەبێ لە بەندیخانە نووسیبێتییەوە و بۆ ئامینەی یاری خۆشەویستی ناردبێ، ئینجا ئەویش بەغەزەلێک وەرامی دابێتەوە. ئەوەی لێرەدا جێی تێبینییە ئەوەیە ئەو کیژەی دلبەری حەسەن بە«فەقێ ئامینە» ناوبراوە، ڕەنگە ئەمە تەنیا لەبەر ئەوە بووبێ بەخوێندەوار بناسرێ، ئەگەر نا لەوانەیە غەزەلەکە و وەرامەکە حەسەن خۆی دایناین. هەر چۆنێ بێ لێرەدا مەبەس بەرهەمەکەیە شتێکی دیکە نییە.

لە ڕووی هونەری شیعری و هێزی شاعیریەتییەوە دیارە شیعرەکەی ئامینە لە هی حەسەن بەرزترە، هەروەها لە دڵدارەکەشی شاعیرترە. کەچی غەزەلەکە تەواو نییە و تەنیا سێ دێری لەبەردەست دایە، گومانیش لەوە نییە دەبێ هەندێ دێری ون بووبن.

حەسەن لە غەزەلەکەیدا دەڵێ:

سەلامی من لەسەر تۆ بێ بەسەد نەوع و بەسەد عینوان
فەقێ ئامینە سووتاوم لە دووری تۆ بەسەد قورئان



ئەگەر لەم غوربەتە بمرم خەیاڵت وا لە دڵ دەگرم
مەلائیک بێنە سەر قەبرم جەوابییان وا دەدەم قوربان
دەڵێم ئامینە مەولامە دەڵێم ئامینە لەیلامە
دەڵێم ئامینە پاشامە لە نەسلی گورجی گورجستان
فیدایی سەدری سافت بم فیدایی تەختی نافت بم
فیدای چەخماغی کافت بم ئەوە گەنجینەیی پەنهان
فیدایی وردە نازت بم فیدایی ناز و گازت بم
فیدای دوو چاوی بازت بم ئەوە سەرچاوەیی حەیوان
(حەسەن) بۆت بۆتە دێوانە ئومێدی وایە ئەی جانە
لە زنجیری حەبسخانە خەلاسی بێ لە دەس تورکان

ئامینە وەرامی غەزەلەکەی حەسەن دەداتەوە:

سەلامی یاری ئاوارە لە بەندی تۆقی سوڵتانی
بەدەستی من گەیی قوربان لە وەختی دڵ پەرێشانی
سەراپا چون موتالام کرد سەلامی یاری بێ هاودەم
دڵە غەمبارەکەم دیسان برینی تازەگی هانی
خەرامان و گوڵەندام زولەیخا وو قەمەر چەهرە
وەکو من قەت نەسووتاون لە دووری یار و هیجرانی

بەگشتی شێوەی دڵداری حەسەن و ئامینە لە دڵداری هەموو کیژ و کوڕەکانی میللەتە جیاوازەکانی گێتی دەکا، کەچی شیعرەکەیان کلاسیکی ئاساییە.

## لیستی ناوی کەسان

## د



## ڕ



## ز



## س







## ش



## ع

## لیستی ناوی جوگرافی

**گ**



**ل**



**م**



**ن**







**و**



**هـ**



**ی**

## بیبلیۆگرافیا

ئەو سەرچاوانەی لە سێ بەرگی پێشوودا بڵاو کراونەتەوە بۆ ئەم بەرگەش کەڵکیان بووە. لێرەدا بەپێی توانا هەوڵ دەدرێ ناوی ئەوانە بڵاو نەکرێتەوە کە لە سێ بەرگەکەی دیکەدا بڵاوکراوەتەوە. دیارە بەهەمموو جۆرێک لە پاشانا ناوی سەرچاوەی هەمموو بەرگەکان لێک دەدرێن و دەبن بەسەرچاوەی گشتی بۆ سەرجەمی «مێژووی ئەدەبی کوردی» بەهەمموو بەرگەکانییەوە.

هەندێ لە سەرچاوەکانی بەرگی سێیەم لە جێی خۆیدا نەخرابوونە ڕوو، لەم بەرگەدا ئاماژە بۆ ئەوانیش دەکرێ:


- ئازاد عەبدولواحید، ئەختەر شاعیری جوانی و دڵداری، هەولێر، **١٩٧٦**.
- ئەحمەد تاقانە، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، کەڵەشاعیری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، هەولێر، **١٩٩٩**.
- ئەدمۆندس سی. جەی، هەجووکەرێکی کورد–شێخ ڕەزای تاڵەبانی «جورنال ئۆف ذی ڕۆیاڵ سەنترەل ئێژیەن سۆسایتی» بەرگ ٢٢، کانوونی دووەم، **١٩٣٥**؛ وەرگێڕی تۆفیق وەهبی، دەنگی گێتیی تازە، بەرگ١، ژ٢، تشرینی دووەم **١٩٤٣**.
- ئەدمۆندس سی. جەی، میستەر «سۆن» لە هەڵەبجە دەنگدانەوەیێک، «جورنال ئۆف ذی ڕۆیاڵ سەنترال ئیژیەن سۆسایتی» بەرگ٢٣، ژ١١، ئەیلوول، **١٩٣٩**، وەرگێڕی تۆفیق وەهبی، دەنگی گێتی تازە، بەرگ١، ژمارە١، تشرینی یەکەم **١٩٤٣**.
- دیوانی ئەختەر، کۆکردنەوە و نووسینی تاهیر ئەحمەد حەوێزی، کۆیە، **٢٠٠٢**.
- دیوانی شاعیری بەناوبانگ مصباح الدیوان، بەغدا، **١٩٣٩** (پێشەکیی ئەم چاپە هەرچەندە ناوی یەکێکی تری لەسەر نووسراوە، بەڵام شێخ سەلامی شاعیر نووسیویەتی).
- دیوان مصباح الدیوان –ئەدەب– شەرح و لێکدانەوەی محەمەد سەعید نەجاری (ئاسۆ)، ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیوبی، ئێران، **٢٠٠٠**.
- دیوانی ئەدەب عەبدوڵڵا بەگ مصباح، بڵاوکەرەوەی حوسێن حوزنی، ڕواندز، **٢٨** ئاغستوسی **١٩٣٦**.
- دیوانی ئەدەب یادگاری عەبدوڵڵا بەگی مصباح الدیوان، بەکۆششی گیوی موکریانی، هەولێر، **١٩٦٦**.
- دیوانی تاهیر بەگ، سلێمانی، **١٩٣٦**.
- دیوانی تاهیر بەگ، چاپی محەممەدئەمین عصری، بەغدا، **١٩٥٣**.
- دیوانی تاهیر بەگ، بەکۆششی گیوی موکریانی، هەولێر، چاپی یەکەم، **١٩٦٦**؛ چاپی دووەم، **١٩٦٩**.
- دیوانی حاجی قادری کۆیی، بەکۆششی گیوی موکریانی، هەولێر، چاپی یەکەم، **١٩٥٣**؛ چاپی دووەم، **١٩٦٩**.
- دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە، سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا، بەغدا، **١٩٨٩**.
- دیوانی حەریق، چاپخانەی مەریوانی، بەغدا، **١٩٣٨**.
- دیوانی حەریق، لەسەر ئەرکی مەحموود خاکی، سلێمانی، **١٩٦٩**.
- دیوانی حەریق، لێکۆڵینەوەی سەید نەجمەدینی ئەنیسی، مەهاباد، **١٩٨٩**.
- دیوانی سید یعقوب ماهیدشتی، باهتمام محمد علی سلطانی، تهران، چاپی یەکەم **١٩٨٤**؛ چاپی دووەم، **١٩٩٩**.
- دیوانی شێخ ڕەزا، چاپی کوردی – مەریوانی، بەغدا، **١٩٣٥**.
- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، کۆکەرەوە و چاپی عەلی تاڵەبانی، بەغدا، **١٩٤٦**.
- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ئامادەکردنی ناسری ئیبراهیمی، ستۆکهۆڵم، **١٩٩٣**.
- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ئامادەکردنی چالاک تاڵەبانی، سلێمانی، **١٩٩٩**.
- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ئامادەکردنی ئومێد کاکەڕەش، سلێمانی، **١٩٩٩**.
- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ساغکردنەوە و شەرحی شوکور مستەفا، هەولێر، **٢٠٠٠**.
- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، کۆکردنەوە و ساغ کردنەوەی شێخ محەمەدی خاڵ و ئومێد ئاشنا، هەولێر، **٢٠٠٣**.
- دیوان عرفانی جعفر قلی زنگلی ملک الشعراء کرمانج، به اهتمام کلیم الله توحدی (کانیمال)، ایران، **١٩٩١**.
- دیوانی اشعار محوی، لە مطبعەء حکومت لە سلێمانی طبع کرا، سلێمانی، **١٩٢٢**.

– دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی موددەریس و محەمەدی مەلا کەریم، بەغدا، ١٩٧٧.
– دیوانی مەلا وەسمان، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی د. ئەمین موتابچی، النجف الاشرف، ١٩٧٣.
– دیوان میرزا ئەولقادر پاوەیی، کۆکردنەوەی هادی سپنجی، ئێران، ١٩٨٩.
– دیوانی نالی، چاپی کوردی و مەریوانی، بەغدا، ١٩٣١.
– دیوانی نالی، ناشر آقای علی مقبل سنندجی، سنندج، ١٣٢٧ «١٩٤٨».
– دیوانی نالی، چاپی گیوی موکریانی، چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٧٤.
– دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی موددەریس و فاتیح عەبدولکەریم، بەغدا، ١٩٧٦.
– دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە، مارف خەزنەدار، بەغدا، ١٩٧٧.
– دیوانی وەفایی، بەکۆششی گیوی موکریانی، هەولێر، ١٩٦٢.
– دیوانی وەفایی، لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی، بەغدا، ١٩٧٨.
– ڕەئووف عوسمان، نالی لە دادگای ڕەخنەدا، بەغدا، ١٩٨٤.
– ڕەشید فندی، خانی و حاجی، ڤەکۆلینەکا ئەدەبییە، دهۆک، ١٩٦٩.
– تاهیر ئەحمەد حەوێزی، مێژووی کۆیە یا کۆیسنجەق، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٦٢؛ بەرگی دووەم، بەغدا، ١٩٨٤.
– عەبدولخالیق مەعرووف، دیوانی «نالی» و کێ ڕاستە؟ بەغدا، ١٩٨٤.
– عەبدولسەتار تاهیر شەریف، حاجی قادر شاعیری شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز و دیموکراتی نەتەوەی کورد، بەغدا، ١٩٧٧.
– کەریم شارەزا، کۆیە و شاعیرانی، بەغدا، ١٩٦١.
– کەریم شارەزا، نالی و زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی، بەغدا، ١٩٨٤.
– کنز العرفان، دیوان غزلیات حضرت میر محمد صالح حسنی نعمه اللهی، چاپخانهء کاوه، کرماشان، ١٣٢٤ھ/١٩٤٥م.
– کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کوی، چاپ و بڵاوکردنەوەی عەبدولرەحمان سەعید، بەغدا، ١٩٢٥.





– کۆمەڵە شیعری فەقێ قادری هەمەوەند، ئامادەکردنی مەلا عەبدولکەریمی موددەریس و فاتیح عەبدولکەریم، بەغدا، ١٩٨٠.
– مارف خەزنەدار، عەبدوڵڵا بەگی میسباح – ددیوان شاعیری گەورەی خاکی موکریان، بەغدا، ١٩٧٠.
– مارف خەزنەدار، کوردی تورکمانستان، هەولێر، ٢٠٠٣.
– مارف خەزنەدار، نالی لە دەفتەری نەمریدا، بەغدا، ١٩٨١.
– محەمەدی مەلا کەریم، نالی لە کلاوڕۆژنەی شیعرەکانییەوە، بەغدا، ١٩٧٩.
– محەمەدی مەلا کەریم، حاجی قادری کۆیی، بەغدا، ١٩٦٠.
– محەمەدی مەلا کەریم، هەنگاوێکی تر بەرێگادا بەرەو ساغکردنەوەی دیوانی حاجی قادری کۆیی، بەغدا، ١٩٨٩.
– محەمەدئەمین هەورامانی، میرزا ئۆلقادر، بەغدا، ١٩٨٤.
– مەسعوود محەمەد، حاجی قادری کۆیی، بەغدا، بەرگی یەکەم، ١٩٧٣؛ بەرگی دووەم، ١٩٧٤؛ بەرگی سێیەم، ١٩٧٦.
– مەسعوود محەمەد، چەپکێک لە گوڵزاری «نالی»، بەغدا، ١٩٧٦.
– مکرم تاڵەبانی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ژیانی-پەروەردەی-بیروباوەڕ و شیعری، هەولێر، ٢٠٠١.
– هەردەوێڵ کاکەیی و مستەفا نەریمان، شاعیری چەوساوەکان خەلیل منەووەر، بەغدا، ١٩٨٤.

## ناوەڕۆک

### بەشی یازدەم



### بەشی دوازدەم



### بەشی چواردەم



### بەشی پازدەم



### بەشی شازدەم





### بەشی حەڤدەم



### بەشی هەژدەم



### بەشی نۆزدەم



### بەشی بیستەم

**بەشی بیست و یەکەم**



**بەشی بیست و دووەم**



**بەشی بیست و سێیەم**

# تاريخ الادب الكردي

## النصف الثاني من القرن التاسع عشر

و

## بداية القرن العشرين

## (١٨٥١ - ١٩١٤)

يتناول هذا الجزء من الكتاب مسيرة الادب الكردي خلال اكثر من نصف قرن، يتطرق المؤلف فيه الى اسباب تطوره وازدهاره في جميع اصقاع كردستان وخصوصا في المناطق الجنوبية منها. وقد تم التعرف على مضامين الشعر الكردي خلال اعمال الشعراء الذين ظهروا في تلك الحقبة من تاريخ الشعب الكردي. ولم يكن الابداع الشعري مقتصرا على نتاج الشعراء العظام وانما يجد المرء نماذج ممتازة لشعراء غير معروفين او قليلي الانتاج. والفترة الزمنية هذه غنية بكبار الشعراء الذين يُعتبرون من البارزين في الادب على مر العصور التي عاش فيها الشعر الكردي منهم الحاج قادر الكوئي ومحوي والشيخ رضا الطالباني وعبدالرحيم وفائي والملا صالح حريق ومصباح الديوان وغيرهم.

الجزء الرابع

**الدكتور معروف خزنه‌دار**

أربيل ٢٠٠٤



# The History of Kurdish Literature

The Second Half of 19th. Century
And
Beginning of 20th. Century
1851 - 1914

Vol. IV

By
**Prof. Dr. Marouf Khaznadar**

Arbil 2004